# سەردەم 44

نیسانی
2006
ســـــــالّی شەشەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی





ناونیشان
سلێمانی – فولکەی یەکگرتن
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
تەلەفۆن/ سەرنووسەر 3130347
دەزگای سەردەم 3129609

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە
Tel - Fax: 0044 7543129839
ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی
ژمارە ( 14665/615و 14665/616) تاران

لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:
www.sardam.info



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە


–ســەردەم گۆڤارێکــە بــە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانــی کــەلتووری بیــانی لــە بــواری فەلســەفە و فیکــر و ڕەخنــە و لێکۆڵینــەوە و داهێنــانی ئــەدەبی و هونەریدا.

–تکایــە ئــەو بەرهەمانــەی بــۆ سەردەمی دەنێرن، نــاوی نووســەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتــارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێـت، لەســەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتــەر کرابێــت. پــەراوێز و ســـــەرنجەکانیش لـــــە کۆتـــــایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانــە نەهاتنــە دی دەســـتەی نووســەران مــافی بڵاونەکردنــەوەی هەیە و پێشــەکی داوای لێبــوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.

–بەرهەمــەکان بڵاوبکرێنـــەوە یـــان نەکرێنـــەوە نادرێنـــەوە بـــە خاوەنەکەی.

–هـــەموو پەیوەندییـــەك لـــە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.

# ناوەرۆك



## وێستگەکانی سەردەم



**نرخی (1200) دینارە**

# ڕۆڵی چاكسازیی ئاینی لە هاوكێشەكانی فیكری سیاسیدا : لۆسەر و ریفۆرمخوازەكان

ئامادەكردنی: شاهۆ سەعید

## بزاوتی ریفۆرمی ئاینی:

بزاوتێكی گرنگ بوو لەفیكری ئاینیدا، لە سەدەی شازدە بەدواوە لەئەوروپا دەستیپێكرد. سەرەتا بزاوتێكی چاكسازی (ڕیفۆرم) بوو لە كڵێسای كاسۆلیكیدا، بەڵام هێندەی نەبرد خۆی بووە مەزهەبێك كە بەمەزهەبی پرۆتستانت ناسرا. ئەو مەزهەبە پێی وابوو پیاوانی ئاینی بۆیان نیە ئیدعای نوێنەرایەتی یەزدان بكەن لەسەر زەوی، هەروەها دژی هاوپەیمانێتی نێوان كڵێسای كاسۆلیكی و دەسەڵاتی سیاسی بوو، كە لەسایەیدا هەم پیاوانی دەوڵەت و هەم پیاوانی ئاینی بەرژەوەندیی یەكتریان دەپاراست[1].

كڵێسای كۆن مرۆڤی وەك بوونەوەرێكی گوناهبارو بچووك تەماشادەكرد، كە هەمیشە پێویستی بە دەزگای ئاینی بوو وەك نێوەندێك بۆ خواپەرستی.. واتە كڵێسا ئەو دەزگایە بوو كە فەرمان و قسەو رێنمایی یەزدانی بۆ مەسیحیەكان لەسەرەوە بۆ خوارەوە تەرجەمەدەكرد، هەروەها ئەو دەزگایەش بوو كە نوێژو نزاكانی مرۆڤی، لەخوارەوە بۆ سەرەوە، دەگەیاندە یەزدان و شەفاعەتی بۆ مرۆڤ دەكرد. بەمانایەكی ترو بەگوێرەی ڕێنماییەكانی مەزهەبی كاسۆلیكی كڵێسا فلتەری نێوان مرۆڤ و یەزدان بوو، نزیكبوونەوە لە كڵێسا یەكسان بوو بەنزیكبوونەوە لە یەزدان. بەڵام مەزهەبی پرۆتستانت ئەو فلتەرەی هەڵگرت و مرۆڤی كردەوە بە لایەنی سەرەكیی هاوكێشەی خواپەرستی كە پێویستی بە هیچ نێوەندێك نەما بۆ بەستنی پەیوەندیی رۆحیی بە یەزدانەوە. بایەخدان بە مرۆڤ، وەك بوونەوەرێكی خاوەن ویژدان و خاوەن ئەقڵ، بنەمایەكی سەرەكی ئەو مەزهەبە نوێیە بوو كەبەجۆرێك لەجۆرەكان پەیوەندیی بەبیرۆكەی مرۆڤگەریی (هیومانیزم)ەوە هەبوو، كە لە دەركەوتەكانی ڕێنیسانس بوو[2].

یەكێك لەهۆكارەكانی دەركەوتنی بزاوتی ڕیفۆرمی ئاینی پەیوەندیی بەململانێی توندی نێوان

پیاوانی ئاینیو چینی ناوەڕاستەوە هەبوو کە لەو سەردەمەدا وەك چینێکی بەرچاو سەریهەڵدا. هەر لەو دەمەدا هاودژیی گەورە لەنێوان ڕێنماییە ئاینیەکانو خواستو خەونی سەرمایەداراندا دروست بوو، پیاوانی ئاینی داوایان لەخەڵك دەکرد گرنگی زۆر بەدنیا نەدەنو لەبری گرنگیدان بەقازانجو ماڵ و موڵك، کار بۆ (ئەو دنیا)یان بکەن. بەڵام (مارتن لۆسەر) کە پێشەنگی بزاوتی ڕیفۆرمی ئاینی بوو لە ئەڵمانیا هەوڵیدا ئاشتبوونەوە لەنێوان ئاینو خواستە دنیاییەکانی مرۆڤدا بسازێنێ، ڕێز لەڕەهەندی دنیایی مرۆڤ بگرێ. لۆسەر پێی وابوو نابێ لەخواپەرستیدا هیچ نێوەندێك لەنێوان یەزدانو مرۆڤدا هەبێت، پیاوانی کڵێسا بۆیان نیە ڕۆڵی ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و یەزدان ببینن. ئەو بزاوتە بەشێك بوو لە بزاوتی مۆدێرنەی ئەوروپی کە تەواوی ئەو کیشوەرەی هەژاندو درزێکی گەورەی خستە دیواری دۆگماتیزمی ئاینیو چەقبەستنی کڵێسایی و بانگەشەی کرد بۆ پەنابردن بۆ ئەقڵ بیرکردنەوەی ئازاد لە پرسەکانی ئاین و خواپەرستیدا[3].

بزاوتی ڕیفۆرمی ئاینی سەرەتا لەئەڵمانیا دەرکەوت بەڵام پاشان هەموو ئەوروپای گرتەوە، زەمینەی خۆشکرد لەبەردەم لەدایکبوونی سیستمی عەلمانی و پێشکەوتنی شارستانیەتی پیشەسازیی خۆرئاواییدا کە مرۆڤی بەرەو کارو قازانج و کەڵەکەکردنی سەرمایە هاندەدا. ئەو بزاوتە لەسەردەمێکدا سەریهەڵدا کەمۆدێلی ئیمپراتۆریای ئاینی لەئەوروپا بەرەو پوکانەوە دەڕۆیشتو مۆدێلی دەوڵەتی نەتەوەیی لەدەرکەوتنو بەرجەستەبووندا بوو. ئاشکرایە مەرجەعیەتی ئیمپراتۆریای ئاینی بەپلەی یەکەم کڵێساو زمانی لاتینی بوو. بۆیە دەبوو دەوڵەتی نەتەوەیی بەدوای مەرجەعیەتێکی ئاڵتەرناتیڤدا بگەڕێ کە ڕەوایەتی پێببەخشێ. دەوڵەتی نەتەوەیی وەك ئیمپراتۆریای ئاینی خاوەنی ئیدیعای گەردونی نیە، ئیدیعای ئەوە ناکات کە دەوڵەتی هەموو نەتەوە جیاوازەکانە، پەیمانی ئەوە نادات کەمرۆڤ لەم دنیاو لەودنیا کامەران دەکات. بەڵکو دەوڵەتی نەتەوەیی خاوەن پێناسێکی دیاری کراوە لە شوێن و کاتدا، لەڕووی شوێنەوە پەیوەندیی بەجوگرافیایەکی دیاریکراوەوە هەیە کە شوێنی نیشتەجێبوونی نەتەوەیە، لەڕوی کاتیشەوە ژیانی مرۆڤ تەنها لەم دنیا ڕێکدەخاو هەموو ئەو پەیمانانەی کە دەیدا بە مرۆڤ پەیمانی دنیایین. هەربۆیە لەگەڵ دەرکەوتنی دەوڵەتی نەتەوەییدا لەئەوروپا دەبوو گۆڕانکاری لەتەفسیری ئاینییشدا ڕووبدات. گرنگترین گۆڕانکاری کە لەو سەردەمەدا ڕوویدا بریتی بوو لەتەرجەمەکردنی ئینجیل بۆ سەر زمانە مەحەلیو نەتەوەییە جیاوازەکانو لەبیرچونەوەی زمانی لاتینی وەك زمانێکی ئاینیو ڕۆشنبیریی پیرۆز کەزمانی ئینجیلو پیاوانی ئاینیو خوێندەوارە ئۆرستۆکراتەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بوو. مارتن لۆسەر یەکەم کەس بوو ئینجیلی وەرگێڕایە سەر زمانی ئەڵمانی. ئیتر خەڵکی ئاسایی پێویستیان بەپیاوانی ئاینی نەما تا ئینجیلیان بۆ تەرجەمە بکەن، بەڵکو خۆیان ڕاستەوخۆ کتێبی پیرۆزیان دەخوێندەوە. واتە دەرکەوتنی دەوڵەتی نەتەوەییو بوژاندنەوەی زمانە نەتەوەییەکانو تەرجەمەی ئینجیل بۆ سەر زمانە جیاوازەکان، ڕۆڵی پیاوانی کڵێسای کاسۆلیکییان لاوازکردو ئازادیی زیاتریان بەخشییە ئەوروپییەکان تا پەیوەندیان لەگەڵ یەزدان پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ بێ و لەسەر بنەمای ئازادیی تاکەکەس دامەزرابێ نەك جەبری کڵێسا.. هەروەها ڕێگەی خۆشکرد لەبەردەم بڵاوبوونەوەی

کولتورێکی پێشکەوتوخوازی تایبەت بە چینەکانی ناوەڕاست و کاڵبوونەوەی ئەو بۆشاییە فراوانەی کە لەنێوان رۆشنبیریی ئۆرۆستوکراتیو رۆشنبیریی میللیدا هەبوو. کرۆکی بزاوتی چاکسازی ئاینی لەسەر سێ کۆڵەکەی سەرەکی دامەزرا:

1-ساناکردنەوەی کۆی عەقیدەی مەسیحی بەتایبەتی لەو خاڵەدا کە پەیوەندیی بە مرۆڤ و ئامرازەکانی پاکبوونەوەو رزگاری مرۆڤەوە هەیە لە سزای یەزدانی و کەمبایەخکردنی ڤێژە دنیاییەکان.

2-پەیوەندی نێوان یەزدانو مرۆڤ پەیوەندییەکی راستەخۆو یەکتەواوکەرەو پێویستی بەهیچ کەسو دەزگایەکەوە تابێتە نێوەند، ئاینیش پرسێکی پەیوەندیدارە بە مرۆڤ و نیەتی مرۆڤەوە.

3-ڕەتکردنەوەی ئەو پلەبەندییەی کە کڵێسای کاسۆلیکی، لەپاپاوە بۆ قەشە بچوکەکان، لەنێوان پیاوان و ئاینی و باوەڕداراندا دایمەزراند[4].

ئەم بزاوتە ئاینییە کاریگەریی زۆری لەسەر شارستانیەت و بوارەکانی ژیانی مرۆڤی ئەورووپی جێهێشت. لەسەر ئاستی ئابوری هانی پێشکەوتنی پیشەسازی و بازرگانیی سەرمایەداری دا. ماکس فیبەر، کە زانایەکی کۆمەڵناسی ئەڵمانییە، لە کتێبێکیدا بەناونیشانی (ئاکاری پرۆتستانتی و رۆحی سەرمایەداری) باسی لە پەیوەندیی نێوان بەهای ئاینی و بەها ئابوریەکانی بازاڕی سەرمایەداری کردووە. لە بەراوردی نێوان مەزهەبی پرۆتستانتو کاسۆلیکدا فیبەر گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کەمامەڵەی ئەرێخوازی پرۆتستانتەکان لەگەڵ سەرمایەداریدا دەگەڕێتەوە بۆ رێنمایی ئاینیی مەزهەبەکەیان کە هانیاندەدا بۆ ئیشو نەسرەوتنو کەڵەکەکردنی قازانجو پارە گلدانەوە کە خۆی لەخۆیدا جۆرێکە لە عیبادەت و رێگایەکە بۆ نزیکبوونەوە لە یەزدان، لەکاتێکدا عیبادەتی کاسۆلیکەکان لەسەر بنەمای دوورکەوتنەوە لە چێژی دنیاو سکهەڵگوشین و چوونە خەڵوەت و خۆئامادەکردن بۆ ئەو دنیا دامەزراوە، تەنانەت قسەیەکی میللی بەناوبانگ هەبوو دەیوت: "مرۆڤ یان دەبێ باش بخوا یان دەبێ باش بنوێ. پرۆتستانتەکان پێیانچاکە باش بخۆن، بەڵام کاسۆلیکەکان وایان پێچاکە باش بنوون"[5].

لەڕاستیدا فەلسەفەی پرۆتستانتی، بەتایبەتی فەلسەفەی تیۆلۆجیی مارتن لۆسەر، رۆڵیکی گرنگی بینی بۆ ڕاهێنانی مەسیحیەکان لەگەڵ بەهاکانی سەرمایەداری و تەنانەت بەهاکانی عەلمانیەتیشدا. بەڵام نابێ دەرکەوتنی کاریگەریی ئەو بزاوتە بەدەر لەگۆڕانە مێژووییەکانی ئەو سەردەمە تەماشابکەین، کە هاوزەمان بوو گۆڕانی ریشەیی لە سیستمی بەها فیکرییە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکاندا.. چونکە ئەو دەرکەوتنە بەشێك بوو لەکۆی سووڕێکی شارستانیی گەورە کە ئەورووپا پیای تێدەپەڕی. بۆیە بینیمان لەو سەردەمەو دوای ئەو سەردەمەش، ئەورووپا بووە مەیدانی چ زنجیرە جەنگێکی ماڵوێرانکەرو چ پشێوییەکی کۆمەڵایەتیو کولتوریی خەتەرناك و چ جەدەلێکی فەلسەفیی قووڵ. چونکە سەردەم سەردەمی بەریەککەوتن بوو لەسەر هەموو ئاستەکان.. سەردەمێك بوو بەها کۆنەکان داڕمابوون بەڵام هێشتا بەها نوێیەکان جێگیر نەبووبوون[6].

## ریفۆرمی ئاینیو رۆڵی لەهاوکێشە سیاسییەکاندا :

سەرباری بانگەشەی ریفۆرمخوازە ئاینییەکان بەرەو ئازادیی تەواو لە خواپەرستیداو دژایەتیکردنی کڵێسای کاسۆلیکی لە قۆرخکردنی حەقیقەتی ئاینی و هاوپەیمانێتی ئەو کڵێسایە لەگەڵ نوخبە سیاسی و ئابورییە کۆنەکاندا..

سەرباری باوەڕی پرۆتستانتەکان بەوەی ئاین پرسێکی تایبەتە بە تاکەکەس و پەیوەندیدارە بە ژیانی رۆحی و ئەبەدی مرۆڤـەوە نەك ژیانی سیاسیی سەرزەمین کە ژیانێکی کاتییە.. سەرباری هەموو تێزە رۆشنگەرو مرۆڤگەریەکانی ئەو بزاوتە، بەڵام سەرەنجام داخڵی هاوکێشە سیاسییە زەمینیو زەمەنیەکان بۆوە، بەئەندازەیەك لەبری ئەوەی ئاین لەکاروباری سیاسی دووربخاتەوە بە زەخمێکی گەورەترەوە هاویشتییە نێویەوە. راستە بزاوتی ریفۆرمی ئاینی بووەهۆی لەناوچوونی یەکێتی کڵێساو بڵاوبوونەوەی ئازادیی ئاینی، بەڵام ئازادیی ئاینی مانای لێبوردنی ئاینی ناگەیەنێ، چونکە لەو سەردەمەدا هەموو عەقیدەو مەزهەبیە ئاینیەکان خۆیان لە عەقیدەو مەزهەبەکانی تر پێباشتر و ڕاستر بوو، چەندین کەمینەی ئاینی و مەزهەبی بڵابوبوونەوە کە دەیانویست ئیعترافی ڕەسمی لەلایەن دەوڵەتەوە بەدەستبێنن. دەوڵەتی نەتەوەیی، کە لەو دەمەدا لە قۆناغی دەرکەوتن و پەرەسەندندا بوو، پێویستیی بە سەپاندنی ئاسایش و دیسپلین بوو، پێی وابوو فرەمەزهەبی رێگرە لەبەردەم ئاسایش و کۆدەنگی نەتەوەییدا، بۆیە پاراستنی یەکێتی ئاینی بووە ئەرکێکی دەوڵەتی نەتەوەیی. ئایرۆنی (موفارەقە)یەك هاتەگۆڕی، چونکە دەوڵەتی نەتەوەیی کە لەبنەڕەتدا دژی ئیمپراتۆریای ئاینی بوو، خاوەن پەیام و پەیمانی زەمینی و زەمەنی بوو نەك ئاسمانی و ئەبەدی.. ماڤ دابەخۆی لەپێناو یەکێتی رۆحی نەتەوەدا دەستوەرداتە کاروباری ئاین و پشتی ئاینێکی دیاریکراوبگرێ دژی ئاینێکی تر. لەبەرامبەریشدا پیاوانی ئاینی، بەتایبەتی ریفۆرمخوازە پرۆتستانتەکان، ئەو هەلەیان قۆستەوە بۆ بڵاوکردنەوەی دیدو تێزەکانیان. مارتن لۆسەر، پێشەنگی ریفۆرمخوازانی ئەڵمانیا، پێیوابوو سەرکەوتنی ریفۆرمی ئاینی بەندە بە پەنابردن بۆ میرەکان و بەدەستهێنانی پشتگیرییان. لە ئینگلتەرا هینری هەشتەم دەسەڵاتێکی رەهای پێڕەوکرد لەپێناو جێبەجێکردنی ریفۆرمی ئاینیدا، کە سەرەنجام بووە هۆی بەهێزکردنی دەسەڵاتی شانشینی.

لە ئەوروپا بەگشتی، کە مشتومڕو ململانێی ئاینی زۆربەی نێوەندەکانی تەنیبوو، پادشا خاوەنی دواپەیڤ بوو سەبارەت بە یەکلایی کردنەوەی هەقیقەتی ئاینی و سیاسی. هەر پارت و مەزهەبێك زووتر بگەیشتایەتە پادشاو بیتوانیایە قەناعەتی پێبکا، شانسی گەشەکردن و بانگەوازکردنی زیاتر بوو. لە ئینگلتەراو باکوری ئەڵمانیا پرۆتستانتەکان چوونەپاڵ میرەکان.. بەڵام لە فەرەنساو ئیسپانیا چوونەپاڵ پیاوماقوڵ و چینە ئۆرستۆکراتەکان لە هەرێم و شارە جیاوازەکاندا، بۆیە لەو دوو وڵاتە مەزهەبی رەشوڕووتی خەڵك هەر کاسۆلیکی بوو. سەرەنجام شتێك نەبوو کە پاشاکان بیدۆڕێنن، چونکە ئامانجی سەرەکی ئەوان بەهێزکردنی دەسەڵات بوو، ئەوان سوودیان لە ئاینو ریفۆرمی ئاینیی وەردەگرت، لەپێناو ئامانجێکی نائاینیدا کە دەسەڵاتی زەمەنی و زەمینی بوو. واتە هەرچەندە ریفۆرمی ئاینی حوکمە نەگۆڕەکانی کڵێسای رۆمای لەرزاندو هاوپەیمانێتی تەقلیدیی نێوان پاپاو دەسەڵاتدارانی هەڵوەشاندەوە، بەڵام شێوازێکی تری لە هاوپەیمانێتی نێوان دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی نەتەوەیی و کڵێسای نەتەوەیی دروستکرد، کە لەسایەیدا بەتەواوی ئاینو سیاسەت تێکەڵکران[7]. بەمانایەکی تر، هەرچەندە ریفۆرمی ئاینی رێگەی خۆشکرد لەبەردەم لەدایکبوونی سیستمی

عەلمانیدا، بەڵام سەرەتا نموونەیەکی تەواو ناعەلمانی پێشکەش بە ئەوروپییەکان کرد، نمونەیەك كە لەیەك كاتدا زیان و قازانجیشی گەیاند: زیانی گەیاند كاتێ بووە هۆی تێکەڵکردنێکی ترسناکی نێوان ئاین و سیاسەت و بەرپابوونی چەندین شەڕی مەزهەبی، قازانجیشی گەیاند کاتێ دیدی دۆگمای ئەوروپییەکانی لەقاند و ڕەوڕەوەی مێژووی خێراتر کرد بەرەو لەدایکبوونی سیستمی عەلمانی و دابینکردنی ئازادیەکان و دەستکشانەوەی دەوڵەت لەکاروباری ئاینی.

پرسیارێك كە لەو دەمەدا هاتەگۆڕێ: ئایا کڵێسا بۆی هەیە دەستوەرداتە کاروباری سیاسی و لایەنی گەل بگرێ گەر پادشا و دەسەڵاتدارەکان زیادەڕۆییانکرد لە زوڵم و ستەمدا. ریفۆرمیستەکان کە خۆیان دژی دیکتاتۆریەتی پیاوانی ئاینی تەقلیدی بوون، دژی ئەوە بوون کڵێسا بەکاربهێنرێ بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی دنیایی، دەبوو خاوەنی وەڵامێك بن سەبارەت بە دیکتاتۆریەتی حاکمە زەمەنی و دنیاییەکان. گەر ڕەوایەتی دەسەڵاتی دنیایی فەرمانڕەواکان لەپیاوانی ئاینییەوە سەرچاوەی گرتبێ ئەوا هەق دەدەن بەخۆیان دەسەڵاتی ڕەهاو بێ قەیدومەرج دابمەزرێنن و دەسەڵاتی خۆیان بشوبهێنن بەدەسەڵاتی یەزدان لەسەر زەوی، ئەوەی پێی دەوترێ (ماف ئیلاهیی پادشا)، بەڵام گەر ئەو دەسەڵاتە دنیاییە لە گەلەوە سەرچاوەی گرتبێ، نەك کڵێسا، ئەوا خەڵکی بۆیان هەیە ئەو دەسەڵاتە لە پادشا وەرگرنەوە کاتێ دەسەڵاتەکە دژی خودی گەل بەکاردەهێنرێ[8].

**مارتن لۆسەر** (1483-1546):

پێشەنگی ریفۆرمخوازانی ئاینی بوو لە ئەڵمانیا. لەنێوەندێکی ئاینیی میللیدا خۆی پێگەیاندو توانایەکی گەورەی لەلێکۆڵینەوەی تیۆلۆجی و رەخنەییدا هەبوو. لەنێوان ساڵەکانی (1520-1523) سێ کتێبی سەرەکی خۆی نوسی دەربارەی ئازادیی ئاینی و پەیوەندیی نێوان سیاسەت و ئاین[9]. لۆسەر هەموو ئەو رەخنانەی زیندووکردەوە کە لە سەدەی چواردەوە ئاڕاستەی کڵێسای رۆمانی دەکران، بەڵام بەو پێیەی بارودۆخ لەسەردەمی ئەودا لەبارتر بوو بۆ ریفۆرم تێزە رەخنەییەکانی سەدایەکی گەورەتریان پەیداکرد و چەندین شوێنکەوتووی لە نێو ئەڵمانییەکان و لە دەرەوەی ئەڵمانیاش بۆ پەیدابوو، بەئەندازەیەك مەزهەبەکەی لە ئاینی مەسیحیدا ناوی (کڵێسای لۆسەریی) لێنرا.

لۆسەر پێی وابوو پیاوانی کڵێسای تەقلیدی (کاسۆلیکی- رۆمانی) بەناوی خواوە مەسیحیەکان دەرووتێننەوەو خۆیان دەوڵەمەنددەکەن، پارەو دەرامەتی ئەڵمانیەکان زەوتدەکەن و ڕەوانەی کۆشکەکانی رۆمای دەکەن، قەشەو مەترانە بیانیەکانیان لەوانەی ئەڵمانیا پێباشترەو بەئارەزووی خۆیان، بەجۆرێك لەگەڵ بەرژەوەندیی دنیایی خۆیاندا بگونجێ، پیاوانی ئاینی لە کڵێساکانی ئەڵمانیادا دادەمەزرێنن. بەبڕوای لۆسەر پیاوانی کڵێسای تەقلیدی دوو گوناه دەکەن: یەکەم، بەناوی ئاسمان و ئەو دونیاوە خۆیان لەم دنیاو لەسەر زەوی دەوڵەمەنددەکەن. دووەم، هەر بەناوی ئەودنیاوە خۆیان لەهەموو سزاو لێپرسینەوەیەکی ئەم دنیا دزیوەتەوە، ماف بەخۆیان دەدەن بەناوی ئاسمانەوە لەبەرامبەر بەرژەوەندیی مادیدا (بەخشین-نامە) بە مەسیحیەکان بفرۆشن، واتە بەهەشتیان پێبفرۆشن. لۆسەر جەختدەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە مەسیحیەکان هەموویان بێجیاوازی، لە پاپاوە بۆ

کەسێکی ئاسایی، ئەندامی کڵێساو هاوڕێی مەسیحن. ئەوەی پەیوەندیی بەنیەت و عیبادەتی مرۆڤەوە هەیە کەس بۆی نیە قسەی لێبکا تەنها خوا نەبێ، چونکە کەس ناتوانێ نیەتی کەسی تر بخوێنێتەوە، هەرچی ئەوەی پەیوەندیی بە دنیاوە هەیە، ئەوا دەبێ هەموان لەبەردەم دەسەڵاتی زەمینیدا یەکسان بن، واتە هەروەك چۆن پیاوێکی ئاسایی بەرپرسیارە لەبەردەم یاسادا، قەشەکانیش بەهەمان شێوە بەرپرسیارن بەرامبەر ڕەفتارەکانیان‌و لەکاتی دزی یان گەندەڵیدا دەبێ سزا بدرێن:

"شتێك کە بەڕاستی تەحەمول ناکرێ ئەوەیە کە چۆن دەبێ یاسای رۆحی تەنها رێزی گەورە لە پیاوانی ئاینی و گیان و سەروەت و سامانی ئەوان بگرێ. چما خەڵکی تر، ئەوانەی سەرقاڵی کاری دنیان مەسیحی و کەسانی رۆحی و خواپەرست نین؟ چما ئەوانیش ئەندامی کڵێسا نین؟"[10].

لێرەوە مارتن لۆسەر رێزی گەڕاندەوە بۆ کاری دنیایی و حەسانەتی ئاینی لەپیاوانی ئاینی سەندەوە، دژی دەمارگیری ئاینی بوو، دژی ئەوە بوو بەناوی ئاینەوە خەڵکی ئاسایی لەلایەن پیاوانی ئاینییەوە بچەوسێنرێنەوە. لۆسەر کەسێك بوو بڕوای بە پەیوەندیی رۆحیی قووڵی نێوان تاکەکەس‌و یەزدان هەبوو، خواپەرستی لای ئەو جۆرێك بوو لە ئەویندارییی سۆفیگەرانە، دوور لەهەر ڕییاو نیفاقێك، دوور لە شەعائیرو کۆبوونەوەو سرووتی ساختە کە پیاوانی کڵێسای تەقلیدی جەختیان لەسەر دەکردەوە.

لۆسەر ئەوەیشی دەزانی کە کڵێسای رۆما خاوەنی دەسەڵاتێکی رەمزی و دارایی و مێژویی ئەوتۆ بوو کە خەڵکی نەیاندەتوانی هێندە بەئاسانی لێی دەربازبن، بۆیە پێی وابوو پەنابردن بۆ میرو دەسەڵاتدارە سیاسیەکان لەپێناو بڵاوکردنەوەو سەرخستنی ریفۆرمی ئاینیدا کارێکی ئاساییەو پێچەوانەی ئایین نیە، تەنانەت گەر ئەو دەسەڵاتدارانە زۆرداریش بن، بەئەندازەیەك پێیوابوو: "میرو پادشاکان لەکاتی پێویستدا دەتوانن رۆڵی پیاوانی ئاین ببینن"[11]. لۆسەر دەیویست ترسی خەڵکی بشکێنێ بەرامبەر کڵێسای رۆماو هەست بکەن کە دەسەڵاتداران لەپشت ئەوانەوەن: "گەر لەناو پادشاو میرو نەبیلەکاندا، لەناو شارو گروپەکاندا، رێگەبکرێتەوە لەبەردەم ریفۆرمدا، ئیتر ئەو کات ئەسقوف و پیاوانی ئاینی ناترسن و ئەوە دەبێتە هۆکارێك کە ئەوانیش دەست بدەنە ریفۆرم"[12].

بەڵام لەکاتێکی وادا، دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایان بێبەرامبەر پشتگیری ریفۆرمی ئاینی ناکەن، بەڵکو بەمەرجێ ئەو کارە دەکەن کە ریفۆمیستەکانیش پشتگیری لە سیاسەتەکانی ئەوان بکەن. بۆیە لۆسەر دەرکی بەم حەقیقەتە کردو لە رێنماییە ئاینیەکانیدا باسی لە تاعەتی بێ قەیدو مەرجی فەرمانڕەوایان کرد لەلایەن ئەو کەسانەوە کە فەرمانڕەوایی دەکرێن. واتە هەرچەندە لەسەر ئاستی ئاینی بڕوای بەئازادیی تەواوی تاکەکەس هەبوو، بەڵام لەسەر ئاستی سیاسی بڕوای بە ملکەچبوون هەبوو بۆ حکومەت، داواشی لە شوێنکەوتووانی خۆی کرد رێز لە دەسەڵاتی مەدەنی دەوڵەت بگرن، نەك لەبەر خاتری دەسەڵاتداران بەڵکو لەبەر خاتری دەسەڵات. واتە لۆسەر دەسەڵات و دەسەڵاتداری جیاکردەوە، یەکەمیان کەسایەتییەکی مەعنەویی هەیە کە پێویستە رێزی لێبگیری لەپێناو ڕاگرتنی ئاسایش‌و هێمنی رێکخستنی پەیوەندییەکانی خەڵکدا.. بەڵام دووەمیان، واتە دەسەڵاتدار، مرۆڤێکە کە دەشێ

وەك هەر كەسێكی تر بكەوێتە هەڵەوە، تەنانەت جارێكیان وتی: "دەسەڵاتداران گەمژەترین و بەدترین كەسن لەسەر ڕووی زەوی"[13]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەبێ ڕێزیان لێبگیردرێ، لەبەر خاتری هێشتنەوەو بەهێزكردنی دەسەلات.

هەرچەندە تێزە سیاسییەكانی لۆسەر وەك تێزە ئاینیەكانی قووڵ و لیبراڵی نەبوون، بەڵام ئەو پێی وابوو دەبێ سیاسەت وەك ئامرازێك تەماشابكرێ لەپێناو غایەتێكی دووردا بۆ ئازادبوونی باوەڕدار لە ترس و سانسۆری كلێسای تەقلیدی و لەپێناو دامەزراندنی كلێسایەكی نیشمانیدا، كە تیایدا ئەڵمانیەكان، قەشەكان و مرۆڤە ئاساییەكان بەئازادی و دوور لەچاودێریی كلێسای ڕۆما خواپەرستی بكەن. ئەڵبەتە ئەوەش رۆڵێكی گرنگی بینی لە بەهێزكردنی رۆحی نەتەوەیی ئەڵمانیدا، كە (سێ) فاكتەری سەرەكیی رۆڵی تێدا بینی: یەكەم، بەرجەستەبوونی دەسەلاتی رەهای میرو فەرمانڕەوا سیاسییە ئەڵمانیەكان. دووەم، دەركەوتنی چینی بۆرجوازی وەك هەڵگری كولتوری میللی بەپێچەوانەی چینی ئابوری كۆنەوە كە خاوەنی كولتورێكی ئۆرستۆكراتی بوون. سێیەم، ریفۆرمی ئاینیی كە لەسایەیدا كلێسای نیشتمانی دامەزراو ئینجیل وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئەڵمانی.

## جۆن كالڤن (1509-1564):

ریفۆرمیستێكی ئاینی فەرەنسی بوو كە دیدو بۆچوونەكانی لەزۆر ڕووەوە لەهی لۆسەر دەچوون. بەڵام جیاوازیەكەی لەوەدا بوو كە سەر بەنەوەیەكی تری ریفۆرمخوازەكان بوو، خاوەنی پاشخانێكی رۆشنبیریی قووڵ و لێكدراو بوو، زانستە ئاینی و تیۆلۆجیەمانی گرێ دابوو لە زانستی یاسایی و سكۆڵاستیكی. لە پاریس و ئۆرلیان و بۆرگ و چەند نێوەندێكی تری ئەوروپی وانە سەرەكیەكانی ئەو سەردەمەی لەبواری فەلسەفەو لوجیك و یەزداناسیدا خوێندووە. كتێبی (دامەزراوەی كریتستیانی) یەكێكە لە كتێبەكانی كالڤن كە تیایدا لە دیدێكی فیكریی، تیۆلۆجی، مێژویی بەراوردكارەوە باس لە ریفۆرمی ئاینی دەكا[14].

دیدو بۆچوونەكانی كالڤن لە سەردەم و كۆمەڵگایەكدا سەریانهەڵدا كە دامودەزگاكانی دەوڵەتی مۆدێرن لە پەرەسەندن وجێگیربووندا بوون. بۆیە دەبوو بەهەمان زمانی سەردەمەكەی باس لە رۆڵی ئاین و پێویستی چاكسازی لە هزر و رەفتاری ئاینیدا بكا. ئەو پێی وابوو دەبێ سنورێكی ڕوون بەدەوری هەموو دەزگاو رەفتارە دنیایی و ئاینیەكاندا بكێشرێن تا تێكەڵی یەكتر نەبن. دەبێ هاوسەنگیی لەنێوان دەسەلاتی دەوڵەتو دەسەلاتی كلێسادا رابگیردرێو هیچ كامیان سنوری ئەوی تریان نەبەزێنێ. لەو پێناوەشدا دەبێ هەموو ئەو شتە رۆحیانەی كە لە كتێبی پیرۆزدا هاتوون لە شتە دنیاییەكان جیابكرێنەوە كە مرۆڤەكان لەڕێگەی وتووێژەوە لەسەری ڕێكدەكەون.

كالڤن داوای لەهەموو مەسیحیەكان كرد كە پشتگیری لە حكومەتی مەدەنی بكەن و فەرمانەكانی جێبەجێبكەن، چونكە هەروەك چۆن مرۆڤـ پێویستی بە خواردن و پۆشاك هەیە ئاوهاش پێویستی بە حكومەتێك هەیە كە ئاسایش و كەرامەتی بۆ دابینبكا. بەڵام هەركاتێ دەسەلاتداران دژی حكومەتی مەدەنیو لەپێناو بەرژەوەندییەكانی خۆیاندا كاریان كرد ئەوا نابێ تاعەتیان بكرێو یاخیبوون لێیان دەبێتە ئەركێكی ئاینی. هەروەها كالڤن پرسە رۆحیەكان بە بەشێك لەژیانی تایبەتی

مرۆڤ لەقەڵەمدەدا کە جیاوازە لەژیانی گشتی و مرۆڤەکان لەسەری ڕێکدەکەون لەپێناو ڕێکخستنی کاروبارەکانیان لەدنیادا. بەڵام پابەندبوون بەژیانی گشتیشەوە بەشێکە لە ئەرکی ئاینی کە لەسەر سێ کۆڵەکەی گشتی دامەزراوە:

1. فەرمانڕەوا: کە دەسەڵاتێکە لەلایەن یەزدانەوە لەسەر زەوی دادەنرێ.

2. یاسا: کە یەزدان خۆی دایدەنێ، بەڵام بەناوی دەسەڵاتی زەمینییەوە دەریدەکا.

3. گەل: کە زۆرجار ڕۆڵێکی وەرگری نێگەتیڤی هەیە. هەندێ جار پابەندە بەیاساوە هەندێجاریش خۆی لێدەدزێتەوە. بەڵام کالڤن داوا لە گەل دەکا تاعەتی یاسا بکا لەترسا نا، بەڵکو وەك جۆرێك لە دۆستایەتی هوشیارانە.

لەهەندێ شوێندا کالڤن باس لە ڕەوایەتی یاخیبوون و شۆڕش دەکا، بەتایبەتی کاتێ دەسەڵاتدارێك یاخی دەبێ لەفەرمانی ئیلاهی و دەسەڵاتەکەی نابێتە بەشێك لەدەسەڵاتی یەزدانی. یاخیبوون دژی گەندەڵیی سیاسی ئەرکێکی ئاینییە، بەڵام ئەویش مەرجی هەیەو نابێ هەڕەمەکی و میللی بێ، بەڵکو دەبێ کەسانێك سەرپەرشتی بکەن کە خاوەنی دەسەڵاتێکی سروشتی بن، واتە توانای کۆکردنەوەی خەڵك و سەرپەرشتیکردنی شۆڕشیان هەبێو بتوانن لەکاتی پێویستدا جڵەوی بکەن نەبادا پاشاگەردانی و پشێوییەکی ئەوتۆی لێبکەوێتەوە کە ئەمسەرو ئەوسەری دیارنەبێ(15).

کڵێسای کالڤنی لەهۆڵەنداو سکۆتلەنداو ئەمریکا بڵاوبۆوە، هۆکارێك بوو لەهۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی فیکری شۆڕش و ڕەوایەتی پەیداکردنی بیرۆکەی بەرەنگاریی دژی دیکتاتۆریەت، بەتایبەتی لەفەرەنساو سکۆتلەندا، هۆکارەکەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی حکومەت لەو دوو وڵاتەدا پشتگیریی مەزهەبی پرۆتستانت و ریفۆرمی ئاینی نەکرد. واتە لەو دوو وڵاتەدا بەپێچەوانەی ئەڵمانیاوە مەزهەبی پرۆتستانت نەبووە بەشێك لە مەزهەبی ڕەسمی دەوڵەت. لەڕووی تیۆرییشەوە ڕێنماییەکانی کالڤن وەك ڕێنماییەکانی لۆسەر سۆفیگەرانە نەبوون، بەڵکو جەختیان لەسەر ئەخلاقی پراکتیکی دەکردەوە کە پێویستە لەژیاندا ڕەنگبداتەوە نەك تەنها لەچوارچێوەی عیبادەتدا گیربخوا(16).

## چۆن نۆکس:

پێشەنگی گروپێکی بەهێزی پرۆتستانتی بوو لە سکۆتلەندا. بڕوای بە هەموو ڕێنماییەکانی کالڤن هەبوو، کە گرنگترینیان تاعەت بوو بۆ دەسەڵاتی سیاسی، بەڵام بارودۆخی سیاسی کاریگەریی لەسەر دیدو بۆچوونەکانی ئەویش بەجێهێشت.

ساڵی 1558 حکومەتی سکۆتلەندا، کە لەلایەن کڵێسای کاسۆلیکییەوە پشتگیریدەکرا، بڕیاری سزادان و نەفیکردنی چۆن نۆکسی دەرکرد، بەوەش ریفۆرمخوازانی ئاینی چوونە بەرەی دژ بە حکومەتەوە. نۆکس بانگەوازێکی ئاراستەی پیاوماقوڵان و ڕۆڵەکانی گەل و چینەکانی ئەو دەمەی سکۆتلەندا کرد، لەو بانگەوازەدا هێرشی کردبوە سەر دەسەڵاتدارانی سیاسی کە ڕێدەگرن لەبڵاوبوونەوەی ئاینی راستەقینەو حوکمی لەسێدارەدان بەسەر خەڵکیدا دەسەپێنن، بەو حوکمانەشیان تەنها ئازاری جەستەیی باوەڕداران نادەن، بەڵکو ئازاری ڕۆحیشیان دەدەن، بێبەشیاندەکەن لە "خۆراکی گیانیان، مەبەستم پەیڤی یەزدانی قەشەنگە"(17).

گەر کالْڤن بەشێوەیەکی ئالْۆز باسی لە مافی بەرگریکردن کردبێ دژی فەرمانڕەوایەتی زۆردار، ئەوا چۆن نۆکس زۆر بەڕاشکاوانە دەسبەرداری بیرۆکەی تاعەتی کوێرانەی دەسەلاْتی سیاسی بوو. پێیوابوو کە تاعەت بۆ حاکمی زۆردار گوناه و سەرپێچیکردنە لە شەرەف و سەروەریی یەزدان. "ئەوانەی کە دەلْێن خوا فەرمانی پێداوین تاعەتی ئەو پادشایانە بکەین کە خواپەرست نین و لەسەر رێی راست نین، وەك ئەوەیە بلْێن خوا خۆی داهێنەرو پارێزەری هەموو زولْم و ستەمێکە"[18].

تەنانەت نۆکس پێیوابوو خەلْکی بەگشتی بۆیان هەیە بێنەدەنگ کاتێ دەبینن کەسانێك لە ئاین لادەدەن، یان بەناوی ئاینەوە خەلْکی فێری بتپەرستی دەکەن، لێرەدا مەبەستی کاسۆلیکەکان بوو. چونکە دەسەلاْتداران تەنها جێبەجێکەری ویستی خەلْکن کە متمانەیان پێبەخشیون و هەلْیانبژاردوون، هەر کاتێکیش ئەو متمانەیە بدۆڕێنن ئەوا خەلْکی بۆیان هەیە لێیان هەلْگەڕێنەوە. بەبڕوای وی بەرەنگاربوونەوەی زولْم بەشێکە لە ئەرکی ئاینی و گەوهەری ریفۆرمی ئاینییە، واتە تەنها مافێکی میللی نیە بەلْکو بەشێکە لەعەقیدەی باوەڕدار[19].

هەرچەندە ریفۆرمخوازە ئاینیەکان خۆیان وەك بیرمەندی بواری سیاسەت و کۆمەلْگا نەناساند و هەرچەندە پەیامی سەرەکی وان بریتی بوو لە جیاکردنەوەی دەسەلاْتی ئەزەلی و ئەبەدی یەزدان لە دەسەلاْتی کاتی و رێژەیی ئینسان، بەلاْم بۆچوونەکانیان بەگشتی رێگەیان خۆشکرد لەبەردەم بەرپابوونی شۆڕشێکی فیکری و کۆمەلاْیەتی کە شوێنپەنجەی بەسەر تەواوی جومگەکانی ژیاری خۆرئاواییەوە جێهیشت. لەدوای ریفۆرمی ئاینییەوە لۆجیکی سیاسەتیش گۆڕانی بەسەر هات و بیریاران و یاساناسان بوێرانەتر باسیان لە سنورەکانی دەسەلاْتی سیاسیو تێکەلْنەکردنی پرسە رۆحیەکان بە پرسە دنیاییەکان دەکرد.

## پەراوێزەکان

(1)زاراوەی پرۆتستانت لە وشەی (*Protest*) ەوە وەرگیراوە کە بەمانای نارەزایی دەربڕین دێ. پرۆتستانتەکان ناڕازی بوون لەئاست هەموو ئەو سروتو رێنماییە ئاینیانەی چاخەکانی ناوەڕاست و چاخەکانی دواتریش کە لەپێناو بەرژەوەندی هاوبەشی پیاوانی ئاینی و دەسەلاْتداراندا بەناوی ئینجیلەوە دەدرانە خەلْك. ئەوان پێیان وابوو دەقەکانی کتێبی پیرۆز لەوە ڕوونترن کە پیاوانی ئاینی مەزهەبی کاسۆلیکی ئیدعای دەکەن و گەڕانەوە بۆ ئەو دەقانە هەموو ئیدعاو رێنماییەکانی ئەوان ڕەتدەکاتەوە، هەربۆیە هەندێ جار نازناوی ئینجیلیەکانیان لەخۆیان دەنا. بڕوانە: الفرق الدینیه، البروتستانت، عن:

***http://www.saaid.net/feraq/mthahb/66.htm***

(2)هیومانیستەکانی سەردەمی ڕێنیسانس شۆڕشێکیان دژی ئەخلاقی مەسیحیی چاخەکانی ناوەڕاست بەرپاکرد کە مرۆڤی وەك کائینێکی گوناهبارو جەستەی مرۆڤیشی وەك رەهەندێکی ئاژەلْی و ناشرین تەماشادەکرد. هیومانیزم کاریگەریی لەسەر هەموو بوارەکانی ژیانی ئەوروپی بەجێهێشت بەتایبەتی هونەرو دیدی ئاینی، تەنانەت مێژونوسێکی وەك بی. ئۆ. کریستیلەر پێیوایە هیومانیزم ڕێچکەیەك نەبوو دژ بەئاینی مەسیحی، بەلْکو دژی تیۆلۆجیای سکولاْستیکی بوو کە قەشەکانی ئەو سەردەمە قۆرخیان کردبوو، رێچکەیەك بوو گرنگی بە مرۆڤ و پێگەی مرۆڤ دەدا وەك

ئەوەی لە سەرچاوەی رەسەنی ئاینەکانەوە، بەتایبەتی ئاینی مەسیحی، جەختی لەسەر کراوە. بڕوانە: بيتر وليندا موري، فن عصر النهضة. ت: فخري خليل. مر: د. سلمان الواسطي. ط1، بغداد: دار الشؤون الثقافية العامة، 2001، ص10-11. بەلام ئیمیل بریهێ پێیوایە کاریگەریی هیومانیزم لەسەر دیدی ئاینی راستەوخۆ نەبوو، چونکە ریفۆرمخوازە پرۆتستانتەکان هەر لەسەرەتاوە کەوتنە ململانێوە لەگەڵ مرۆڤگەرەکاندا بەهەمان ئەو ئەندازەیەی لە ململانێدا بوون لەگەڵ تیۆلۆجیای سکۆلاستیکیدا، بەلام بەگوێرەی هەردوو بۆچوونەکە پەسەندکردن یان رەتکردنەوەی هیومانیزم کاریگەریی زۆری لەسەر بۆچوونی ئەو دەمەی مەسیحیەکان و پاشانیش بزاوتەکانی چاکسازی هەبوو. دەربارەی شیکردنەوە ئیمیل بریهێ بۆ ململانێی نێوان پرۆتستانتەکان و هیومانیستەکان بڕوانە: اميل برهييه تاريخ الفلسفة، الجزء الثالث، العصر الوسيط والنهضة. ت: جورج طرابيشي. بيروت: دار الطليعة، 1983، ص273.

(3)بڕوانە: د. عبدالخالق حسين، العلمانية والإسلاموية.. عن:

*http://www.metransparent.com/texts/abdulkhaliq_hussein/abdulkhaliq_hussein_secularism_and_islamism.htm*

(4)دەربارەی ئەو سێ خاڵە سەرەکییە بڕوانە: تاريخ الفكر السياسي الحديث، الدكتور عبدالرضا حسين الطعان. بغداد: دار الحكمة، 1992، ص229-230.

(5)دەربارەی ئەو پەندە ئەڵمانییە بڕوانە کتێبەکەی ماکس فيبەر: الأخلاق البروتستانتية وروح الرأسمالية. ت: محمد علي مقلد. بيروت مركز الإنماء القومي، ص19. دەربارەی بۆچوونەکانی فیبەریش لەو بارەیەوە بڕوانە نوسینێکی پێشووترمان: تیرۆریزم و جیهانگیری.. زەبروزەنگ لەنێوان کولتوری شمشێرو تەکنیکی دیجیتاڵدا، گۆڤاری "سەردەمی رەخنە"، ژمارە (2)2006، ل89-90.

(6)سەرچاوەی پێشو، ل 89-90.

(7)دەربارەی زەمینەی دەرکەوتنی ریفۆرمی ئاینی بڕوانە: جورج. ە. سباين، تطور الفكر السياسي، الكتاب الثالث. ت: د. راشد البراوي، القاهرة: دار المعارف بمصر494-497.

(8)المصدر السابق، ص 495-498.

(9)بڕوانە: جان توشار، تاريخ الفكر السياسي. ت: د. علي مقلد، بيروت: الدار العالمية، 1981، ص214-215.

(10)جورج. هـ. سباين، تطور الفكر السياسي، الكتاب الثالث. ت: د. راشد البراوي، ص 500.

(11)المصدر السابق، ص501.

(12)المصدر السابق، 501.

(13)المصدر السابق، ص502.

(14)بڕوانە: جان توشار، تاريخ الفكر السياسي. ت: علي مقلد، ط1، بيروت: الدار العالمية، 1981، ص218.

(15)بڕوانە: الفكر السياسي الوسيط والحديث، عبدالجبار عبد مصطفى. بغداد: وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، 1982. ص64- 65.

(16)بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی بۆچوونەکانی کالڤن و رۆڵی لە هاوکێشە سیاسیەکاندا، بەتایبەتی لە فەرەنسا، بڕوانە: جورج. هـ. سباين، تطور الفكر الساسي، الكتاب الثالث، ص 503-511.

(17)عن: جورج. سباين، مصدر سابق، ص511.

(18) جون نوكس، عن: جورج. هـ. سباين، المصدر السابق ص512.

(19)بڕوانە: المصدر السابق،ص 511-513.

# کارلێکی کۆمەڵایەتی و ژیانی رۆژانە

ئانتۆنی گیدنز

لە فارسییەوە: کۆسار فەتاحی

دوو کەس لە نێو بازاڕدا لە تەنیشت یەکەوە تێدەپەڕن و سەیری یەکدەکەن و بەخێرایی روخسارو جۆری جلوبەرگی یەکتر هەڵئەسەنگێنن. کاتێ نزیك دەبنەوەو لە تەنیشت یەکەوە تێئەپەڕن، هەریەکەو رووی بەلایێکدا دەسووڕێنێ تا چاو لە چاوی ئەویدی نەکا. ئەو شتەی لێرەدا باسی دەکەین، رۆژانە بە ملێونان جار لەشارە گەورەو بچوکەکانی جیهاندا روودەدەن.

کاتێ رێبواران بە خێرایی سەیری یەکتر دەکەن و لە کاتی نزیکبوونەوەدا سەرلەنوێ روویان وەردەگێڕن، شتێك نمایش دەکەن کە، ئێرڤین گۆفمەن (*Ervin Goff man, 1967-1971*) پێی دەڵێ سەرنجنەدانی مەدەنی. ئێمە زۆرجار چاوەڕوانییەکی لەوچەشنەمان لە یەکتر هەیە. سەرنجنەدانی مەدەنی بە هیچ شێوەیەك بەمانای پشتگوێخستن نییە. هەرکەس ئەویدی تێدەگەیەنێ کە هەستی بە بوونی کردووە، بەڵام کارێك ناکا کە بەرامبەرەکەی هەست بە وەڕەزبوون بکا. ئێمە کەموزۆر – بەبێ مەبەست – سەرنجنەدانی مەدەنی بۆ کەسانیتر نمایش دەکەین، بەڵام ئەمانە لە ژیانی ئێمەدا گرنگییەکی بنەڕەتییان هەیە. خەڵك بەم شێوەیە بە یەکتر دەڵێن پێویست ناکا بە گومانەوە چاو لە کەسانیتر بکەین و ئەوان بە دوژمنی خۆمان بزانین، یان بە هەر شێوەیەکیتر خۆمانیان لێ دوربخەینەوە (*Goff man, 1963*).

باشترین رێگا بۆ تێگەیشتن لە بایەخ و گرنگی ئەم بابەتە ئەوەیە کە بیر لەو کارانە بکەینەوە کە ئەم شێوازەی تێدا بەکار نابرێ. لە هەندێ حاڵەتدا لەوانەیە کەسێك بێ پسانەوە چاو ببڕێتە چاوی کەسێکیترو روخساری راشکاوانە هەستێکی تایبەت دەرببڕێ. ئەم کارە زیاتر لە نێو ئەویندارەکان، ئەندامانی بنەماڵە، یان لە نێو هاوڕێیە نزیکەکان یان لەو شوێنانەدا روودەدا کە یەکێك لە یەکێکیتر تووڕە بێ. نامۆکان یان ئاشناکان بە رێکەوت چ لە نێو بازاڕ یان لە شوێنی کار یان لە نێو میوانییەکدا هەرگیز بەم شێوە چاو لەیەکتر ناکەن. دەکرێ چاوتێبڕین تەنیا لە شوێنێکدا کە دوو تاقمی بێگانەی دژبەیەك لەوانەیە

بەم شێوەیە سەیری یەکتر بکەن بە نیشانەی دوژمنایەتی لێك بدرێتەوە. سپی پێستەکانی باشووری ئەفریقا بەوە ناسرابوون کە کاتێ ڕەش پێستەکان بەلایاندا تێپەڕ دەبوون، مۆڕەیان لێدەکردن. تەنانەت دوو هاوڕێ لەکاتێکدا کە لە گەرمەی قسەکردندان، دەبێ بزانن چۆن چاو لەیەك دەکەن.(*Goodwin, 1981*). لە کاتی گفتوگۆدا هەرکەسێك بەشێوەی ڕوانینەکەیدا نیشان دەدا کە چەندە لە باسەکەدا بەشدارە. ڕوانینی زۆر جیددیانە بۆ کەسێك ڕەنگە نیشانەی ئەوە بێت کە متمانەی بە قسەکانی ئەو نییە، یان لانیکەم بەومانایە لێکبدرێتەوە کە ئەو کەسە نەیتوانیوە بەرامبەرەکەی تێبگەیەنێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر هەرکام لە دوولایەنی گفتوگۆکە بە هیچ شێوەیەك سەیری چاوی ئەویتر نەکا ، لەوانەیە بە درۆزن، بێ متمانەو نائاسایی بێتە بەرچاو.

## خوێندنەوەی ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵایەتی

بۆچی دەبێ تاکەکان ئەوەندە گرنگی بە لایەنە بە ڕواڵەت کەمبایەخەکانی ڕەفتاری کۆمەڵایەتی بدەن؟ تێپەڕین بەلای ڕێبوارێکی سەرشەقامدا، یان چاك‌وچۆنیکردن لە گەڵ هاوڕێیەکدا چالاکییەکی بچوك‌و کەمبایەخن، ئێمە لە ڕۆژدا چەندین جار ئەو کارانە دووپات دەکەینەوە، بەبێ ئەوەی پێویستمان بەوە هەبێ بیریان لێبکەینەوە. لە ڕاستیدا خوێندنەوەی ئەم شێوە بەڕواڵەت بێ بایەخانەی کارلێکی کۆمەڵایەتی لە ڕوانگەی کۆمەڵناسییەوە زۆر گرنگەو نەك هەر بێ بایەخ نییە بەڵکوو بوارێکی سەرنجڕاکێشە لە توێژینەوەی کۆمەڵناسیدا. لە بەرئەم دوو هۆیە خوێندنەوەی کارلێکی کۆمەڵایەتی زۆر گرنگە.

1)کارە ئاساییەکانی ڕۆژانەی ئێمە کەکەم‌وزۆر دەمانخەنە نێو کارلێکەوە، بەشێکی گەورەی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی ئێمە پێك دێنن. ژیانی ڕۆژانەی ئێمە لە دەوری دووپاتبوونەوەی مۆدێلە هاوشێوەکانی ڕەفتاری ڕۆژانە، حەوتوانە، مانگانەو تەنانەت ساڵانەدا دەسووڕێتەوە. بۆ نموونە، بیر بکەنەوەو بزانن دوێنێ‌و پێرێ چیتان کردووە. ئەگەر ئەو دوو ڕۆژە، ڕۆژە نێونجەکانی حەوتوو بووبێتن، تارادەیەکی زۆر لەوە ئەچێ لەکاتی ئاساییدا لەخەو هەستابن (ئەمە خۆی کارێکی گرنگە). لەوانەیە سبەینێ زوو چووبێتن بۆ دەوام، ئەمە مانای ئەوەیە کە ڕێگای ماڵەوە تا قوتابخانە، یان زانکۆتان بڕیوەو تا ڕادەیەکی زۆر هەموو ڕۆژانی حەوتوو ئەو کارە ئەنجام دەدەن. لەوانەیە نانی نیوەڕۆ لەگەڵ هاوڕێکانتان بخۆن‌و دوانیوەڕۆ بۆ چوونە پۆل یان خوێندنەوە بگەڕێنەوە. پاشان دەچنە ماڵەوەو ڕەنگیشە شەو وێڕای هاوڕێکانتان بچن بۆ پیاسەکردن. ئاشکرایە کەکارە ئاساییەکانی ڕۆژانەی ئێمە یەکسان نین، کارەکانی ئێمە لە ڕۆژانی پشوی کۆتایی حەوتوودا بە گشتی جیاوازن لەو کارانەی کە لە ڕۆژانیتردا ئەنجامیان دەدەین. ئەگەر گۆڕانێکی گەورە لە ژیانی کەسێکدا بێتە پێش-وەك وازهێنان لە خوێندنی زانکۆ سەبارەت بە پەیداکردنی کار- بەگشتیی دەبێ گۆڕانی گرنگیش لە کارە ئاساییەکانی ڕۆژانەدا ڕووبدات. بەڵام بە شێوەی ئاسایی کۆمەڵە خوویەکی نوێ و تا ڕادەیەك ڕێکوپێك دروست دەبێت. کەواتە کارە ئاساییەکانی ڕۆژانەو کارلێکەکانمان کە دەبنە هۆی دروستبوونی پێوەندی لە نێوان ئێمەو خەڵکیتردا، تێکڕا فۆڕم‌و شێوەی کردارو ڕەفتارەکانمان دیاری دەکەن. ئێمە دەتوانین لەڕێگای ڕاڤەکردنی ئەو

کارانەوە زانیارییەکی زۆر لەسەر خۆمان وەك بوونەوەری کۆمەڵایەتی و لە سەر ژیانی کۆمەڵایەتی بەدەست بێنین.

2)خوێندنەوەی کارلێکی کۆمەڵایەتی لە ژیانی رۆژانەدا، یارمەتیمان دەدا تا دامەزراوەو سیستمە کۆمەڵایەتییە گەورەترەکان بناسین. لە راستیدا هەموو سیستمە کۆمەڵایەتییە گەورەکان بەستراونەتەوە بە مۆدێلەکانی کارلێکی کۆمەڵایەتییەوە کە ئێمە لە ژیانی رۆژانەی خۆماندا پەیڕەویان دەکەین. نیشاندانی ئەم بابەتە دژوار نییە. سەرلەنوێ نموونەی ئەو دووکەسە نامۆیە بێنەوە یادتان کە لە نێوبازاڕدا لە تەنیشت یەکەوە تێپەڕ دەبن. واتە، ئەمە خێراترین جۆری کارلێکی کۆمەڵایەتییە کە دەتوانین وێنای بکەین. کاتێك کە رووداوێکی لەو چەشنە بە شێوەیەکی ئەبستراك لەبەرچاو دەگرین، رەنگە پێوەندییەکی راستەوخۆی بە فۆرمە مەزن و هەمیشەییەکانی رێکخراوی کۆمەڵایەتییەوە نەبێت. بەڵام کاتێك بەشێکی زۆری ئەم کارلێکانە لەبەرچاو دەگرین، ئیتر حاڵەتەکە دەگۆڕێ. سەرنجنەدانی مەدەنی و شێوەکانیتری کارلێك کە یارمەتیمان دەدەن تا لە گەڵ کەسانیتردا پێوەندی بگرین، دەبنە هۆی پاراستنی تایبەتمەندییە بەرفراوان و گشتگیرییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەکانی ئەم سەردەمەدا. بەشی زۆری خەڵك لە شارە گەورە و بچوکەکاندا دەژین و بەردەوام لەگەڵ کەسانیتردا بەبێ هیچ ناسیاوییەکی شەخسی کارو کاردانەوەیان هەیە. سەرنجنەدانی مەدەنی، یەکێك لەو ئامرازانەیە کە خەسڵەتی تایبەتی خۆی دەگوازێتەوە بۆ نێو ژیانی شارنشینی، واتە بۆ نێو حەشیمەتی چالاك و بە پەلە و گەلێك پێوەندی تیژتێپەڕو فەرمی دیکە.

لە کۆتایی ئەم پاژەدا دەگەڕێنەوە سەر ئەم بابەتە، بەڵام سەرەتا با چاوێك بە مەغزای کارلێکی کۆمەڵایەتی لەژیانی رۆژانەدا بخشێنین و پێوەندییە ئاماژەییەکان (حاڵەتەکانی روخسارو جووڵەی جەستەیی، کە ئێمە لە کاتی کارلێکدا بەکاریان دێنین، بخەینە بەرباس و لێدوان. دوای ئەوە قسەوباسی رۆژانە تاوتوێ دەکەین- واتە بەچ شێوەیەك زمان بۆ گواستنەوەی واتاکان بەکار دەهێنین. پاشان دینە سەرباسی ئەوە کە ژیانی ئێمە لە ژێر کارتێکەری کارە ئاساییە رۆژانەکاندا چۆن دەگۆڕێ و بەتایبەت سەرنج دەدەینە چۆنیەتی هاوئاهەنگکردنی ئەو کارانەی ئەنجامیان دەدەین.

## پێوەندی ئاماژەیی

کارلێکی کۆمەڵایەتی بریتیە لە فۆرمە جۆراوجۆرەکانی پێوەندی ئاماژەیی - واتە گۆڕینەوەی واتاو زانیارییەکان لە رێگای حاڵەتەکانی روخسار، ئیشارەکردن یان جووڵەی ئەندامانی جەستەوە. هەندێجار پێوەندیئاماژەیی بە زمانی جەستەیی ناوبراوە کە ئاماژەیەکی هەڵخڵەتێنەرە، چوونکە ئێمە بۆ سڕینەوە، بەهێزکردن یان شیکردنەوەی قسەکانمان کەڵك لەم شێوازە وەردەگرین.

## هەست و روخسار

لایەنێکی دیکەی پێوەندیئاماژەیی بریتییە لە دەربڕینی هەست لە رێگای روخسارەوە. پۆل ئەکمەن و هاورێکانی بۆ نیشاندانی جووڵەی ماسوولکەکانی روخسار، کە حاڵەتی جیاواز دروست دەکەن، سیستمێکیان داهێنا بە ناوی

"سیستمی شفرەدانەری جووڵەی روخسار *Ekman & Friesen, 1978/(Facial Action Coding System FACS)*). ئەوان هەوڵیانداوە لەم رێگایەوە ئەو بوارە روون بکەنەوە کە لێکدانەوەی ناکۆکو دژبەیەکی لەسەر کراوە- چونکە رێکەوتنێکی ئەوتۆ لە سەر چۆنیەتی دیاریکردنو پۆلینکردنی هەستو سۆزەکان لە ئارادا نییە.چارلز دارڤین، باوکی تیۆری گەشەسەندن دەڵێ لە بنەڕەتدا هەموو مرۆڤێك بە یەك شێوە هەستو سۆزی خۆی دەردەبڕێ. ئەگەرچی هەندێ کەس ئەم بۆچوونەیان رەت کردۆتەوە، بەڵام وا دیارە توێژینەوەکانی ئەکمەن لە نێو ئەو گەلانەدا کە لە بەستێنی کەلتوری جیاوازدا دەژین، ئەو بۆچوونەی دارڤین دەسەلمێنن. ئەکمەنو فریزێن توێژینەوەیەکیان لە سەر گرووپێکی تەریککەوتووی گینەی نوێ ئەنجام دا کە ئەندامەکانی پێشتر هیچ چەشنە پێوەندییەکیان لە گەڵ رۆژئاوادا نەبوو.(*Ekman & Friesen, 1971*). حاڵەتە هەستییە شەش لایەنەکانی(خۆشی، خەم، تووڕەیی، بێتاقەتی، ترس، سەرسووڕمان) کە توێژینەوەکانیتر دەریانخستبوو،و لە نێو گەلێك ئەتنیکی جۆراوجۆردا ناسراون، لە نێو ئەندامانی ئەم کەلتورەشدا دەبینران.

ئەو داوەریانەی کە بە هۆی ئەندامانی گرووپی گینەی نوێوە لە سەر هەستە جۆراوجۆرەکان دەکران، هەروەك لە دیمەنەکانی حاڵەتە جۆراوجۆرەکانی روخساردا نیشان دراون، تا رادەیەکی زۆر لەگەڵ ئاکامی توێژینەوەکانیتردا هاوئاهەنگییەکی نزیکیان هەبوو. بە وتەی ئەکمەن، ئەم جۆرە ئاکامانە ئەو تیۆرییە دەسەلمێنن کە نیشاندانی هەست لە روخسارو لیکدانەوەی لە ناخی مرۆڤدا شتێکی زاتیو دەروونییە. دیارە دان بەوەشدا دەنێت کە بەڵگەکانی بە تەواوەتی ئەم مەسەلەیە ناسەلمێنن‌و رەنگە ئەزموونەکانی فێربوونی کەلتوری کە خەڵك بە شێوەیەکی بەربلاو بەشداری تێدا دەکەن، لەم کارەدا نەخشی هەبێت. هەرجۆرێ بێت ئەو ئاکامانەی کە ئەکمەن پێی گەیشتووە، بە هۆی توێژینەوە جۆراوجۆرەکانیترەوە پشتڕاست دەکرێت. ئیبیل-ئیبسفلێت(*Eibl-Eibesfeldt, 1972*) توێژینەوەیەکی لە سەر شەش منداڵ ئەنجامدا کە بە کەڕوکوێری لە دایك ببوون، ئەمەش بەو مەبەستە بوو کە بۆی دەربکەوێ حاڵەتەکانی روخساری ئەو منداڵانە لە دۆخە هەستیارەکاندا چەندە هاوشێوەی حاڵەتەکانی روخساری کەسانی ئاساییە. دەرکەوت کە ئەو منداڵانە کاتێ کە چێژیان لە کاریك وەردەگرت، پێدەکەنین، کاتێ بۆنیان بە شتێکی نامۆوە دەکرد، برۆیان هەڵدەتەکاندو هەروەختێکیش کەیفیان بە شتێك نەهاتبا، نێوچاوانیان تێك دەنا. لە بەر ئەوەی ئەوانە کەسی دیکەیان نەدیبوو کە بەم شێوەیە بجوڵێتەوە، بۆیە وادێتە بەرچاو کە ئەم کاردانەوانە دەبێ لایەنی زاتیان هەبێت.

ئەکمەن‌و فریزن بە کەڵکوەرگرتن لە "سیستمی شفرەدانەری جووڵەی روخسار" هەندی جووڵەی جیاوازیان لە روخساری ئەو منداڵانەدا بەدی کرد کە لە دەربڕینی هەستی گەورەساڵانیشدا بەرچاو دەکەون. بۆ نموونە، وادێتە بەرچاو کە منداڵان کاتێك تام بە شتێکی ترشەوە دەکەن، حاڵەتی بێزاربوون لە روخساریاندا دەردەکەوێ (واتە، لێویان کۆ دەکەنەوەو ناوچاویان تێك دەنێن)، ئەمە هاوشێوەی حاڵەتی روخساری گەورەساڵەکانیشە. بەڵام هەرچەندە وادێتە بەرچاو کە هەستدەربڕین لە رێگای روخسارەوە لایەنی زاتی هەبێت، هۆکارە

تاکەکەسیو کەلتورییەکانو بەستێنەکانی ئەنجامدانی ئەوکارەش کار دەکەنە سەر چۆنیەتی گۆڕینی حاڵەتی روخسار. بۆ نموونە لە نێو کەلتورە جۆراوجۆرەکاندا چۆنیەتی پێکەنینی خەڵك، جووڵەی وردو دەقیقی لێوەکانو هەروەها رادەی تیژتێپەڕبوونی پێکەنینەکە بە تەواوی جیاوازییان هەیە (*Birdwhistell, 1971*).

هیچ چەشنە جووڵە یان حاڵەتێکی جەستەیی سەلمێنراو لە ئارادا نییە کە تایبەتمەندی (هاوبەشی) هەموو یان تەنانەت زۆربەی کەلتورەکان بێت. بۆ نموونە، لە هەندێ کۆمەڵگەدا راست بە پێچەوانەی شێوەی باوی کۆمەڵگەی ئێمە، خەڵك ئەگەر بیانەوێ بڵێن "نا" سەریان بۆ خوارەوە دەلەقێنن. وادیارە ئەو جووڵانەی کە لای ئێمە بە زۆری بەکار دەبرێن، وەك ئاماژەکردن، لای هەندێ ئەتنیك هەر بوونیان نییە(*Bull, 1983*). ئەو ئاماژانەی کە لە کەلتورەکانیتردا بەکار دەبرێن، لە کەلتوری ئینگلیزی– ئەمریکیدا نەناسراون. "سووڕدانی گۆنا" واتە پەنجەی دۆشاومژە لە نێوەڕاستی گۆنا دادەنرێو سووڕدەدرێ، ئەم حاڵەتە لە هەندێ ناوچەی ئیتالیادا بۆ ستایشکردن بەکار دەبرێ. ئەم جووڵەیە لە بەشەکانیتری ئەوروپادا نەناسراوە.

حاڵەتەکانی روخسار، ئاماژەکانو حاڵەتەکانی جەستە هەمیشە بۆ کامڵکردنی وتە بەکار دەبرێن. هەروەها ئەو کاتانە بەکار دەبرێن کە لە جیاتی زمان، ماناکان دەگوازنەوە. ئەو خەمو نیگەرانیانەی کە ئێمە بە بێ وتە دەریاندەبڕین– بە بێ مەبەست دەیانگەیەنین– زۆرجار ئەوە نیشان دەدەن کە ئەو شتەی دەیڵێین دەقاودەق ئەو شتە نییە کە مەبەستمانە. رەنگە سوورهەڵگەڕان باشترین نموونە بێت بۆ ئەم بابەتە، زۆر تایبەتمەندی وردتریش هەن کە جێی سەرنجی خەڵکن. حاڵەتە راستەقینەکانی روخسار بە گشتی دوای چوار یان پێنج چرکە کۆتاییان دێتو ئەگەر خەندە یان سەرسووڕمان زۆر بخایەنێ، دەتوانێ نیشانەی فریودان بێت. حاڵەتەکانی روخسار، ئاماژەکردنەکان یان حاڵەتەکانی جەستە وەکوو هەریەك لە شێوەکانی قسەکردنو چالاکییەکان کە چوارچێوەی ژیانی ئێمە پێکدێنن، دەکرێ بۆ گاڵتەکردن، پێڕابواردنو شكوگومان بەکار ببرێ. بۆ نموونە زۆرخایاندنی حاڵەتی سەرسووڕمان لە روخساردا رەنگە بە ئەنقەست بۆ لاساییکردنەوەی گاڵتەجاڕانە بە کار ببرێ – بۆ ئەوەی نیشان بدرێ کە کەسێك بە هیچ شێوەیەك لە رووداوێکی تایبەت سەری سووڕنەماوە، هەرچەند دەبوایە لە بەر هەندێ هۆ تووشی سەرسوڕمان بوایە.

## روخسارو کەلتور

دەکرێ لە ئاستێکی بەرفراوانتردا، بە لە بەرچاوگرتنی رێزی تاکەکەس لە روانگەی خەڵکەوە، باس لە روخسار بکەین. لە ژیانی کۆمەڵایەتی رۆژانەدا ئێمە بەگشتی بایەخێکی زۆر بە راگرتن یان پاراستنی ئابرووی یەکتر دەدەین. ئەو شتەی کە پێی دەڵێین "ئەدەب" یان "نزاکەت" لە کۆبوونەوە گشتییەکاندا بریتین لە خۆبواردن لە باسکردنی ئەو لایەنانەی رەفتار کەرەنگە ئابڕو چوونی بەدواوە بێت. رووداوەکانی ژیانی رابردووی کەسێك (شتە تایبەتیو شەخسییەکان کە رەنگە باسکردنیان ببێتە هۆی شڵەژانی کەسێك) نە باسی لێدەکرێ نەئاماژەی پێدەکرێ. لای کەسێك کە کڵاوقژی لەسەرکردوە، بەگاڵتەوە باسی

قژڕووتانەوە ناکرێ، مەگەر لەحاڵەتێکدا کە برادەرایەتییەکە زۆر گەرم بێت ( *Goff man, 1960; p. 228*).

رەچاوکردنی چوارچێوەو ڕێساکانی رەفتار، جۆرە رێوشوێنێکی خۆپارێزییەو بەو مەبەستە بەکار دەبرێ کە عەیبو کەموکووڕییەکان لە بەرچاوی خەڵك زەق نەبێتەوە. کەواتە، ژیانی رۆژانەی ئێمە "خۆبەخۆ" ناچێتە پێش. هەمووومان بێ ئەوەی بزانین لە هەڵسوکەوت لەگەڵ کەسانیتردا بە وردی ئاگامان لە چۆنیەتی حاڵەتی روخسارمانو چۆنیەتی جووڵەی ئەندامانی جەستەمان هەیە.

هەندێ کەس لە کۆنترۆڵکردنی حاڵەتی روخسارو ڕێکخستنی شارەزایانەی کارلێك لەگەڵ خەڵکدا پسپۆڕن. بۆ نموونە، شارەزایی دیپلۆماتەکان ئەمجۆرە تایبەتمەندییانە لەخۆ دەگرێ. دیپلۆماتێکی چاك دەبێ بتوانێ — لە حاڵێکدا کە هێمنو لە سەرخۆ دێتە بەرچاو— لەگەڵ کەسانێکدا کە رەنگە بیرو رایانی قبووڵ نەبێت، یان تەنانەت رقی لێیان بێتەوە، باسوگفتوگۆ بکا. رادەی سەرکەوتن لەم کارەدا، کار دەکاتە سەر (رەوشی) هەموو نەتەوەیەك. بۆ نموونە، دیپلۆماسییەکی شارەزایانە دەتوانێ سەهۆڵی پێوەندی نێوان نەتەوەکان بتوێنێتەوەو پێش بە هەڵگیرسانی شەڕ بگرێ.

## ڕێسا کۆمەڵایەتییەکان، قسە و گفتوگۆ

ئەگەرچی زۆر ئاماژەی نازمانی هەن کە، ئێمە بە شێوەی ئاسایی لە رەفتاری خۆماندا و بۆ تێگەیشتن لە مەبەستی بەرامبەرەکانمان بە کاریان دەهێنین، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی کارلێکەکانمان بە رێگای قسەکردن یان گفتوگۆوە ئەنجام دەدرێن.

کۆمەڵناسەکان هەمیشە دانیان بەوەدا ناوە کە زمان بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی گرنگییەکی بنەڕەتیی هەیە. بەڵام بەو دوایانە روانگەیەك هاتۆتە ئاراوە کە سەرنجێکی تایبەت دەداتە بەکارهێنانی زمان لە بەستێنە ئاساییەکانی ژیانی رۆژانەدا. زۆرترین بواری بەکارهێنانی زمان یان لە راستیدا قسەکردن لە گفتوگۆ نافەرمیەکاندایە. شرۆڤەکردنی گفتوگۆ کاریگەری بەهێزی لە کارەکانی گافمەن وەرگرتووەو ئەو راستەوخۆ لە سەر ئەم بابەتە شتی نووسیوە. بەڵام بەرچاوترین کەس لەم بوارەدا، هارۆڵد گارفینکڵ، بنیادنەری ئیتنۆمیتۆدۆلۆژییە *EthnoMetodology*. *(Garfinkel, 1984)*

ئیتنۆمیتۆدلۆژی، خوێندنەوەی میتۆدە کۆمەڵایەتییەکان— میتۆدەکانی خەڵکی ئاسایی یان کۆمەڵانی خەڵك — ە. ئەم میتۆدانە لەلایەنە تاکەکانەوە بۆ دەرککردنی مەبەستی کارەکانی کەسانیترو بە تایبەت ئەو قسانەی کە دەیکەن، بەکار دەبرێ. هەموومان بێ ئەوەی ناچاربین وشیارانە میتۆدەکانی دەرککردنی مانا رەچاو بکەین، لە کارلێك لەگەڵ کەسانیتردا بەکاریان دەهێنین. ئێمە تەنیا دەتوانین لەرێگای وشیارییەوە لەو بەستێنە کۆمەڵایەتییەی کە لە خودی وشەکاندا دەرناکەوێ، لە واتاو مەغزای گفتوگۆکان تێبگەین. سەرنج بدەنە ئەم گفتوگۆیەی خوارەوە ( *Heritage, 1984, p. 237*):

ئەلف: من کوڕێکی چواردەساڵەم هەیە.

ب: باشە موشکیلە نییە.

ئەلف: سەگێکیشم هەیە.

ب: ئاخ ، بەداخم.

پێتان وایە لێرەدا باسی چی دەکرێ؟ دوو لایەنی گفتوگۆکە چی بە یەك دەڵێن؟ ئەگەر

بۆخۆمان تێبگەین، یان پێمان بڵێن کە ئەمە گفتوگۆی نێوان کرێچیو ساحیب خانووە، دەتوانین بە ئاسانی تێبگەین کە چی وتراوەو بۆچی وتراوە. ئەوکاتە ئیتر گفتوگۆکە روونو ئاشکرا دەبێت. بەڵام بە بێ ناسینی بەستێنی کۆمەڵایەتی، وەڵامەکانی "ب" هیچ پێوەندییەکیان بە قسەکانی"ئەلف"ەوە نابێ. بەشێکی ماناکە لەنێو وشەکاندایەو بەشەکەیتر دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی روونبوونەوەی بەستێنی کۆمەڵایەتی لە قسەکاندا. تەنیا لە بەستێندایە کە مانای گفتوگۆکان روونو ئاشکرا دەبێت.

## تێگەیشتنی هاوبەش

لە پرژوبڵاوترین شێوەکانی قسەکردنی رۆژانەدا، لایەنە پێوەندیدارەکان پابەندی بەکاربردنی زانیاری هاوبەشو چڕوئاڵۆزن. ئەمە لای ئێمە شتێکی ئاساییە، بەڵام تەنانەت قسەو باسە ئاساییو کەمبایەخەکانیش ئەوەندە ئاڵۆزو ناڕوونن کە تاکوو ئێستا کەس نەیتوانیوە تەنانەت بەرنامەیەکی وا لە پێشکەتووترین کۆمپیوتەرەکاندا دابنێ کە وەك ئێمە قسە بکەن. ئەو وشانە کە لە قسەکردنێکی ئاساییدا بەکار دەبرێن، مانایەکی تەواو نادەن بەدەستەوەو ئەو شتەی کە مەبەستمانە بیڵێین یان تێگەیشتنمان لەو شتەی کە دەوترێ، لە رێگای گریمانە دەرنەبڕاوەکانەوە دیاری دەکەینو تەیید دەکرێ. ئەگەر کەسێك لە کەسێکیتر بپرسێ: دوێنێ چیت کرد؟ بە پێی خودی وشەکانی نێو رستەکە وەڵامێکی روونی پێ نادرێتەوە. رۆژێك زەمەنێکی درێژە، دەکرێ وەڵامێکی ژیرانەی پێ بدرێتەوە: کاتژمێر حەوتو شانزە خولەك لە خەو هەستام، کاتژمێر حەوتو هەژدە خولەك لە قەرەوێڵەکەم هاتمەدەر، چوومە حەمامو دەموددانم شۆرد. کاتژمێر (7:19) دووشی حەمامەکەم کردەوەو هتد. ئێمە بە پێی ئەوەی کە خاوەن پرسیارەکە رووی دەمی لە کێیە، یان ئێمە بە گشتی چ جۆرە چالاکییەك پێکەوە ئەنجام دەدەین، ئەو کەسە بە گشتی لە رۆژێکی تایبەتی حەوتوودا چی دەکاو، زۆر شتی دیکە، دەتوانین لەو جۆرە وەڵامە تێبگەین کە پرسیارەکە داوای دەکا.

## تاقیکردنەوەکانی گارفینکڵ

گارفینکڵ لە رێگای چەند تاقیکردنەوەیەکەوە بە هاوکاری خوێندکارە خۆبەخشەکانی، گرنگبوونی "چاوەڕوانییەکانی پاشخان"ی سەلماند (*background expectancies*) کە ئێمە گفتوگۆکانمان لە سەر ئەو بنەمایە رێك دەخەین. ئەو داوای لە خوێندکارەکانی کرد لەگەڵ هاوڕێ یان خزمێکیاندا بکەونە قسەکردنو هەوڵبدەن مانای ئەوشتانەی کە دەوترێ روون بکرێتەوە. دەبوا هەر ئاماژەیەکی کتووپڕ یان بیروبۆچوونێکی گشتی فەرامۆش نەکرێ، بەڵکوو بە جددی هەوڵ بدرێ ماناکەی روون بکرێتەوە. ئەگەر کەسێك بیوتایە"رۆژتان باش" دەبوا لە وەڵامدا بوترایە، باش یانی چۆن؟ مەبەستت لە چ بەشێکی رۆژە؟و هتد. ئەمەی خوارەوە نموونەیەکە لەو جۆرە قسانە:

(س دەستێکی بە خۆشحاڵییەوە راوەشاند.)

س: چۆنی؟

ی: لە چ روویەکەوە چۆنم؟ لە رووی تەندروستییەوە، لە رووی داراییەوە، لە رووی خوێندنەوە، ئاسوودەیی دەروونیو...

س: (سوور هەڵدەگەڕێو لە پڕێکدا هەڵدەچێ.) گوێ بگرە، من تەنیا دەمویست رێزت لێ

بگرم، دەنا راستت دەوێ، ئەوەی کە تۆ چۆنی، تۆزقاڵێك لای من بایەخی نییە. ( *Garfikel, 1963, p. 222*)

هۆی چییە کە کاتێ لە قسەکردندا رێسا باوو بەرواڵەت کەمبایەخەکان رەچاو ناکرێن، خەڵك تا ئەو رادەیە هەڵدەچن‌و تووڕە دەبن؟ لە وەڵامدا دەبێ بڵێین کە سەقامگیربوون‌و ماناداربوونی ژیانی کۆمەڵایەتی رۆژانەمان بەندە بەوەی کە ئێمە تا چ رادەیەك لەو گریمانە کەلتورییە دەرنەبڕاوانەدا دەربارەی ئەوەی کە چی دەوترێ یان بۆچی دەوترێ، بەشدارین. ئەگەر ئێمە ئەو شتانەمان بە پێویست نەزانیبایە، پێوەندییەکی مانادار دروست نەدەبوو. هەر چەشنە پرسیار یان بەشداریکردن لە گفتوگۆدا دەبوا بە رێگەی میتۆدی گەڕان(*Search procedure*)ی تێروتەسەل وەك ئەو شتەی کە بە قوتابییەکانی گارفینکڵ وترابوو تا لە وەڵامی قسە ئاساییەکانی رۆژانەدا بەکاری بێنن، درێژەی پێدەدراو ئەمەش دەبووە هۆی شکستهێنانی کارلێك. کەواتە ئەو شتەی سەرەتا وەك رێساو رێوشوێنێکی بێ بایەخ لە قسەکردندا سەیر دەکرێ، لە راستیدا لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا گرنگییەکی بنەڕەتی هەیەو هەر لە بەر ئەمەشە کە پێشێلکردنیان تا ئەو رادەیە جددیە.

پێویستە سەرنج بدەین کە لە ژیانی رۆژانەدا، هەندێ کەس بە ئەنقەست نایانەوێ لە رستەیەك یان بیروبۆچوون‌و پرسیارێك تێبگەن. رەنگە ئەم کارە زیاتر بۆ بەزاندنی بەرامبەر، گاڵتەپێکردن، شەرمەزارکردن یان سەرنجراکێشان بۆ مانای دووانەی وتەکە ئەنجام بدرێ. بۆ نموونە سەرنج بدەنە ئەم دیالۆگە کلاسیکییەی نێوان باوك‌و کوڕە گەنجەکەی:

پ– بۆ کوێ دەچی؟

و– دەرەوە

پ– چی ئەکەی؟

و– هیچ.

وەڵامی ئەم گەنجە لە راستیدا بە پێچەوانەی ئەو وەڵامانەوەیە کەلە تاقیکردنەوەکانی گارفینکڵدا دراونەتەوە. گەنجەکە لە باتی ئەوەی لە واتای وشەکان بگەڕێ، خۆی لە دانەوەی وەڵامێکی گونجاو دەپارێزێ – واتە لە راستیدا دەڵێ، کارتان پێم نەبێ. لەوانەیە ئەگەر پرسیاری یەکەم لە بوارێکیتردا رووبەرووی کەسێکی دیکە بکرێتەوە، وەڵامێکی تەواو جیاواز بداتەوە. واتە:

ئەلف– بۆ کوێ دەچی؟

ب– خەریکم بە هێواشی دەسووڕێمەوە. ( *I am going quietly round the bend*) (ئەم رستە مانایەکی دیکەش دەدا. واتە، خەریکە وردەوردە تووڕە دەبم.)

(ب) بە ئەنقەست پرسیارەکەی (ئەلف) بە جۆرێکیتر لێکدەداتەوە. بۆ ئەوەی بە تەوسەوە نیگەرانی یان ناکامبوونەکەی بگوازێتەوە بۆ بەرامبەرەکەی. کۆمیدیا لە سەر بنەمای ئەم چەشنە خۆگێلکردنانە برەوی پەیدا کردووە. مادام لایەنەکانی نێو گفتوگۆکە دەزانن مەبەست گاڵتەکردنە، ئیتر ئەم خراپ تێگەیشتنانە مەترسییەك ناخولقێنێ.

## شێوەکانی قسەکردن

بیستنی کاسێتێکی تۆمارکراو یان خوێندنەوەی دەقی گفتوگۆیەك کە خودی کەسەکە تێیدا بەشدارە، ئەزموونێکی وشیارکەرەوەیە. گفتوگۆکان لەوە پچڕپچڕترو گوماناویترو ناڕێزمانیترن کە خەڵك بیری لێ دەکەنەوە. کاتێ ئێمە

بەشداری دیالۆگی رۆژانە دەبین بە گشتی وائەزانین ئەوەی دەوترێ رستەیەکی رازاوەیە. چونکە ئێمە بێ ئەوەی بزانین ئەو بەستێنە پڕ دەکەینەوە کە وشە راستەقینەکانی تێدا ئالۆگۆڕ دەکرێ. بەڵام گفتوگۆیەکی راستەقینە، بە هیچ شێوەیەك لە گفتوگۆیەکی خەیاڵی نێو داستانەکان ناچێ کە کاراکتێرەکان تێدا رستەی دروستو رێزمانی بەکار دێنن. چاو لەم گفتوگۆیەی خوارەوە بکەن کە نوێنگەی زۆربەی گفتوگۆکانی رۆژانەیە( *Heritage, 1984, p.236*).

ی– ئازیزەکەم خواردنەکە زۆربەتام بوو، دەبوا (زووتر بهاتبام بۆ دیتنت، بەڵام من): چێژی زۆرم بینی. بەراستی(بەتام)بوو.

م– ئۆی....

م– خۆشحاڵ بوو(م کە تۆ ) هاتی.

ی– (و هاوڕێکا)نت چەندە باشن.

م– ئۆی(ئەمە)بە راستی جوان(نییە؟)

ی– (و هاورێکەت پەت) بەڵێ (جوان) نییە. (0)

ی– ئۆی: کچێکی نازدارە

م– بەڵێ، پێم وایە کچێکی جوانە.

کلیل

( ) قسەکەرێك هاوکات لەگەڵ یەکێکیتردا قسە دەکا.

( )– ئەم نیشانەیە، قورسایی لە سەر رستەیەك، وشەیەك یان دەستەواژەیەك نیشان دەدا، وەك گۆڕان لە بەرزیو نزمی دەنگەکەدا.

=، ئەم نیشانەیە، دەریدەخا کە قسەکردنەکە بە بێ پچڕان درێژەی هەیە. ئەگەرچی کەسێك لە شوێنێکدا کە بەرامبەرەکە دەوەستێ، درێژە بە قسەکردن دەدا.

:،– ئەم نیشانەیە، وەستانێکی بچوك نیشان دەدا، ئاهەنگی قسەکردنەکە یان قورساییەکەی لە نێو وشەیەکدا دەردەخا.

( )، ئەم نیشانەیە، مەودای تا رادەیەك درێژتر لە مەودای ئاسایی نێوان رستەیەك نیشان دەدا.

هیچکام لە لایەنەکانی گفتوگۆکە رستەکە تەواو ناکا. هەریەکەو قسە بەویدی دەبڕێ، دەپەڕێتە نێو قسەکانی، یان لە نیوەدا رستەکە بە ناتەواوی بە جێ دێڵێ.

رەنگە بە هەمان شێوە کە بیر لە کارەکانی گافمەن لە مەڕ سەرنجنەدانی مەدەنی دەکەین، لێرەشدا بە ئاسانی دەتوانین وا دابنێین کە شیکردنەوەی گفتوگۆ ئاساییەکان تا رادەیەك لە چاو مەسەلە سەرەکییەکانی کۆمەڵناسیدا لایەنێکی لاوەکیی هەیە. لە راستیدا بەشێکی بەرچاو لە کۆمەڵناسان راست لە بەر ئەم هۆیە بە توندی رەخنەیان لە توێژینەوەکانی ئێتنۆمیتۆدۆلۆژی گرتووە. سەرەڕای ئەوە، هەندێ لەو بەڵگاندنانەی کە لە کۆمەڵناسیدا بۆ سەلماندنی هۆی گرنگبوونی کارەکانی گافمەن ئەنجام دەدرێ، لە پێوەندی لەگەڵ ئێتنۆمێتۆدۆلۆژیاشدا راست دەردەچێ. ئەو توێژینەوانەی کە لە سەر گفتوگۆی رۆژانە کراون، نیشان دەدەن کە زاڵبوون بە سەر زمانی خەڵکی ئاساییدا تا چ رادەیەك سەختودژوارە. بوونی ئەو دژوارییە گەورانەی کە لە دانانی بەرنامە کۆمپیوتەرییەکاندا دێنە پێش، بۆ کارکردن بەو زمانەی کە مرۆڤ بە ئاسانی قسەی پێدەکا، بە باشی ئاستی ئەو دژوارییە دەردەخا. لە گەڵ ئەوەدا قسەکردن، بەشێکی زۆر پێویستی ژیانی کۆمەلایەتییە. ئەو کاسێتانەی کە پێوەندییان بە نەخشی سەرۆك نیکسۆنو هاوکارەکانی لە کێشەی

(واتێرگێت)دا هەبوو، جگە لە دەقی گفتوگۆیەك، هیچیتر نەبوون. بەڵام بە بەشێك لە بەکارهێنانی دەسەڵاتی سیاسی لە بەرزترین ئاستەکاندا لە قەڵەم دەدران (*Molotch & Boden, 1985*).

## هەڵەکانی جەستەو زمان

### هاواری پەرچەکردارانە

هەندێ جۆری دەربڕین هەن کە ناچنە خانەی قسەکردنەوە، بەڵکوو بریتین لە هاوارێکی جواوو ناڕوون، یان وەك گافمەن ناوی لێناوە هاوارێکی پەرچەکردارانە (*Goff man, 1981*). گریمان کەسێك دوای ئەوەی خۆی لە شتێك دەکوتێ یان شتێك دەخا، بڵێ "ئاخ". لەوە ئەچێ ئاخ، تەنیا کاردانەوەیەکی خۆبەخۆیی بێت لە ئاست ڕووداوێکی ناخۆشدا، دەکرێ بڵێین وەك ئەوەی یەکێك لە بەرانبەر حەرەکەتی خێرای دەستی یەکێکیتردا چاوی دەترووکێنێ. بەڵام ئەمە بە هیچ شێوەیەك کاردانەوەیەکی غەیری ئیرادی نییەو، دەکرێ شیکردنەوەیەکی وردی بۆ بکرێ بۆ ئەوەی کە تایبەتمەندییە گشتییەکانی کاردانەوەکانی ئێمە وەك مرۆڤ نیشان بدات. ئەگەر دەڵێین وتنی ئاخ، کاردانەوەیەکی غەیری ئیرادی نییە لە ئاست ڕووداوێکی ناخۆشدا، لە بەر ئەوەیە کە مرۆڤ کاتێك تەنیا دەبێ، ئەم هاوارە ناکا. ئاخ، بەگشتی سەرنجی کەسانی دەوروبەر ڕادەکێشێ. ئەم هاوارە بە شایەتحاڵەکان دەڵێ کە ئەم هەڵەیە تەنیا شتێکی لاوەکی و کاتییەو شتێك نییە کە گومان لە سەر ڕەفتاری دروست بکا. ئاخ، تەنیا لە دوخێکدا دەوترێ کە ناکامییەکە کاتی بێت و پێوەندی بە کارەساتی گەورەوە نییە. ئەم هاوارە هەروەها نیشان دەدا کە ئێمە خەریکین هەوڵدەدەین بە سەر لایەنە لاوەکییەکانی ژیانماندا زاڵ بین.

لەلایەکیترەوە، ڕەنگە ئەم هاوارکردنە لە لایەن کەسێکەوە بکرێ کە شایەتحاڵی هەڵەکەیە، نەك خودی ئەو کەسەی کە هەڵەکەی ئەنجام داوە. ڕەنگە ئاخ، بۆ وریاکردنەوەی کەسێکیتر بوترێ و هەر لەوکاتەشدا دڵنیاکردنەوەی هەڵەکارەکەیە بۆ ئەوەی بزانێت وەك کەسێکی نالایەق چاو لێ ناکرێ. ئاخ، بە گشتی هاوارێکی نزمە، بەڵام هەندێجار ڕەنگە مۆرفیمی (ئا) درێژ بکرێتەوە. بەمجۆرە ڕەنگە کەسێك کە ئەم مۆرفیمە درێژ دەکاتەوە، بیەوێ ساتە قەیراناوییەکەی هەڵەکردنەکە بشارێتەوە. یان ڕەنگە دایك و باوك کاتێ بە پێکەنین و خۆشییەوە منداڵەکەیان هەڵدەپەڕینن، ئاخێکی درێژ بکێشن. ئەم دەنگە، ئەو ساتە کورتە پڕ دەکاتەوە کە ڕەنگە منداڵ تێیدا هەست بکا توانای خۆگرتنەوەی لەدەست داوەو بەم شێوەیە دڵنیای دەکاتەوەو ڕەنگە هەر لەو کاتەشدا بە تەواوی لە واتای هاواری پەرچەکردارانە تێبگا.

ڕەنگە هەموو ئەم شتانە بە دروستکراوو زێدەڕۆیانە بێتە بەرچاو. بۆ ئەبێ خۆمان بەشیکردنەوەی دەربڕینێکی ئاوا بێ بایەخەوە ماندوو بکەین؟ بێگومان هەروەك ئەم نموونە دەریدەخا، ئێمە سەرنج نادەینە هەموو ئەو شتانەی کە دەیڵێین و ئەنجامیان دەدەین. دیارە بە ئاگاییەوە ئەو کارە ناکەین. بەڵام خاڵی گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە ئێمە چاودێریکردنی زۆر وردو بەردەوامی ڕواڵەت و کاردانەوەکانی خۆمان و کەسانیتر بە شتێکی ئاسایی دەزانین. لە حاڵەتەکانی کارلێکدا تەنیا بوونی ئێمە بەس نییە، خەڵك چاوەڕوانیان هەیەو ئێمەش چاوەڕوانیمان لە خەڵك هەیە کە

گافمەن گوتەنی" وشیارییەکی کونترۆڵکراو" (*controlled alertness*) لەخۆ نیشان بدەین. لایەنێکی بنەڕەتی "مرۆڤبوون" ئەوەیە کە هەمیشە لە جەرگەی ژیانی رۆژانەدا بە خەڵکیتر بسەلمێنین کە ئێمە کەسێکی شیاو و بە توانایین.

## هەڵەکانی زمان

"ئاخ"، کاردانەوەیەکە لە ئاست هەڵەیەکی لاوەکی جەستەدا. سەرباری ئەوە هەمومان لە گفتوگۆ، وتاردان، قسەکردنو باقی دۆخەکانیتردا تووشی هەڵە دەبین. فرۆید لەو توێژینەوانەی کە لە سەر "خەسارناسی دەروونی ژیانی رۆژانە" ئەنجامی داوە، چەندین نموونەی جۆراوجۆری لەم هەڵەکردنانە شیکردۆتەوە (*Freud, 1975*). لە روانگەی فرۆیدەوە، لە راستیدا هیچ هەڵەیەك لە قسەکردندا، واتە هەڵەی زمانی یان بەکارهێنانی نابەجێی وشەکان، تربوون یان زمانگرتن لە خۆڕاو بە هەڵکەوت نییە. هەموو ئەمانە هێمان بۆ پارادۆکسە دەروونییەکانو پێوەندییان بە شێوەکانی کارتێکردنی ناوشیاریمان بە سەر ئەو شتەوە هەیە کە وشیارانە دەیڵێینو ئەنجامی دەدەین. هەڵەکانی زمان بە شێوەی ناوشیارانە بە هۆی هاندەر یان هەستەکانمانەوە هەڵدەخرێن کە ئێمە لە ئاستی ناوشیاریماندا هەستی پێدەکەین، بەڵام لە زەینی وشیارماندا پاشەکشەیان پێدەکرێ یان هەوڵدەدەین بەئاگاییەوە، بەڵام بێ سەرکەوتن سەرکوتیان بکەین. ئەم شتانە زۆرجار پێوەندییە سێکسییەکان لە خۆ دەگرن. بەم شێوەیە رەنگە کەسێك بیەوێ بڵێ *Organism* بەڵام دەڵێ *Orgasm*، یان وەك ئەو نموونەی کە فرۆید باسی دەکا: لە ژنێك دەپرسن "کوڕەکەت لە چ لیوایەکدا خزمەت دەکا؟" ئەو لە وەڵامدا دەڵێ " لە لیوای چلو دووی پیاوکوژاندا". (لە زمانی ئەڵمانیدا وشەی *Morder* (پیاوکوژ) لە باتی وشەی *Morser* (هاوەن هاوێژ) هاتووە کە ئەو ژنە ویستوویە وا بڵێ.).

هەڵە زمانییەکان، هەروەك باقی ئەو تێگەیشتنە ناڕاستانەی کە لە قسەو کردەوەوە دروست دەبن، دەتوانن گاڵتەجاڕ بن. جیاوازییەکە لەوایە کە ئاخۆ قسەکەرەکە بە ئەنقەست ویستوویەتی وشەکان بەو شێوەیە ریز بکا یان نا. هەڵە زمانییەکان لە شێوەکانی دیکەی وتەی "نابەجێ"دا روو دەدەن کە فرۆید پێی وایە کە زۆرجار لە نەزانینەوە دەوترێن- وەك کاتێ کە کەسێك ئاگای لەوە نییە کە ئەو قسەیەی کە دەیکا دوو مانای روونی هەیە. ئەمجۆرە قسەکردنانەش ئەگەر بە ئەنقەست کرابن، دەکرێ وەك گاڵتە چاو لێبکرێن- بەڵام بەپێچەوانەوە، هەڵەکردن بەوە دەزانرێ کە تاك ئاگای لە شێوەی قسەکردنی خۆی نییەو ئێمە چاوەڕوانین خەڵك هەمیشە ئاگایان لە شێوەی قسەکردنی خۆیان بێت.

یەکێك لە رێگاکانی روونکردنەوەی ئەم مەسەلانە ئەوەیە کە چاوێك لەو هەڵە (تۆپۆق)انە بکەین کە بێژەری رادیوو تەلەفزیونەکان دەیکەن. وتاری بێژەرەکان، وەك قسەکردنی ئاسایی نییە، چوونکە قسەی زارەکی نییە بەڵکو نووسراوەیە. لە گەڵ ئەوەشدا چاوەڕوان دەکرێ کە لە قسەی ئاسایی کامڵتر واتە، جددیترو زولاڵترو رەوانتر بێت. لە بەرئەوە، کاتێ بێژەرەکان، بۆ نموونە بێژەری هەواڵەکان، لە خوێندنەوەدا تووشی هەڵە دەبن یان تۆپۆق لێدەدەن، هەڵەکان زۆر زەقترو بەرچاوترن تا ئەو هەڵانەی کە لە گفتوگۆیەکی کتوپڕدا روو دەدەن. بەوحاڵەش روونو ئاشکرایە

که بێژەرەکان هەندێ هەڵە دەکەن کە پێکەنیناوین، یان وەك فرۆید باسی کردووە، حەقیقەتێکی لە رادەبەدەریان تێدایە. لێرەدا چەند نموویەك لەو هەڵانە دێنینەوە (*Goff man, 1981*).

لە کۆتایی بەرنامەی تەلەفزیونی کلێسەی ئاسماندا، رێگام بدەن وەبیر هەموو گوێگرانمان بێنینەوە کە زەمەن هەموو دەرمانەکان دەرد دەکا.............

زەردەی هێلکەکە بشێوێنن‌و پاشان شیری پێ زیاد بکەن‌و دوای ئەوە کەمکەم ئاردی بێژراوی تێبکەن‌و تێکی وەربدەن. هەروا کە خەریکن پەساکە تێك وەردەدەن، دەبینن کە پەساکە چۆن چفت (سفت) دەبێت.

نموونەی دیکە دەچنە خانەی مەقوولەی "وتەی نابەجێ"وە واتە (*inappropriate speech*) کە لێرەدا مانای دووانی دەگەیەنن:

ئەو خانمانەی کە حەز بکەن بە ئۆتۆمبیل بێن‌و جلەکانیان دابکەنن، بی ماتڵبوون کاریان جێبەجێ دەبێ.

قەرەوێڵە ئاسودەکانی ئێمە تاقی بکەنەوە. من وەك خۆم لە پشت هەر قەرەوێڵەیەکەوە کە دەیفرۆشین وەستاوم. لێرە، لە هۆلیوود، دەنگۆیە کە ئەستێرە گەنجەکەی پێشووی سینەما لە ماوەی یەك مانگدا چاوەڕێی پێنجەمین منداڵی خۆی دەکا.

بە گشتی ئێمە بەو هەڵە زارەکیانەی کە بێژەری رادیوو تەلەفزیونەکان (یان مامۆستاکان) دەیکەن زیاتر پێدەکەنین تا بەو هەڵانەی کە لە قسەو باسی ئاساییدا روودەدەن. ئێمە وائەزانین کە بێژەرەکانی رادیوو مامۆستاکان لە قسەکردنی بێ هەڵەدا پسپۆڕن. گاڵتەجاڕبوونەکە تەنیا بۆ خودی هەڵەکردنەکە ناگەڕێتەوە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ پەشۆکانی بێژەر لە کاتی بەڕێوەبردنی بەرنامەکەدا. لەم حاڵەتانەدا، ئێمە بە گشتی ئەو "مرۆڤە ئاسایی"ە دەبینین کە لە پشت دەمامکی پسپۆڕ بوونی جددیەوە خۆی حەشارداوە.

## روخسار، جەستەو وتە لە کارلێکدا

ئێمە لێرەدا تەواوی ئەو شتانەی کە تاکو ئێستا باسمان کردووە، چڕ دەکەینەوە. کارلێك بەستراوەتەوە بە پێوەندییە وردو ئاڵۆزەکانی نێوان ئەو شتەی لە رێگای روخسارو جەستەوەو ئەو شتەی کە بە رێگای وشەکانەوە دەریان دەبڕین. ئێمە کەڵك لە حاڵەتەکانی روخسارو ئاماژە جەستەییەکانی کەسانیتر وەردەگرین تا بتوانین باشتر لەو مەبەستە تێبگەین کە ئەوان بە روونی دەریدەبڕن‌و هەروەها لە رادەی راستگۆییان دڵنیا بین. زۆربەمان بێ ئەوەی بزانین لە پێوەندییەکانمان لەگەڵ کەسانیتردا بە شێوەیەکی وردو بەردەوام حاڵەتەکانی روخسار، دۆخ‌و ئاماژە جەستەییەکان دەخەینە ژێر چاودێرییەوە.

بەڵام، هەندێجار تووشی هەڵەی زمانی وادەبین کە هەروەك لە نموونەی"پیاوکوژان"ی فرۆیددا دەردەکەوێ، بە کورتی دەریدەخا کە ئێمە —چ بە ئەنقەست یان بێ مەبەست— ئەمانەوێ چ شتگەلێك بشارینەوە. زۆرێك لە هەڵە زمانییەکان حەقیقەتێکی رەهایان تێدایە — وەك لە نموونەی دروستکردنی پەسای کێکدا هاتوە، کە پێدەچی بێژەرەکە پێیوابێت پەساکە باش نییە: بێ ئەوەی بمانەوێ، هەڵە زمانییەکان هەستە راستەقینەکانی ئێمە دەردەخەن.

کەواتە روخسارو ئاماژەی جەستەیی‌و وتە بۆ گەیاندنی هەندێ واتاو شاردنەوەی هەندێ واتای

دیکە بەکار دەبرێن. هەروەها ئێمە چالاکییەکانی خۆمان لە بەستێنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا ڕێکدەخەین بۆ ئەوەی – کە ئێستا دەمانەوێ نیشانی بدەین – بە هەمان ئەو ئامانجانە بگەین.

## ڕووبەڕووبوونەوەکان

هەڵسوکەوتی ئێمە لە نێو کۆمەڵدا زۆرجار بە شێوەیەکە کە گافمەن پێی دەڵێ کارلێکی چەقنە بەستوو(*Unfocused Interaction*) . ئەمجۆرە ڕەفتارە کاتێکە کە ئینسانەکان لە شوێنێکی دیاریکراودا نیشان دەدەن کە ئاگایان لە بوونی یەکتر هەیە. بە گشتی لەو شوێنانەدا کە خەڵکێکی زۆر لە دەوری یەك کۆ دەبنەوە، بۆ نموونە لە شەقامێکی قەرەباڵغدا، لە نێو کۆمەڵێك تەماشاچی شانۆ یان لە میوانییەکدا شتی وا روو دەدا. کاتێ کەسەکان پێکەوەن، هەرچەند ڕاستەوخۆ پێکەوە نەدوێن، بەردەوام بە ئاماژەکردن یەکتر تێدەگەیەنن. ئەوان لە ڕێگای ئاماژەی جۆراوجۆرەوە کار دەکەنە سەر بەرامبەرەکەیان.

کارلێکی چەقبەستوو *(Focused Interaction)* کاتێ ڕوودەدا کە کەسەکان ڕاستەوخۆ سەرنج دەدەنە ئەو شتەی کە بەرامبەرەکەیان ئەنجامی دەدا یان دەیڵێ. جگە لەو کاتانەی کە کەسەکە بە تەنیا وەستابێ. بۆ نموونە، لە میوانییەکدا کاتێ کە میوانەکان پێکەوەن، هەموو کارلێکەکان هەم پێوەندییەکی چەقبەستوو دەگرێتەوەو هەم چەقنەبەستوو. گافمەن پێوەندی بە پێوەری کارلێك دەزانێ و بەشێکی گەورەی ژیانی ڕۆژانەی ئێمە بریتییە لە پێوەندییەکی بەردەوام لەگەڵ کەسانیتر– بنەماڵە، هاوڕێکان، هاوکارەکان – کە لە بواری کارلێکی چەقنەبەستوودا لەگەڵ کەسانیتر ڕوو دەدا کە ئامادەییان هەیە. گفتوگۆیەکی کورت، دانوستانە فەرمییەکان، یارییەکان و پێوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ باجەی فرۆشتنی بیتاقەدا، قسەکردن لەگەڵ کارمەندو خزمەتکارانی فرۆشگەکانداو هتد) تێکڕا نموونەی ئەو پێوەندییانەن.

پێوەندییەکان هەمیشە پێویستیان بە سەرەتایەك هەیە کە نیشانەری وەلانانی سەرنجنەدانی مەدەنییە. لە شوێنێکدا کە ناموکان بە یەك دەگەن و دەستدەکەن بە قسەکردن – بۆ نموونە، لە میوانییەکدا – ئەو کاتەی واز لە سەرنجنەدانی مەدەنی دەهێنرێت، هەمیشە مەترسی خولقێنە، چونکە بە ئاسانی ڕێی تێدەچێ کە لایەنەکان بەخراپ لەیەك تێبگەن. ( *Goff man, 1971, pp. 214-21*). لە بەر ئەوە ڕەنگە چاولێکردنەکان لە هەموو شتێك زیاتر ناڕوون و تیژتێپەڕ بن. کەواتە ئەگەر ئەم سەرەتایە گوێی پێنەدرێ، ڕەنگە کەسەکە وا ڕەفتار بکا کە هیچ مەبەستێکی ڕاستەوخۆی نەبووە. لە کارلێکی چەقبەستوودا هەر کەسێك چەندە لە ڕێگای زمانەوە مەبەستەکانی دەگەیەنێ بە هەمان ڕادەش لە ڕێگای ئاماژەکردنی جەستەیی و حاڵەتەکانی ڕوخسارەوە پێوەندی دروست دەکا. گافمەن لەم بارەوە لە نێوان جۆری تێگەیشتنی بەرامبەرو ئەو شتەی کە کەسەکە دەریدەبڕێ، جیاوازی دادەنێ. لە حاڵەتی یەکەمدا، خەڵك تێئەکۆشن لە ڕێگای وشەکان و حاڵەتەکانی ڕوخسارەوە کار بکەنە سەر بەرامبەرەکەیان. حاڵەتی دووەم، پێوەندی بەو سەرەداوانەوە هەیە کە ڕەنگە بۆ تاقیکردنەوەی ڕادەی برادەرایەتی و ڕاستگۆیی کەسێك بەکار بهێنرێن. بۆ نموونە، خاوەنی ڕستووڕانتێك بە ئەدەب و زەردە خەنەوە گوێ لە ڕەزامەندی موشتەرییەکانی دەگرێ. هەر

لەو کاتەشدا ئەو گرنگی بەوە دەدا کە ئەو کەسانەی لەوێ نانیان خواردووە، تا چ رادەیەك رەزامەندییان نیشان داوە، ئاخۆ خواردنەکە زۆری لێ ماوەتەوە،و راوێژی قسەکردنیان لە کاتی دەربڕینی رەزامەندییەکەدا چۆن بووە.

## بەستێنەکان و بارودۆخەکان

ژیانی کۆمەڵایەتی رۆژانە خۆی لە زنجیرە پێوەندییەك لەگەڵ کەسانیتردا نیشان دەدا کە لە بەستێن‌و بارودۆخی جیاوازدا ئەنجام دەدرێ. زۆربەمان بە درێژایی رۆژە ئاساییەکانی ژیانمان لەگەڵ خەڵکی جۆراوجۆردا قسەو هەڵسوکەوت دەکەین. ژنێك لە خەو هەڵدەستێ، لەگەڵ بنەماڵەکەیدا قاوەڵتوون دەکا،و رەنگە منداڵەکانی ببا بۆ قوتابخانە،و لە بەر دەرکەی قوتابخانە کەمی ماتڵ دەبێ تا لەگەڵ ئاشنایەکدا چاك‌وچۆنی بکا. ئەو بە ئۆتۆمبیلەکەی دەچێ بۆ شوێنی کارەکەی،و رەنگە گوێ لە رادیۆش بگرێ. بە درێژایی ئەو رۆژەکارییە لەگەڵ هاوکارەکانی‌و خەڵکی هاتوودا دەکەوێتە کۆمەڵی پێوەندییەوە کە لە گفتوگۆی کورت هەتا دیداری فەرمی لە خۆ دەگرێ. ئەم کونتاکتانە لەوانەیە بە نیشانە دانەرەکان (*markers*) یان ئەو شتەی کە گافمەن ناوی لێناوە (*brackets*) لەیەکتر جیا بکرێنەوە کە هەر کردارێکی دوولایەنەی چەقبەستوو لە رووداوی پێش خۆی‌و لە کارلێکی چەقنەبەستوو کە لە بەستێندا بەردەوامە، جیا دەکەنەوە (*Goff man, 1974*).

لە میوانییەکدا یان لە شوێنێکدا کە میوانەکان لە یەکەوە نزیك بن یان لە تەنیشتی یەکەوە وەستابێتن، ئەوانەی کە پێکەوە قسە دەکەن، بە گشتی جۆری دانیشتنەکەیان‌و ئاستی دەنگی خۆیان بە جۆرێك دیاری دەکەن کە کۆڕێکی جیا لەوانیتر پێك بێنن. بۆ نموونە ئەوانە رەنگە روو بەرووی یەك راوەستن تا رێگە لەوە بگرن کەسانی نەخوازراو بێنە ناو کۆڕەکەیانەوە، مەگەر ئەوەی کە خۆیان بڵاوەی لێ بکەن، یان بەدەم پیاسەوە ئەم سەرو ئەو سەری ژوورەکە بکەن‌و مەوداکەیان تەنگتر بکەنەوە. لە کۆبوونەوەی فەرمیدا، لە هەندێ هێمای ئاگادارکردنەوە بۆ دیاریکردنی دەسپێکردن‌و کۆتاییهێنان بە کۆبوونەوەیەکی تایبەت یان قۆناغێك لە کارلێك کەڵك وەردەگرن. بۆ نموونە، بۆ ئاگادارکردنەوەی دەسپێکردنی شانۆییەك، جەڕەسێك لێ دەدرێ، گڵۆپەکان ئەگۆڕێنرێنەوەو پەردە لادەدرێ. دوای کۆتایی هاتنی شانۆییەکە سەر لە نوێ گڵۆپەکان پێدەکرێنەوەو پەردە دادەدرێتەوە.

هێماکان بە تایبەت ئەو کاتانە گرنگ دەبن کە یان رووداوێکی نائاسایی روو دەدا یان گومانێك لە سەر دروستبوونی رووداوێك دێتە پێش. کاتێ کە کەسێك بە رووت‌و قووتی لە بەرانبەر پۆلێکی هونەریدا رادەوەستێ، بەگشتی لە بەرچاوی گرووپەکەدا خۆی رووت ناکاتەوە، یان لە کۆتاییدا بە بەرچاوی ئەوانەوە جلەکانی لەبەر ناکاتەوە. داکەندن‌و لەبەرکردنەوەی جلوبەرگ لە تەنیاییدا وا دەکا کە لەش لە کتوپڕێکدا دەربکەوێ‌و داپۆشرێتەوە. ئەم کارە هەم لەلایەك سنوورەکانی رووداو دیاریدەکا،هەم ئەوە دەگەیەنێت کەئەم رووداوە هیچ واتایەکی سێکسی لە خۆناگرێ،ئەگەرنا رەنگبوو ئەو واتایەی بگەیاندایە.

لە شوێنە تەسك‌و تەنگەبەرەکاندا، وەك ئاسانسۆر (مصعد)ەکان، هێمادانان‌و جیاکردنەوەی

بەشێکی کارلێك یان زۆر زەحمەتە یان هەر ناکرێ. ئەو کەسانەیش کە لەوێ ئامادەییان هەیە، وەك شوێنەکانیتر ناتوانن وابنوێنن کە گوێیان لە هیچ شتێك نییە. هەروەها بۆ ئەو کەسانەی کە یەکتر ناناسن، "لە کاتی تەماشاکردن"ی یەکتریدا زەحمەتە بە شێوەیەکی راستەوخۆتر لەوشتەی کە رێساکانی سەرنجدانی مەدەنی رێگەدەدا، کارێکی وا بکەن کە نەبینرێن. لە بەر ئەوە لە ئاسانسۆرەکاندا زۆرجار ئەو کەسانەی لەوێن، حاڵەتێکی وا بەخۆوە دەگرن کەئەنەهوو گوێیان لە هیچ نییەو چاو لە کەس ناکەن. چاو دەبڕنە سەقفەکە یان دوگمەکانی ئاسانسۆرەکە – چاو لە هەموو شتێك دەکەن، تەنیا هاوسەفەرەکانیان نەبێت! گفتوگۆکان دەوەستن یان کورت دەکرێنەوە. بەم شێوەیە ئەگەر چەند کەسێك دانیشتبێتن‌و پێکەوە قسە بکەن،و یەکیان قسەکەی ببڕێ‌و وەڵامی موبایلەکەی بداتەوە، ئەوانیتر بەئاسانی ناتوانن خۆیان لە گێلی بدەن، رەنگە بە سستی‌و دوودڵییەوە گفتوگۆکەیان درێژە بدەن ( ***Goff man, 1963, p. 156***).

## کارتێکردن

گافمەن‌و ئەو نوسەرانەی کە بابەتیان لە سەر کارلێکی کۆمەڵایەتی نوسیوە، زۆرجار لە شیکردنەوەی کارلێکی کۆمەڵایەتیدا ئەو چەمکانە بەکار دەبەن کە لە شانۆ وەریان گرتووە. چەمکی "رۆڵی کۆمەڵایەتی" کە بۆ ئەم مەبەستەو بە شێوەیەکی گشتی‌و بەرفراوان لە کۆمەڵناسیدا بەکار دەبرێ، لە بەستێنی شانۆییەوە سەرچاوەی گرتووە. رۆڵ، بریتییە لەو چاوەڕوانییە کە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە پێناسە کراوەو تاك لە پێگە یان "شوێنگەی کۆمەڵایەتی"ی دیاریکراودا پێڕەوی لێ دەکا. بۆ نموونە، مامۆستایەتی، خۆی لە خۆیدا پێگەیەکی تایبەتە، رۆڵی مامۆستا بریتییە لە هەڵسوکەوتکردنی دیاریکراو لەگەڵ قوتابییەکانیدا. لە "مۆدێلی شانۆیی"دا کە گافمەن بە کاری دەبا، ژیانی کۆمەڵایەتی بە چەشنێك چاو لێدەکرێ کە وەك بڵێی بە هۆی ئاکتەرەکانەوە لە سەر تەختەی شانۆ – یان لە زۆر شانۆی دیکەدا – نیشان دەدرێ، چوونکە چلۆنایەتی رەفتاری ئێمە بەستراوەتەوە بەو رۆڵەوە (***role***) کە ئێمە لە کاتێکی دیاریکراودا دەیگێڕین. تاکەکان زۆر بۆیان گرنگە بزانن کەسانیتر چۆن چاویان لێ دەکەن‌و بە هەموو شێوەیەك هەوڵدەدەن تا بەرامبەرەکەیان بەو شێوەیە کە ئەمان دەیانەوێ کاردانەوەیان هەبێ. هەرچەند رەنگە ئەم کارە هەندێ جار لە رووی حیسابەوە بێت، بەڵام زۆر کاری وا هەیە کە ئێمە لە رووی دیقەتەوە ئەنجامیان نادەین. کاتێ کەسێك لە کۆبوونەوەیەکی فەرمیدا بەشداری دەکا، شێوەی جلوبەرگ‌و رەفتاری بەتەواوی جیاوازە لەو کاتەی کە لە رۆژێکی پشووداندا لەگەڵ هاورێکانی دەچێ بۆ تەماشاکردنی یاری فوتباڵ.

## دیمەنە دیارو شاراوەکان

گافمەن دەڵێ، دەتوانین بەشی زۆری ژیانی کۆمەڵایەتی بە دوو بەشی دیمەنە دیارو دیمەنە شاراوەکان دابەش بکەین. دیمەنە دیارەکان، بەو دۆخە کۆمەڵایەتییە یان بەو پێوەندیانە دەوترێ کە تاکەکان تێیدا بە جددی هەڵسوکەوت دەکەن، ئەوانە هەڵسوکەوتی دیارن. (***on-stage performances***) دیمەنە دیارەکان بەو شوێنانە دەوترێ کە ئامرازو کەرەستەی نمایشکردن ئامادە دەکرێن‌و تاکەکان

خۆیان بۆ کرداری دوو لایەنە لە شوێنە فەرمییەکاندا ئامادە دەکەن. دیمەنە دیارەکان لە پشتی پەردەی شانۆییەك یان ئەو چالاکییانە دەچن کە وێنەگر وێنەیان ناگرێ. کاتێ خەڵك لە پشتی پەردەوەن، دەتوانن تەواو هەست بە ئاسوودەیی بکەنو ئەو هەستو هەڵسوکەوتانەی کە لە کاتی ئامادەبوون لە دیمەنە دیارەکاندا کونترۆڵ دەکرێن، لەو شوێنەدا دەتوانن ئازادانە دەریان ببڕن. لەم سۆنگەوە، کاتێ گارسۆنێکی رستوورانت سەرقاڵی خزمەتکردنی کڕیارەکەیە، رەنگە بە زەردەخەنەو ئەدەبەوە رەفتار بکا، بەڵام هەرکە چووە نێو مەتبەخەکەوە، لەوانەیە ئەدەبو نەزاکەت فەرامۆش بکا. ئەگەر کڕیارەکان بیانزانیبا کە گارسۆنەکان لە نێو مەتبەخدا چۆن رەفتار دەکەن، لەوانەبوو کەمتر کەسێك حەزی بەوە بکردایە لە رستوورانتەکاندا نان بخوا.

لە دیمەنە نادیارەکاندا، رێزنەگرتنی شتە پیرۆزەکان، باسکردنی راستەوخۆ لەسەر کاری سێکسی، پرتەو بۆڵەکردن، پۆشینی جلوبەرگی نافەرمی، وەستانو دانیشتنی ناڕێکوپێك، بەکار هێنانی زمانێکی ناستاندارد، لە ژێر لێوە قسەکردنو هاوارکردن، گاڵتەپێکردنو پێ رابواردن، ئێهمالکردنی کەسانی دیکە، خۆخەریککردن بە هەندێ شتی لاوەکییەوە وەك، نارەنارکردن، فیکە لێدان، جووین، ناخونەك لێدان، قورقێنەدانو خاڵیکردنی هەوای سك(*Goff man,1969, p. 128*).

داهێنانو پاراستنی ئەو رەفتارانەی کە تایبەتن بە دیمەنە دیارەکان، زۆرجار پێویستی بە هەوڵێکی دولایەنە هەیە. بەم شێوەیە دوو سیاسەتمەداری بەرجەستە لە نێو حزبێکدا، ئەگەرچی لە دڵەوە رقیان لەیەك بێت، لەوانەیە لە بەرامبەر کامێراکانی تەلەفزیۆنەکاندا نمایشیکی زیرەکانە لە یەکیەتیو هاوڕێیەتی نیشان بدەن. لەوانەیە ژنومێردێك دەمەقرەکانی خۆیان لە منداڵەکانیان بشارنەوەو لە بەرچاوی ئەواندا هاوئاهەنگی خۆیان بپارێزن، تەنیا لە بەر ئەوەی کە دوای دڵنیابوون لە خەوتنی منداڵەکان، بە توندی بەگژ یەکدا بچنەوە.

## قبووڵکردنی رۆڵەکان: بینین لە نزیکەوە

جیمزهێنسلینو می بریگز، لێکۆڵینەوەیەکیان لە سەر جۆرە رووبەڕووبونەوەیەکی تەواو تایبەتو زۆر ورد ئەنجام دا– کاتێ ژنێك بە مەبەستی بینینی نەخۆشییە ژنانەکان دەچێتە دوکتۆر، چی روودەدا (*Henslin & Briggs, 1971*). زۆربەی ئەو بینینانەی کە پێوەندییان بە عەورەتەوە هەیە، بە هۆی پزیشکی پیاوە ئەنجام دەدرێ. ئەم ئەزموونە بۆ هەردوولا پڕە لە شەرمو پرسیاری دەرنەبڕاو. لە کەلتوری رۆژئاواییدا ژنانو پیاوان بە پێی پەروەردەی کۆمەڵایەتیان، ئالەتی سێکسییان بە تایبەتیترین بەشی لەشیان دەزانن،و بینینو دەستهێنان بەوبەشانەدا زیاتر پێوەندی بە کاری سێکسییەوە هەیە. بەشێکی زۆر لە ژنان ئەوەندە لە بینینی ئەو بەشەی لەشیان نیگەرانن، کە تەنانەت ئەگەر هۆیەکی پزیشکی بەهێز بۆ ئەم کارەش هەبێ، دیسانەوە خۆیان لە چوونە لای پزیشك دەبوێرن.

هێنسلینو بریگز، پێکەوە کۆمەڵە زانیارییەکیان تاوتوێ کرد کە لە لایەن بریگزەوە وەك پەرستارێکی راهاتوو، لە سەر ژمارەیەکی زۆری بینینی نەخۆشییەکانی ژنان کۆی

کردبووەوە. بە پێی تێگەیشتنەکانی ئەوان لە ئاکامگیرییەکان، دەکرێ چەند قۆناغێك بەدی بکەین. ئەوان بە کەڵکوەرگرتن لە خوازەیەکی شانۆیی، باسی ئەوەیان کرد کە دەکرێ هەر قۆناغێك وەك دیمەنێکی جیاواز لە بەرچاو بگیردرێ، کە تێیدا ئەو رۆڵانەی کە ئاکتەرەکان دەیگێڕن لە درێژەی بەسەرهاتەکەدا گۆڕانی بە سەردا دێ. خۆئامادەکردن (*prologue*)، ئەو شوێنەیە کە ژنەکە دەچێتە نێو ژوورەکە، خۆی ئامادە دەکا تا رۆڵی نەخۆش بگێڕێ،و بۆ ماوەیەك شوناسی راستەقینەی خۆی بەلاوە دەنێ. کاتێ بانگ دەکرێتە ژووری بینین، رۆڵی نەخۆش قبووڵ دەکاو دیمەنی یەکەم دەست پێدەکا. پزیشك حاڵەتێکی جددیو پیشەیی بەخۆوە دەگرێ، بەڵام لە گەڵ نەخۆشەکەدا بە شێوەیەکی شیاوو رێزدارانە دەجووڵێتەوە، چاو لە چاوی دەکاو بە ئەدەبەوە گوێی بۆ رادەگرێ. ئەگەر بڕیار بدا کە پێویستە ببینرێ، ئەوا نەخۆشەکە تێدەگەینێ، ژوورەکە بە جێ دێڵێ. ئەم دیمەنە کۆتایی پێ دێ.

کاتێ کە پزیشك ژوورەکە بەجێدێڵێ، پەرستارەکە دێتە ژوورەوە. ئەو لەدیمەنە سەرەکییەکەدا کە بەزوویی دەستپێدەکا، هاوکارێکی گرنگە. ئەو ئاسوودەیی بە دڵەڕاوکێیەکانی نەخۆش دەبەخشێ، هەم وەك رازدارێك –ئەو هەندێ شت دەزانێ کە ژنان دەبێ تەحەمولی بکەن– دەجووڵێتەوەو هەم وەك هاودەست لەو شتەدا کە دێتە پێش. سەرەنجام پەرستار یارمەتی نەخۆش دەکا تا لە تاکێکی راستەقینەوە بگۆڕێ بۆ تاکێکی ناڕاستەقینە، تا لە دیمەنە سەرەکییەکەدا – واتە بینینی بەشێك لە لەشی، بەشداری بکا. پەرستارەکە نەك تەنیا چاودێری داکەندنی جلوبەرگەکانی نەخۆشەکە دەکا، بەڵکو بە تایبەت چاودێری ئەو بەشانە دەکا کە بە گشتی خودی نەخۆشەکە رەزای لە سەرە. بەمجۆرە، جلەکانی نەخۆشەکە وەردەگرێو دەقی دەکا. زۆربەی ژنان پێیان خۆشە کاتێ کە پزیشك دەگەڕێتەوە، جلەکانی ژێرەوەیان بە دیارەوە نەبێ،و پەرستارەکە ئەو جلانە لادەبا. ئەو نەخۆشەکە رێنوێنی دەکا تا لە سەر مێزی بینینەکە راکشێ،و بەر لەوەی پزیشك بگەڕێتەوە، بەشی زۆری لەشی دادەپۆشێ.

ئێستا دیمەنە سەرەکییەکە دەست پێدەکا، کە پەرستارو پزیشکەکە هەردووکیان لەوێ ئامادەن. بوونی پەرستار لەو شوێنەدا نەخۆشەکە لەوە دڵنیا دەکا کە هیچ مەبەستێکی سێکسی لە رووبەڕووبوونەوەی نێوان ئەو و پزیشك دا نییە،و جگە لەوە ئەگەر پزیشك بەوە تاوانبار بکرێ کە بە شێوەیەکی ناپیشەیی جووڵاوەتەوە، دەتوانێ شاهیدحاڵێکی یاسایی فەراهەم بکات. بینینەکە بەشێوەییەکی وا دەکرێ کە ئەنەهوو نەخۆشەکە لەوێ نییە– ئەو چەرچەفەی کە نەخۆشەکەی پێداپۆشراوە، عەورەتی شاردووەتەوە،و حاڵەتی راکشانی نەخۆشەکە رێگا نادا چۆنیەتی بینینەکە ببینێ. پزیشکەکە لە سەر کورسییەك دانیشتووەو دەموچاوی نەخۆشەکە نابینێ،و مەگەر پرسیارێکی پزیشکی بێتە پێش، دەنا سەرنجی ناداتێ. نەخۆشەکەش خۆی هەوڵدەدا ببێتە کەسێکی ناڕاستەقینە،و سەری هیچ باسێك ناکاتەوەو بە پارێزەوە دەجووڵێتەوە.

لە مەودای نێوان ئەم دیمەنەو دیمەنی کۆتاییدا، دیسان پەرستارەکە رۆڵی هاوکاری دیمەنەکە دەگێڕێو یارمەتی نەخۆشەکە دەکا تا

جارێکیتر ببێتەوە بە کەسێکی راستەقینە. لەو ماوەیەدا ئەم دوانە رەنگە گفتوگۆ دەست پێبکەنەوەو نەخۆشەکە بە تەواوبوونی بینینەکە هەست بە ئاسوودەیی بکا. دوای خۆ لەبەرکردن‌و خۆرێکوپێککردن، نەخۆشەکە ئامادە دەبێ تا بچێتە نێو دیمەنی کۆتاییەوە. پزیشک سەرلەنوێ دەگەڕێتەوە، لە شیکردنەوەی ئاکامەکانی بینینەکەدا لەگەڵ نەخۆشەکەدا وەك کەسێکی راستەقینە رەفتار دەکا. پزیشك بە رەفتاری نەجیبانەی خۆی نەخۆشەکە تێدەگەیەنێ کە دوای ئەوەی لە بینینەکەدا لە سەر رەزامەندی نەخۆشەکە، لە نزیکەوە دەستی لە لەشی داوە، کاردانەوەکانی هیچ گۆڕانێکیان بە سەردا نەهاتووە. دوایین بەش ئەو کاتەی کە نەخۆشەکە عیادەکە بەجێ دێڵێ‌و سەر لە نوێ لە دونیای دەرەوەدا کەسێتی خۆی بەدەست هێناوەتەوە.

## ڕووبەڕووبوونەوەکان‌و سنووری شەخسی

لە کەلتوری رۆژئاواییدا، لە زۆربەی کاتەکاندا کە خەڵك لە دەوری یەك کۆدەبنەوە، لانی کەم هەوڵ دەدەن مەودایەکی یەك مەترییان لە نیواندا هەبێ. کاتێ لە تەنیشت یەکەوە راوەستاون، تەنانەت ئەگەر لە چوارچێوەی هەمان رووبەڕووبوونەوەدا نەبێ، لەوانەیە مەودای نێوانیان کەمتر بکەنەوە. جیاوازییە کەلتورییەکان نەخشیان لە پێناسەکردنی سنووری شەخسیدا هەیە. بۆ نموونە، لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، خەڵك بە پێچەوانەی ئەو شتەی کە رۆژئاواییەکان قبوڵیانە، زۆر لە نزیك یەکەوە دەوەستن. ئەو گەڕیدە رۆژئاواییانەی کە سەردانی ئەو ناوچانە دەکەن، لەوانەیە بە بینینی کتوپڕی ئەو دیمەنانە تووشی شڵەژان بن.

ئیدوارد تی. هال کە زۆر توێژینەوەی بەرفراوانی لە سەر پێوەندی ئاماژەیی ئەنجام داوە، چوار قەڵەمڕەوی بۆ سنووری شەخسی دیاری کردووە. مەودایەکی نزیك تا یەك مەترونیو، تایبەتی چەند رووبەڕووبوونەوەیەکی کۆمەڵایەتییە. تەنیا ئەو کەسانەی کە پێوەندییەکی نزیك‌و سیستماتییان پێکەوە هەیە — وەك دایك‌و باوك‌و منداڵەکان، یان ئەویندارەکان — لە چوارچێوەی ئەو سنوورەتایبەتییەدا هەڵسوکەوت دەکەن. سنووری شەخسی (لە نزیکەی پەنجا سەنتیمەترەوە تا نزیکەی سەدو بیست سەنتیمەتر)، ئەمە مەودایەکی ئاساییە بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هاوڕێکان‌و ئەو کەسانەی کە تا رادەیەك لە یەك نزیکن. لەم قەڵەمڕەوەدا، نزیکییەکە تا رادەیەك رێگەپێدراوە، بەڵام بە گشتی ئەم نزیکییە بە تەواوی سنووردارە. مەودای کۆمەڵایەتی، لە سەدوبیست سانتیمەترەوە تا سیسەدوشەست سانتیمەتر، سنوورێکە کە بە گشتی لە بەستێنەکانی کارلێکدا، وەك کاتی وتوێژەکان دەپارێزرێ. قەڵەمڕەوی چوارەم چوارچێوەی مەودای گشتییە، مەودایەکی زیاتر لە سێسەدو شەست سەنتیمەتر کە بە هۆی ئەو کەسانەوە دەپارێزرێ کە لە سەر تەختەی شانۆدا بۆ گرووپێکی تەماشاچی شانۆییەك نمایش دەکەن.

لە کارلێکی ئاساییدا، لە بەشی زۆری پێوەندییەکاندا کەڵك وەرگرتن لە قەڵەمڕەوی سنووری شەخسی پێوەستە بە مەودای نزیك‌و شەخسییەوە. ئەگەر ئەم سنوورانە پێشێل بکرێن، تاکەکان هەوڵدەدەن ئەم پێشێلکارییە سنووردار بکەن (سنوورەکانی خۆیان بەدەست بێننەوە). تێرامانێك لەوانەیە بە بەرامبەرەکە بڵێ "دوور بکەوەوە!" یان ئەو کەسە لەوانەیە بە ئەنیشك

بەرامبەرەکەی دوور بخاتەوە. لەو حاڵەتانەدا کە تاکەکان ناچارن لە رادەبەدەر لە بەرامبەرەکەیان نزیك بکەونەوە، لەوانەیە سنوورێکی فیزیکی دروست بێت، وەکو کاتێك کە کەسێك لە پشت مێزێکی قەرەباڵغی کتێبخانەدا بە کەڵەکەکردنی کتێبەکان لە سەر لێواری مێزەکە سنوورێکی شەخسی بۆ خۆی دیاری بکا(*Hall, 1959, 1966*).

## کارلێك لەکاتو شوێندا

بینینی چۆنیەتی دابەشبوونی چالاکییەکان بە سەر کاتو شوێندا بە شێوەیەکی گشتی لە شرۆڤەکردنی رووبەروونبوونەوەکانو هەروەها لە تێگەیشتنی رەهەندە سەرەکییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا گرنگییەکی بنەڕەتی هەیە. ئاشکرایە کە هەر کارلیك، هەلومەرجی خۆی هەیە – لە شوێنێکی تایبەتدا روو دەداو قۆناغێکی زەمەنی تایبەتی هەیە. ئەو کارانەی کە ئێمە بە درێژایی رۆژ ئەنجامیان دەدەین، بەگشتی لەرووی کاتو شوێنەوە پۆلین دەکرێن. بەمجۆرە بۆ نموونە، ئەو کەسانەی کە دەچنە سەرکار، ماوەیەکی دیاریکراو – بۆ نموونە 9ی بەیانی تا 5ی ئێوارە کار دەکەن. هەر بەم شێوەیەش هەفتەکەیان لەرووی کاتەوە بەش بەش کراوە: رەنگە لەرۆژانی هەفتەدا کار بکەن، لەرۆژانی پشوودا لەماڵ بن، بەرنامەی کار کردنیان لە کاتی پشوودانداا بگۆڕن. کاتی کارکردن بە گشتی بە مانای جووڵەو گۆڕینی شوێنیشە – بۆ نموونە، ئەو کەسەی لە ماڵەوە بەرەو شوێنی کارەکەی دەڕوا، لەوانەیە بە پاس لە شوێنێکەوە بەرەو شوێنێکی دیکەی شار بڕوا یان رەنگە ماڵی لە قەراخ شاردا بێتو بۆ کارکردن بچێ بۆناو شار. کەواتە کاتێ ئەو بەستێنانە دەخوێنینەوە کە کارلێك تێیاندا ئەنجامدەدرێن، زۆرجار سوود بەخشە کەرەفتارەکانی خەڵك لە بەستێنەکانی کاتوشوێندا شرۆڤە بکەین.

جوگرافیناسانی کۆمەڵایەتی بۆ ئەوەی چۆنیەتی کارتێکردنی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیو وەرچەرخانی تەکنۆلۆژی لە سەر کاروچالاکی کۆمەڵایەتی شرۆڤە بکەن، چەمکی سوودبەخشی "لێکنزیکبوونەوەی کات– شوێن ( *Time-Space Convergence*) یان هێنایەکایەوە. لێکنزیکبوونەوەی کات–شوێن ئاماژە بە "کورتبوونەوەی مەوداکان"و باشتربوونی سیستمەکانی گواستنەوەو گەیاندن دەکا. بەمجۆرە دەتوانین بە پێی ئاستی بگۆڕی حەرەکەتی جوگرافیاییو پێشکەوتنی شێوازەکانی گواستنەوەو گەیاندن، ماوەی سەفەرکردن لە رۆژهەڵاتەوە بۆ کەنارەکانی ویلایەتە یەگرتووەکان بە دەست بێنین. ئەم سەفەرە بەپێی، زیاتر لە دوو ساڵ دەخایەنێ، بە ئەسپ، هەشت مانگ، بە گالیسکە، چوارمانگ، بە شەمەندەفەر (ساڵی1910) چوار رۆژ، بە ئۆتۆمبیلی ئێستا، دوو رۆژونیو، بە ئاژانسە هەواییە پێشکەوتووەکان، پێنج سەعات، بە خێراترین فڕۆکەی جت، تەنیا کەمێك زیاتر لە دوو کاتژمێر، بە شاتلی ئاسمانی، چەند خولەکێك دەخایەنێ(*Janelle, 1968, Carl stein, et al, 1978*). شێوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی کە دەکەونە ژێر کارتێکردنی لێکنزیکبوونەوەی شوێن – کات، سەر لە نوێ رێك دەخرێنەوە. بۆ نموونە، بەشێکی بەرچاو لەو شتومەکانەی کە ئێمە کەڵکیان لێوەردەگرین،و و بەشێکی زۆر لە خواردەمەنییەکان لە مەودایەکی زۆر دوورەوەو تەنانەت لەوپەڕی دونیاوە دەهێنرێن. ئەم کارە بووەتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی جیهان زیاتر لە جارانو بە شێوەیەکی

دوولایەنە پێکەوە گرێ بخۆن. ئێمە دەتوانین بە هۆی چەمکی پۆلینکردنی ناوچەیی کە بە چۆنیەتی دابەشبوونی ناوچەی ژیانی کۆمەڵایەتی لە کات‌وشوێندا دەوترێ، لەوە تێبگەین کە چالاکییە کۆمەڵایەتیەکانمان لە کات‌و شوێندا بەچ شێوەیەك رێك دەخرێن. بۆ نموونە، خانوویەکی شەخسی لە بەرچاو بگرن. خانوویەکی ئەمڕۆیی دابەشبووە بە سەر چەندین ژوورو رێڕەو و قاتدا – ئەگەر خانووەکە لە قاتێك زیاتر بێ. بەشە جۆراوجۆرەکانی تەنیا لە رووی هەیکەلەوە جیاناکرێنەوە، بەڵکوو لە رووی شوێن‌و کاتیشەوە دابەشکراون. ژوورەکانی دانیشتن‌و مەتبەخ لە رۆژدا زیاتر بەکار دێن‌و ژوورەکانی نوستن لە شەودا. چوارچێوەکانی کارلێك لەم بەشە جیاوازانەدا بە پێی دابەشبوونی کات‌و شوێن دیاری دەکرێن. چەند بەشێکی خانوەکە ناوچەکانی دیمەنی شاراوە(پشتی پەردە) پێکدێنن، لە حاڵێکدا بەشەکانیتر، شوێنی دەرکەوتن‌و ئەنجامدانی کاروباری ئاسایین. دەکرێ لە ماوەیەکی دیاریکراوی حەوتوودا هەموو خانووەکە ببێتە ناوچەی دیمەنی شاراوە، دەکرێ هەموو رێڕەوەکان بە درێژایی کات‌و شوێنەکان بە چوونە دەرەوە کۆتاییان بێ. گافمەن دیسانەوە بە جوانی ئەم بابەتانەی باس کردوە:

لە سەر لە بەیانی رۆژێکی یەکشەمەدا، هەموو ئەندامانی بنەماڵە دەتوانن لە پشت دیواری حەوشەوە ناڕێکی‌و شپرزەیی خۆیان بشارنەوەو بەجلوبەرگی نێو ماڵەوە بسووڕێنەوە،و بەتەواوەتی حورییەتی خۆیان وەربگرن. هەر بەم شێوەیە لە گەڕەکە مامناوەندییەکانی ئەمریکادا، دوانیوەڕۆیان، رەنگە مەودای نێوان گۆڕەپانی یاریکردنی منداڵان‌و ماڵەوە وەك ناوچەی دیمەنی شاراوە چاو لێبکرێ‌و دایکان بە تراکسوت‌و نەعل‌و ئاڕایشێکی سادەوە پیاسەی تێدا بکەن..... دیارە ئەو ناوچەیەی کە بە تەواوەتی وەك ناوچەی دیمەنی شاراوە بۆ جێبەجێکردنی سیستماتی بەرنامەیەکی تایبەتی رۆژانە دیاری کراوە، زۆرجار پێش بەڕێوەچوونی بەرنامەکە و دوای تەواوبوونیش وەك ناوچەی دیمەنی شاراوە بەکاردەهێنرێ، چونکە لە کاتی پێویستدا رەنگە کەرەستەکانی چاك بکرێنەوەو جێگۆڕکیان پێ بکرێ یان لەوانەیە ئاکتەرەکان بە جلوبەرگی نمایشەوە دوایین پرۆڤەی خۆیان بکەن. بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە هەر ئەوەندە بەسە پێش کرانەوەی رەسمی چەند خولەکێك چاوێك لە نێو ریستورانتەکان یان فرۆشگەکان یان خانوەکان بکەین (*Goff man, 1969, p. 127*).

## کاتی کاتژمێر

لە کۆمەڵگەکانی ئەم سەردەمەدا، دابەشکردنی ناوچەیی چالاکییەکانمان بە توندی کەوتونەتە ژێر کارتێکەری کاتژمێرەکان‌و کاتی کاتژمێرو بە بێ بوونی کاتژمێرو دابەشکردنی وردی کارو چالاکییەکان لەرووی کاتەوە –هەروەها هاوئاهەنگ کردنی ئەو کاروچالاکیانە– کۆمەڵگە پیشەسازییەکان دروست نەدەبوون (*Wright 1968, Munford, 1973*). ئەمڕۆ لە هەموو جیهاندا ستانداردێك بۆ دابەشبوونی کاتەکان بە پێی کاتژمێر لە ئارادایە – و ئەمە وای کردوە کە سیستمە ئاڵۆزەکانی گواستنەوەو پێوەندیگرتنی نێونەتەوەیی کە ژیانی ئێمە بە وانەوە بەستراوەتەوە، بە پێی ئەو دابەشبوونە بەڕێوە بچن.

له ساڵی 1884دا، به پێی کونفرانسێکی نێونەتەوەیی کە لە واشنگتۆندا بەسترا، کاتێکی ستانداردی جیهانی دیاری کرا. لەو سەردەمەدا جیهان دابەشبوو بە سەر بیست‌وچوار ناوچەی زەمەنیدا کە هەرکام یەك کاتژمێر مەودایان لە نێواندا هەبوو،و دەسپێکی وردی ڕۆژی جیهانی دیاری کرا (*Zerubavel, 1982*).

پەرستگەکان، یەکەمین بنیاد بوون کە هەوڵیاندا چالاکی ئەندامەکانی خۆیان بە پێی بەرنامەیەکی زەمەنی لە سەرانسەری کاتەکانی ڕۆژو حەوتوودا ڕێکبخرێن، ئەمە لەسەدەی چواردەهەمەوە دەستیپێکرد. ئەمڕۆ ئیتر هیچ گرووپ‌و ڕێکخراوێك نابینرێ کە ئەم کارە نەکا – هەتا ژمارەی کەس‌و سەرچاوەکان زیاتر بێ، ئەم بەرنامە دەبێ بە شێوەیەکی وردتر دابڕێژرێ. ئیڤارتار زێروباڤێل (*Aviator Zerubavel, 1979*) لە ڕێگای خوێندنەوەی ستراکتۆری زەمەنی نەخۆشخانەیەکی گەورە ئەم بابەتەی نیشان دا. دەبێ نەخۆشخانە بە شێوەی بیست‌وچوار سەعاتە کار بکاو هاوئاهەنگی نێوان فەرمانبەرو سەرچاوەکان بابەتێکی چڕو ئاڵۆزە. بۆ نموونە، زۆربەی پەرستارەکان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لە بەشە جۆراوجۆرەکاندا کار دەکەن‌و بۆ بەشە جۆراوجۆرەکان دەگوێزرێنەوەو هەروەها داوایان لێدەکرێ ناوەناوە لە نۆبەتەکانی شەو و ڕۆژدا کار بکەن. تەواوی ئەوانەو هەموو ئەو سەرچاوانەی کە پێویستیان پێیانە، دەبێ هەم لە ڕووی کات‌و هەم لە ڕووی شوێنەوە تێکەڵ بە یەك بن.

## جوگرافیای کات

**مـــــیتۆدێکی ڕۆشنگـــــەرانەی ڕاڤـــەکـــردنـــی**

چالاکییەکان لە بەستێنی کات‌و شوێندا، بە هۆی تورستن هاگرستراند، زانای جوگرافیای سویدییەوە پەرەی سەند (*Hager strand, 1973; Carl stein, 1979*). هاگرستراند ئەم میتۆدەی خۆی ناو ناوە جوگرافیای کات، بەڵام ئەم میتۆدە لە بنەڕەتدا دەپەرژێتە سەر هەڵسووڕان لە بەستێنی کات‌و شوێندا. میتۆدی جوگرافیای کات، گرنگی بە ژینگەی فیزیایی (شەقامەکان، باڵاخانەکان، ڕێگاوبانەکان‌و گەڕەکەکان) دەدا کە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان لەو شوێنانەدا ئەنجام دەدرێن،و ئەو هەوڵ دەدا بزانێ کە ژینگەی فیزیایی(شوێنی کارو ژیان) چۆن کار دەکاتە سەر جووڵەی ڕۆژانەو حەوتوانەی تاك‌و گرووپەکان– چۆن دەکەوێتە ژێرکاریگەرییانەوە. ئێمە دەتوانین ڕێگاکانی هاتوچۆی خەڵك –واتە خەڵك چیدەکەن، لەچ کاتێکی شەووڕۆژدا لە چ شوێنێکدا – لە ماوەی ڕۆژێك یان هەفتەیەکدا لەسەر نەخشە دیاری بکەین.

دەکرێ باسی نموونەیەکی سادە بکەین. گریمان دوو کەسی (ئەلف)و (ب) لە دوو گەڕەکی جیاوازی شارێکدا دەژین. ئەو ڕێگایانەی کە ڕۆژانە پێیاندا تێپەڕ دەبن، لە ڕوی کات‌و شوێنەوە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ئەوان لە خاڵی $x$ دا بە یەك دەگەینێ –ڕەنگە شوێنی بەیەکگەیشتنەکە چایخانە یان ریستورانتێك بێت،و پێکەوە گفتوگۆ بکەن– و پاشان هەریەکەو بە لایەکدا بڕۆن. بە تۆمارکردنی چۆنیەتی چالاکییەکانی هەرکامەیان، ئێمە بە ئاسانی دەتوانین لە ڕووی کات‌و شوێنەوە وێنەیەك لە ژیانی بدەین بەدەستەوە. بەم شێوەیە دەتوانین نەخشەیەکی پڕاوپڕی کات‌و شوێن بکێشین کە ژیانی نێو گەڕەك‌و کۆمەڵگەکانی شار نیشان دەدا.

## سنووردارییەکانی کات و شوێن

لـــــە ڕێگای ناسینی تایبەتمەندییە ئاسایی، بەڵام بنەڕەتییەکانی چالاکی مرۆییەوە کە کار دەکەنە سەر چۆنیەتی ڕێکخستنی کات و شوینەکان، دەتوانین هەندێ لەو فاکتەرانە بناسین کە کار دەکەنە سەر مۆدێلەکانی ژیانی شارنشینی. سێ جۆر بەربەست، بە پێی هەڵکەوتنی کات و شوێن سنوورەکانی چالاکیمان دیاری دەکەن: سنوورەکانی توانایی، بریتین لەو بەربەستانەی کە بە هۆی پێکهاتەی فیزیکی تاکەکان دیاری دەکرێن. بۆ نموونە، هەموو مرۆڤێك پێویستی بەخەو و خۆراکە کەدەبێ لە چوارچێوەی شوێن و کاتی چالاکییەکانیاندا دابین بکرێ. ئەو کەسانەی کە لە ناوچەیەکدا کاردەکەن، دەبێ بڕێنە شوێنی کارکردنیان یان بۆ خۆیان بچن، و لەوێوە بگەڕێنەوە ماڵەکانیان تاخواردن ئامادە بکەن و شەو پشوویەك بدەن.

سنوورەکانی هاوبەندی (*Coupling*) بریتین لەو بەربەستانەی کە بە هۆی توانایی کەسەکانەوە بۆ کۆبوونەوە لەو شوێنانەی کە بەتایبەت کارلێکی تێدا ئەنجام دەدرێ، دادەنرێن. لە شوێنێکی وەك (شارە قەرەباڵغە کۆنەکان)دا دەگمەنن ئەو شەقامانەی کە شوێنە جیاوازەکانی شار پێکەوە گرێ دەدەن. جگە لەوە، هەموو ژینگە فیزیاییەکان، تارادەیەك زەرفییەتیان هەیە کە هاگرستراند پێی دەڵێ: "زەرفییەتی کەڵەکەبوون" (*Packing Capacity*). چوارچێوەیەك کە بە هۆی ژمارەی ئەو کەسانەی کە دەتوانن سنوورێکی تایبەت بە مەبەستی ئەنجامدانی کارەکانیان داگیر بکەن. قەرەباڵغبوونی لە ڕادەبەدەری شەقامەکان، نموونەی بەرجەستەی پڕبوونی ئەو زەرفییەتەیە. شەقامەکان لە رووی قەبارەی قەرەباڵغبوونەوە، ڕادەیەکی دیاریکراویان هەیە. لە کاتەکانی قەرەباڵغبوونی تەواودا هیچ کەس بە خێرایی تێناپەڕێ، بەڵکوو بەگشتی ئارام بە ڕێدا دەڕۆن.

سنوورەکانی باڵادەستبوون، پێوەندی بەو چوارچێوانەوە هەیە کە بە هۆی سیستمی دەسەڵاتەوە، لە کۆمەڵگەیەکی بچووك یان گەورەتردا دادەنرێن. بۆ نموونە، ئەوەی کە خەڵك تا چ ڕادەیەك دەسەڵاتیان هەیە لەو جێگایەدا بژین کە پێیان خۆشە، لە بەر لاوازی باری داراییان، ڕادەی دەسەڵاتەکەیان بەرتەسك دەبێتەوە. لەوانەیە زۆربەی خەڵك بیانەوێ لە گەڕەکە راقییەکاندا بژین، بەڵام تەنیا ژمارەیەکی کەم بە هۆی توانایی ماڵییانەوە ئەو کارەیان پێ دەکرێ. ڕێوشوێنە دیاریکراوەکانیش زۆرجار جۆرەکانی ئەو خانووانە دیاری دەکەن کە لە شوێنە جیاوازەکاندا دروست دەکرێن.

بۆ ئەوەی نیشان بدەین کە ئەم چەمکانە بە چ شێوەیەك کار دەکەنە سەر توێژینەو مەیدانییەکان، دەتوانین پرۆژەیەکی توێژینەوە لە بەرچاو بگرین کە لە ڕوانگەی جوگرافیای کاتەوە لە شاری نیوکاسڵ لە ساوێن وێڵزی ئۆستڕالیادا ئەنجام دراوە. ئەم پرۆژەیە هەندێ لەو کێشانە تاوتوێ دەکا کە پێوەندی بە دامەزراندنی ناوەندێکی لەشساغی لە ناوچەیەکی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە هەمەچەشنەوە هەیە کە شانزە مایل لە ناوەندی شارەوە دوورە. کاتێ بۆ یەکەمجار ئەم ناوەندە دامەزرا، بەڕێوەبەرەکانی ئاگایان لەوە نەبوو کە بەشی زۆری خەڵکی ناوچەکە ، کە ئەو ناوەندە سەبارەت بەوان دامەزرابوو، ڕۆژانە کار دەکەن. ژمارەیەکی بەرچاوی

نەخۆشەکان ناچار بوون یان بەیانیان پێش سەعات حەوت یان ئێواران دوای سەعات پێنج سەردانی ناوەند بکەن. ئەوانە وایان دەزانی کە ئەو ناوەندە لە کاتە ئاساییەکاندا کراوەیەو خزمەتی خەڵك دەکا.

بەمجۆرە، ناوەند لە رووی رادەی توانایی‌و هاوبەندییەوە، گەلیك کیشەی جددی بۆ دەهاتە پێش. بینینەوەی کارمەندی وا کە بتوانێ بەدەر لە کاتە ئیدارییەکان کار بکا، کارێکی زەحمەت بوو. ئەوانەی کە ئامادە بوون ئەم کارە بکەن، بۆ هاتوچۆکردن موشکیلەیان هەبوو. ناوەند نەیدەتوانی بەباشی بەرنامەکانی خۆی دابڕێژێ" رۆژانە هەندێ جار ناوەند چۆڵ‌و کارمەندەکان بێکار بوون. لە حاڵێکدا کاتەکانیتر — بە تایبەت لای ئێواران‌و ئاخری حەوتوو — ناوەندەکە بە رادەیەك قەرەباڵغ دەبوو کە نیوەی خەڵك بەریان نەدەکەوت. توێژەرەکان دوای لێکۆڵینەوەکردن لە سەر کات‌و شوێنی هات‌وچۆی چەند کارمەندێك‌و هەندێ لە نەخۆشەکان، توانیان هۆکاری سەرەکی کێشەکان بە وردی دەستنیشان بکەن. ئەوان هەروەها توانیان لە رێگای تەرخانکردنی باشتری سەرچاوەکانەوە چەند رێگاچارەیەکی پۆزەتیڤ بۆ کەمکردنەوەی ئەو کێشانە پێشنیار بکەن (*Parks &Thrift, 1980, pp. 271-2*).

## پۆلینکردنی ناوچەیی

دابەشکردنی کاروچالاکییەکان لە کات‌و شوێندا، تا رادەیەك بەدرێژای سەدەی رابردوو — بەتایبەت لەم داواییانەدا— کەوتوەتە ژێر کارتێکەری کۆلۆنیالیزمەوە. (*Colonization of time*). رەوتی کۆچکردن بەرەو شارەکان‌و لە نێو شارەکانیشدا هاوکات بووە لە گەڵ گەڕان لە پانتایی کاتەکانی ئێواران‌و شەواندا. مۆری ملبین دەڵی:

زۆرترین رادەی کۆچکردنی مرۆڤ لە کاتدا روو دەدا: واتە پەرەسەندنی چالاکییە تایبەتییەکان لە کاتەکانی بەخەبەربوون لە ماوەی بیست‌و چوار سەعاتی شەوو رۆژدا. کاری چەند شیفتەی فابریکەکان زیاتر بووە، رادەی چاودێری پۆلیس‌و کەڵکوەرگرتن لە تەلەفۆن زیادی کردووە. نەخۆشخانەکان چالاکتر بوون، دەرمانخانەی شەوانە — رۆژی، فڕینی فڕۆکەکان، پانسیونە شەوانە — رۆژییەکان، رێستورانتە بیست‌وچوار سەعاتەکان، ئاژانسەکانی بە کرێدانی ئۆتۆمبیل‌و بەنزینخانەکان‌و یانەکانی بۆلینگ‌و ئێزگەکانی رادیویی بیست‌و چوار سەعاتە، زیاتر بوون. خزمەتگوزاری خێرای وەك گەڕان بە ئۆتۆمبیل یان پێویستی بە قفڵسازەکان، یان کەفیلگرتن بۆ ئازادکردنی گیراوەکان بە وەسیقە یان حاڵەتی کتوپڕ بە هۆی کێشانی ماددەی هۆشبەر، ژەهراویبوون، خۆکوژی‌و قومارکردن، بێ راوەستان بە شەوو رۆژدا ئامادەی خزمەتگوزارین.

ئەگەرچی لەم حاڵەتانەدا کارمەندی جۆراوجۆر بە شێوەی نۆبەتی خزمەت دەکەن، بەڵام دەزگا پێوەندیدارەکان بەردەوام ئامادەی خزمەتگوزارین (*Melbin, 1987, p. 100*).

ملبین لە خەملاندنێکدا نیشان دەدا کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا دوای نیوە شەو جگە لە ئەو کەسانەی کە دەخەون، نزیکەی سی ملێون کەس کار دەکەن. تەنانەت لە ناخی شەودا، — لە سەعات 3 تا 5ی دەمەوبەیان — زیاتر لە دە ملێون کەس بەخەبەرن‌و کار دەکەن. ئاشکرایە کە ئەم گۆڕانکاریانە هەمیشە بە شێوەیەکی

ناراستەوخۆ چەمکەکانی شوێن لە خۆ دەگرن‌و لە رووی دابەشبوونی کات‌و شوێنەوە دەکەونە ژێر کارتێکەری چەندین بەربەستی جۆراوجۆرەوە. چالاکبوونی شەوانەی ناوچەیەك بەستراوەتەوە بە چالاکبوونی رۆژانەی ناوچەیەکی دیکەوە. بۆ نموونە، سەفەرکردنی شەوانە بە فڕۆکە، لەوانەیە دەمەوبەیان بگاتە شوێنی مەبەست‌و پێویستی بە خزمەتگوزاری فڕۆکەخانەو سیستمی گواستنەوەو گەیاندن هەبێ. ئەو دەزگایانەی کە بە هۆی چوونە سەری رێژەی کارو چالاکییەکان لە سەرەتای شەوو نیوە شەودا کاری خزمەتگوزاری ئەنجام دەدەن، هەر هەمان گیروگرفتیان بۆ دێتە پێش کە لە لێکۆڵینەوەکەی ناوەندی لەشساغی نیوکاسڵدا ئاماژەیان پێکرا.

دەتوانین ماوەکانی کەڵکوەرگرتن لە گەڕەکەکانی شار بەم شێوەیە دابەش بکەین:

1-کەڵکوەرگرتنی بەردەوام: ناوچە هەمیشەییەکان

2-چۆڵکردن: لە کاتی شەودا

3-هوروژمهێنان: قەرەباڵغی بەتایبەت لە شەودا

4-جێگۆڕکێ: جێگۆڕکێکردنی حەشیمەت لە رۆژەوە بۆ شەو

چەند ناوچەیەکی وەك گەڕەکەکانی نزیك ناوشار، کەموزۆر خەڵکێکی زۆر تێیاندا هاتوچۆ دەکەن، ئەگەرچی جۆری کارەکانیان لە سوورانی شەوو رۆژدا گۆڕانی بە سەردا دێت. ناوچە بازرگانییەکان شەوانە تا رادەیەکی زۆر چۆڵ دەبن. لە گەڕەکەکانی دەوروبەردا، کە هەم شوێنی کارو کاسپین‌و هەم جێگای سەیران‌و گەڕان، ئێوارانە کۆمەڵە خەڵکێك دەڕۆن‌و کۆمەڵێکیتر جێیان دەگرنەوە.

## ژیانی رۆژانە لە دیمەنی کەلتوری‌و میژوویدا

رەنگە هەندێ لە میکانیزمەکانی کارلێکی کۆمەڵایەتی کە بە هۆی گافمەن، گارفینکل‌و کەسانیترەوە شرۆڤە دەکرێن، میکانیزمی گشتگیر بن، بەڵام بەشی زۆریان وا نین. بۆ نموونە، دانانی "هێماکان" بۆ نیشاندانی دەستپێك‌و کۆتایی رووبەرووبوونەوەکان بێگومان لە هەموو شوێنێکدا تایبەتمەندی کارلێکی ئینسانین. ئەو ئامرازانەش کە بۆ رێکخستنی پێوەندییەکان بە کار دەبرێن، لە نێو هەموو کۆمەڵێکی ئینسانیدا بەرچاو دەکەون - وەك پشتهەڵکردن لە کەسانیتر لە کاتی کۆبوونەوەی چەند کەسێك لە دەوری یەکتر. بەوحاڵەش ژیانی خەڵك لە کۆمەڵگە رۆژئاواییەکاندا لە زۆر لایەنەوە لەگەڵ ژیانی خەڵکی سەر بە کەلتورەکانیتردا جیاوازی هەیە. بۆ نموونە، هەندێ لە رەهەندەکانی سەرنجنەدانی مەدەنی هیچ پێوەندییەکی بە رەفتاری ئەندامانی کۆمەڵگە هەرە بچووکەکانەوە نییە، کە کەسی بێگانەی تێدا نییەو هەروەها ئەو شوێنانەش کە رەنگە چەند کەسێك لە یەك کاتدا پێکەوە بن، ئەگەر هەبن، زۆر کەمن. بەشێکی زۆر لە بابەتەکانی مەقوولەی سەرنجنەدانی مەدەنی گافمەن‌و لایەنەکانیتری کارلێکی کۆمەڵایەتی، لە بنەڕەتدا پێوەندی بەو کۆمەڵگایانەوە هەیە کە رووبەرووبوون لەگەڵ کەسانی بێگانەدا، شتێکی ئاساییە. ژیانی ئێمە بە شێوەیەکی گشتی لە رێگای ئەو گۆڕانکارییانەی کە پێوەندییان بە پیشەییبوون، شارنشینی‌و سەرهەڵدان‌و پەرەسەندنی دەوڵەتەکانی سەردەمەوە هەیە، دروستبووە. هێنانەوەی نموویەك یارمەتیمان دەدا کە هەندێ لە جیاوازییەکانی نێوان کارلێکی کۆمەڵایەتی لە

کۆمەڵگەکانی سەردەمو کۆمەڵگەکانی پێشودا نیشان بدەین. یەکێك لەو کەلتورانەی کە لە رووی تەکنۆلۆژییەوە پەرەسەندنێکی وای بەخۆوە نەدیوە، کەلتوری کۆنگە (کە جاروبار "بووشمەن"یشی پێدەڵێن) (*kung- bushmen*). ئەم کەلتورە لە پێدەشتەکانی کالاهاری بوتسواناو نامیبیا لە ئەفریقای باشووردا هەڵکەوتووە (*Lee, 1968, 1969*). گۆڕانکاری دەرەکی خەریکە شێوەی ژیانیان دەگۆڕێ، ئێمە مۆدێلە سونەتییەکانی تاوتوێ دەکەین.

کۆنگەکان لە شێوەی گرووپی سی یان چل کەسیدا بە شێوەی کاتی لە لێواری چاڵاوەکاندا دەژین. لەو شوێنانەدا خواردن کەم دەست دەکەوێو ئەوان دەبێ ماوەیەکی زۆر بە دوایدا بگەڕێن. ئەم ڕێپێوانە بە شێوەیەکی نێوەنجی زۆرترین کاتەکانی ژیانی رۆژانەیان لە خۆ دەگرێ. بە زۆری ژنانو منداڵان لە کەمپەکاندا دەمێننەوە، بەڵام لەوانەیە تەواوی گرووپەکە سەرتاسەری رۆژ ڕێگا ببڕن. ئەندامانی ئەم کۆمەڵگەیە هەندێجار بە درێژایی رۆژ بە ناوچەیەکی بەرینی 100 مایلی چوار گۆشەدا بڵاو دەبنەوە،و شەو بۆ خواردنو خەوتن دەگەڕێنەوە کەمپەکانیان. لەوانەیە پیاوەکان لە رۆژدا یان بە تەنیا بن یان لە گرووپی دوو سێ کەسیدا بەو ناوچەیەدا بگەڕێن. بەڵام هەر ساڵەو لە وەرزێکی تایبەتدا ئەم رەوتە ئاساییەی چالاکی رۆژانەیان گۆڕانی بە سەردا دێت: واتە وەرزی باراناوی زستان کە ئاو فراوانەو بە ئاسانی چنگ دەکەوێ. لەو وەرزەدا ژیانی کۆنگەکان لە دەوروبەری بەشداریکردن لە سرووتو ڕێو رەسمەکانی خۆیاندا، کە ماوەیەکی زۆر دەخایەنێ، دەسووڕێتەوە.

زۆربەی ئەندامانی گرووپەکانی کۆنگ، ئەگەر کەسێك بە باشی نەناسن، نایبینن. تا ئەم ساڵانەی دوایی کە لەگەڵ دونیای دەرەوەدا ئاشنا بوون، ئەوان هیچ وشەیەکیان بۆ بێگانە نەبوو. لە کاتێکدا کە کۆنگەکان بە تایبەت پیاوەکانیان، لەوانەیە لە رۆژدا بۆ ماوەیەکی زۆر بە تەنیا بن، لە نێو خودی کۆمەڵگەکەدا کاتێکی ئەوتۆ یان لە بنەڕەتدا هیچ کاتێك بو ‌خەڵوەتکردن نییە. بنەماڵەکان لە نێو کەپرێکی روو ئاوەڵادا دەژین،و هیچ شتێکیان لە چاوی یەکترەوە شاراوە نییە. کەس بە سەرنجدان بە بینینەکانی گافمەن لە سەر ژیانی رۆژانە، هیچ لێکۆڵینەوەیەکی دەربارەی کۆنەگەکان ئەنجام نەداوە، بەڵام بە ئاسانی بۆمان دەردەکەوێ کە هەندێ لە کارەکانی تا رادەیەکی کەم لە ژیانی کۆنگەکاندا بە کار دەبرێن. بۆ نموونە، چەند هەلێکی کەم بۆ دروستکردنی ناوچەی دیمەنی شاراوەو دیمەنی دیار دەستدەکەون. جیاکردنەوەی کۆمەڵەکانو پێوەندیگرتنی جۆراوجۆر بە هۆی دیواری ژوورەکانەوە، دروستکردنی خانووی جیاواز،و گەڕەکە جۆراوجۆرەکانی شارەکان – ئەم لایەنانەی ژیانی رۆژانەی کۆمەڵگەکانی ئەم سەردەمە لە لای کۆنگەکان بوونیان نییە.

تامی کارلستین، بە کەڵکوەرگرتن لە چەمکەکانی جوگرافیای کات، رەهەندە کۆمەڵایەتییەکانی ژیانی کۆنگەکانی ئانالیز کردووە (*Cartesian, 1983*). ئەو دەڵێ، کۆنگەکان وەك هەموو راوچیانو عەدالانی خۆراك لەگەڵ پارادۆکسی کات – شوێنی نێوان ئەنبارکردنی خواردەمەنییەکانو هەڵسووڕانی کۆمەڵایەتیدا بەرەو روون، کە کار دەکاتە سەر چۆنیەتی ژیانی رۆژانەیان. ئەوان هەتا زیاتر لە پێناو کۆکردنەوەو ئەنبارکردنی تفاقی

ڕۆژانی سەختدا هەوڵ بدەن، زیاتر لە ناوچەیەکدا پێگیر دەبن. بەڵام ئەگەر بێتو چالاکییەکانیان لە ناوچەیەکی تایبەتدا چڕ بکەنەوە، شتێکی ئەوتۆیان چنگ ناکەوێ، چونکە ناتوانن بە گوێرەی پێویست بچنە نێو قوڵایی بیابانەوەو خۆراکی پێویست بە دەست بێنن. شێوەی مامەڵەکردنی کۆنگەکان لەگەڵ ئەم کێشەیەدا وای کردوە کە ژیانیان بەم شێوەی لێ بێت. ئەوان تەنیا لە کاتی پێویستدا کەمپەکەیان دەگوێزنەوە.

دەتوانین لە شێوەی نموودارێکدا پانتایی گۆڕانی شوێن لە ڕۆژێکدا نیشان بدەین. ئەگەر بۆ وێنە، کۆنگەکان لە بیابانەکانی باکوری ئەفریقادا دەژیان، کە وشتر هاتوچوەکانی ئاسانتر دەکرد، نموودارەکە تا رادەیەکی زۆر بە باری ئاسۆییدا دەڕۆشت. زیادبوونی هەڵسووڕان لە پانتایی شوێندا دەتوانێ ئاکامی باشتری بۆ شێوەی ژیانی هۆزێك هەبێ. بۆ نموونە، باوبوونی کەڵکوەرگرتن لە ئەسپ لە نێو سوورپێستەکاندا توانایی پێبەخشین تا دەستیان بە گاڕانە کێوییەکان رابگا. ئەمە گۆڕانی لە شێوەی ژیانو هەندێ لە دابونەریتەکانی ئەواندا پێك هێنا.

## کۆمەڵناسی سنووردارو کۆمەڵناسی بەرفراوان

خوێندنەوەی رەفتاری ڕۆژانە لە دۆخەکانی کارلێکی ڕووبەڕوودا، بە گشتی بەکۆمەڵناسی سنووردار ناو دەبرێ. کۆمەڵناسی بەرفراوان بریتییە لە شرۆڤەکردنی سیستەمە کۆمەڵایەتییە گەورەکان، وەك کۆمپانیایەکی بازرگانی گەورە، سیستەمە سیاسییەکان یان سیستەمی ئابووری. کۆمەڵناسی بەرفراوان هەروەها شرۆڤەکردنی پرۆسە درێژخایەنەکانی گۆڕانکاری — وەك پەرەسەندنی پیشەسازی— یش لە خۆ دەگرێ. لە بینینی یەکەمدا وا دێتە بەرچاو کە گوایە شرۆڤەکردنی سنووردارو گشتگیر دوو شتی تەواو جیاوازن. لە راستیدا ئەم دوانە، هەروەك لەم پاژەدا هەوڵدراوە نیشان بدرێ، پێوەندییەکی پتەویان پێکەوە هەیە( *Knorr-Cetina & Cicourel, 1981,* *Giddens,1984*).

ئەگەر بمانەوێ لە بەستێنی سروشتی ژیانی ڕۆژانە تێبگەین، شرۆڤەکردنی گشتگیر کارێکی پێویستە. شێوە ژیانی ڕۆژانەی خەڵك تا رادەیەکی زۆر لە ژێر کارتێکەری چوارچێوەیەکی سروشتی بەرینترداییە کە لە نێو خودی خۆی دایە. ئەم بابەتە کاتێ زیاتر ڕوون دەبێتەوە کە سووڕی چالاکی ڕۆژانەی کەلتورێکی وەك کەلتوری کۆنگ لەگەڵ ژیانی شارێکی ڕۆژئاواییدا بەراورد بکرێ. هەروەك باسمان کردووە ئێمە لە کۆمەڵگەکانی ئەم سەردەمەدا بەردەوام لەگەڵ نامۆکاندا پێوەندیمان هەیە. لە راستیدا زاراوەی غەریب (نامۆ) وەك جاران سەرنجڕاکێش نییە. غەریب لە راستیدا کەسێکی غەریب بوو کە لە دەرەوە دەهات. ئەوانەی کە ئەمڕۆ لە شارێکدا دەژین، هەمیشە لەگەڵ کەسانێکدا پێوەندی دەگرن کە بە باشی نایاننناسن. لە هەلومەرجی وادا، سنوورەکانی نێوان کارلێکی چەقنەبەستوو چەقبەستو زیاتر دەچنە نێو یەکتر. کەسێکی شارنشین ناچارە بەردەوام لەگەڵ کەسانێکدا کە پێشتر نەیدیون، ڕووبەڕوو بێتەوەو تێپەڕێ.

خوێندنەوە سنووردارەکان، بە نۆبەی خۆیان بۆ ڕوونکردنەوەی مۆدێلە سروشتییە گشتیەکان کارێکی پێویستە. کارلێك بێ لەبەرچاوگرتنی رادەی گەورەو بچووکییەکەی، بە شێوەیەکی ڕوون

بناخەی سەرەکی هەموو ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتییە. گریمان توێژینەوە لە سەر کۆمپانیایەکی گەورەی بازرگانی ئەنجام دەدەین. بەشێکی زۆر لە چالاکیەکانی کۆمپانیاکە بە پێی ڕەفتاری دوولایەنە دەخوێنرێتەوە. بۆ نموونە، دەتوانین کارلێکی بەڕیوەبەرەکان لە ژووری بەڕێوەبەریدا، یان هی ئەو کەسانەی کە لە ئیدارە جۆراوجۆرەکاندا کار دەکەن، یان کرێکارانی فابریکەیەك شرۆڤە بکەین. ئێمە بەم شێوەیە وێنەیەکی گشتی لە کۆمپانیا نادەین بە دەستەوە، چونکە بەشێکی زۆر لە پێوەندییەکان، پێوەندی ڕاستەوخۆی نێوان تاکەکان نییە. لە ڕێگای چاپەمەنییەکان، نامەکان، تەلەفۆن و کۆمپیوتەرەوە، بەشێکی زۆر لە پێوەندییەکان لە حاڵەتی بێ واسیتەبوونی کارلێکی شەخسی دەچنە دەر. بەمجۆرە بێگومان دەتوانین بە شێوەیەکی بەرچاو یارمەتی بە تێگەیشتنی چۆنیەتی فۆنکسیون ( ئەرك)ی ڕێکخراو بدەین.

## پوختەی باسەکان

1. ئەگەر لە نزیکەوە لێکۆڵینەوە لە سەر بەشێکی زۆر لەو لایەنە بە ڕواڵەت کەمبایەخانەی ڕەفتاری ڕۆژانەمان ئەنجام بدەین، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەمانە چەند لایەنێکی گرنگ و ئاڵۆزی کارلیَکی کۆمەڵایەتین. نموونەیەکی، چاوتێبڕینە – واتە تەماشاکردنی کەسانیتر. لە زۆربەی کارلێکە کۆمەڵایەتییەکاندا، نیگاکان تا ڕادەیەك تیژتێپەڕن. چاوتێبڕین لە کەسێك ڕەنگە بە مانای دوژمنایەتی – یان، هەندێجار ئەویندارى – لێك بدرێتەوە. خوێندنەوەی کارلێکی کۆمەڵایەتی یەکێك لە بوارە بنەڕەتییەکانی خوێندنەوەی کۆمەڵناسانەیە کە زۆر لایەنی ژیانی کۆمەڵایەتی ڕوون دەکاتەوە.

2. ڕوخساری مرۆڤ حاڵەتی جۆراوجۆر نیشان دەدا. زۆرکەس پێیان وایە کە لایەنە بنەڕەتییەکانی دەربڕینی هەست لە ڕوخساردا شتێکی زاتییە. توێژینەوە بەراوردکارییەکانی نێوان کەلتورەکان، چ لە ڕووی حاڵەتی ڕوخسارو چ لە ڕووی لێکدانەوەی ئەو هەستانەوە کە لە ڕوخساردا دەردەکەون، لێکچوونی ئێجگار زۆر لە نێوان کەلتوورەکاندا دەسەلمێنن.

3. لە مانایەکی بەربڵاوتردا دەتوانین وا تێبگەین کە ڕوخسار، ئاماژە بە ڕێزدانان بۆ کەسانیتر دەکا. بە گشتی ئێمە لە کارلێکی کۆمەڵایەتیدا، بایەخ بە پاراستنی ئابڕووی خۆمان– عیزەتی نەفسی خۆمان – دەدەین.

4. خوێندنەوەی گفتوگۆو قسەکردنی ئاسایی، پێی دەوترێ میتۆدۆلۆژیای کۆمەڵایەتی. ئەم زاراوەیە بۆ یەکەمجار لە لایەن هارولد گارفینکلەوە داهێنرا. میتودۆلۆژیای کۆمەڵایەتی بریتییە لەو میتۆدانەی کە ئێمە لە ڕێگایانەوە بە شێوەی چالاکانە بە پێی ڕەفتارو وتەکانی کەسانیتر پەی بە مەبەستەکانیان دەبەین.

5. بە خوێندنەوەی "هاواری پەرچەکردارانە" هەڵە زمانییەکان دەتوانین زۆر شت لە سەر مەغزای قسەکان بزانین. زۆرجار هەڵە زمانییەکان پێکەنیناوین و لە ڕاستیدا لە باری دەروونییەوە پێوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ قسەی خۆش و گاڵتەکردندا هەیە.

6. کارلێکی چەقنەبەستوو، مانای ئەوەیە کە تاکەکان لە نێو کۆمەڵە گەورەکاندا، کاتێ کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ یەك نادوێن، بە تەواوی ئاگایان لە

یەکترە. کارلێکی چەقبەستوو، کە دەتوانێ دابەش ببێتە سەر پێوەندی جیاواز – یان قۆناغەکانی تایبەتی کارلێك – لە شوێنێکدا روو دەدا کە دوو کەس یان زیاتر راستەوخۆ لەگەڵ یەکتردا قسە بکەن.

7. زۆرجار دەتوانین کارلێکی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی رۆشنگەرانەو لە رێگای مۆدێلی شانۆییەوە بخوێنینەوە – واتە خوێندنەوەی کارلێکی کۆمەڵایەتی بەو شێوەیە کە گوایە ئەوانەی تێدا بەشدارن، ئاکتەری شانۆنو لە سەر تەختەی شانۆداو بە هەموو کەرەستەیەکی شانۆی راستەقینەوە ئامادەییان هەیە. راست وەك شانۆییەك، کە لە بەستێنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا بە گشتی جیاوازییەکی زەق لە نێوان پێشپەردە (دیمەنی دیار)و پشتی پەردە (دیمەنی شاراوە) واتە ئەو شوێنەی کە ئەکتەرەکان خۆیان بۆ نمایشکردن ئامادە دەکەنو تێیدا پشوو دەدەن، دەبینرێن.

8. تەواوی کارلێکە کۆمەلایەتییەکان لە کاتو شوێندا روو دەدەن. لە رێگای لێکۆڵینەوەکردن لە سەر چۆنیەتی روودانی چالاکییەکان لە کاتە دیاریکراوەکانو هەروەها لە شوێنەکاندا، دەتوانین چۆنیەتی پۆلینکردنی ژیانی رۆژانەمان بە پێی کاتو شوێن شرۆڤە بکەین. جوگرافیای کات، ئامرازێکە بۆ لێکۆڵینەوەی راستەقینە لە سەر ئەم بوارە.

9. خوێندنەوەی کارلێکی کۆمەڵایەتی بە گشتی بە کۆمەڵناسی سنووردار ناودەبرێ. شیکردنەوەی وردو درشت لە راستیدا پێوەندیەکی زۆر نزیکیان لەگەڵ یەکدا هەیەو تەواوکەری یەکترن.

### سەرچاوە

پاژێك لە کتێبی "کۆمەڵناسی" ئانتۆنی گیدنز

# ئیمانۆیل کانت

**هاشم سالح**

**له عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**

کێ لە ئێمە خەون بەوەوە نابینێت کە ڕۆژێك بێت وڵاتەکەمان ببێتە وڵاتێکی ئازاد و دیموکراسی و پێشکەوتوو؟ کێ ئاواتەخوازنییە کە وڵات خاڵی بێت لە ستەمی سیاسی و دەمارگیری ئایینی و گەندەڵی ئابووری؟ ئایا ئێمە و مانانێك کە لە خۆرئاوا دەژین، پێنج دەقە لێرە دەماینەوە، گەر ئازادی و ڕێزی مرۆڤ و دەوڵەتی یاسا لە وڵاتەکانی خۆمان هەبوایە؟ بۆ ئەوەی لەو ماجەرایە تێبگەین کە ئێستا لە دەورمان ڕودەدات، پێویستە دووسەد ساڵێك بگەڕێینەوە بۆ دواوە، بۆ ئەوەی خۆمان بخەینە ئەو شوێنەی کە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری ئەوروپی تێدابوون. ئەوانیش لەو سەردەمەدا هەمان ئەو خەونانەیان هەبووە کە ئەمڕۆ ئێمەی دەیبینین. وڵاتانی ئەوانیش لەو قۆناغەدا پڕی بووە لە کێشە و جەنگی ناوخۆیی و دەمارگیری ئایینی و مەزهەبی و بەشی زۆری هاوڵاتیانیش هەژار و نەداربوون. هاوکات ستەمکاری سیاسی بڕستی لە بەربڕی بوون، بیریاران بەهۆی لە چاپدانی کتێبێکەوە دووچاری ڕاوەدونان و سەرکوتکردن دەبوونەوە! پیاوانی ئایینی دەستیان خستبووە بینی خەڵکەوە، بەڵام هەنوکە وڵاتەکانیان بۆتە فیردەوسی یەزدان لەسەر زەوی. گەربێتو "کانت" یان "جان جاك ڕۆسۆ" یاخود "ڤۆڵتێر"، زیندوبنەوە و سەرێ لە گۆڕەکانیانەوە بێننە دەرێ، ئەوا بێگومان دڵخۆش دەبن و بەختەوەرییەکی زۆر دایاندەگرێت، چونکە دەبینن بۆچونەکانیان لەسەر زەمینەی واقیع هاتۆتە دی.

وەکو دەزانرێت "کانت" کە بە مامۆستای خۆرئاوا و ترۆپکی ئەقلانییەت و ڕۆشنگەری دەدرێتە قەڵەم، بە شێوەیەکی توندو تۆڵ هەریەك لە سیاسەت و مۆراڵی پێکەوە گرێدابوو. لەم کارەشیدا تەواو پێچەوانەی "ماکیاڤیللی" بوو کە ئەو دوو کایەیەی لە یەکدی جیاکردبوەوەو پێیوابوو ئامانج پاساوی ئامراز دەداتەوە و مۆراڵ شتێکە و سیاسەتیش شتێکە. "کانت" سەرەڕای میسالیەت و ئەو مەیلە مۆراڵیە باڵایەی ساویلکە نەبوو، بەڵکو دەیزانی هەق بەبێ هێز مانای نییەو تەنانەت پاساو بۆ جەنگیش دێنێتەوە، بەڵام بەومەرجەی ببێتە

مایەی بڵاوکردنەوەی ئازادی و ئایدیای پێشکەوتنو چەسپاندنی دەستوری مەدەنی لە ناو مرۆڤایەتیدا. سەبارەت بە سروشتی مرۆڤایەتی، "کانت" گەشبین بوو، پێیوابوو بە بەردەوامی بەرەو پێشدەچین و ڕۆژێك دێت دەگەینە جیهانێك کە پڕی بێت لە ئاشتی و لەسەر ماف و دادپەروەری و یاسای نێو دەوڵەتی دامەزرابێت. تەنانەت ئەو پێی وابوو ئاشتیەکی هەمیشەیی سەرتاسەری لە نێوان نەتەوەکاندا مەحاڵ نییە، بەمەرجێك ڕوناکی مەعریفە بگاتە تەواوی مرۆڤایەتی و تەنها لە ئەوروپادا قەتیس نەبێت. ئەو بەو پێیەی دیدگایەکی فەلسەفی دوور مەودای هەبوو، توانای پێشبینی ئەو شتانە بکات کە لە سەدەکانی دواترداڕوودەدەن، بۆ نمونە بۆچونێکی دەربارەی نەتەوە یەکگرتووەکان پێشکەشکرد، تەنانەت بە دوو سەد ساڵ بەر لە دامەزراندنی! گەورە فەیلەسوفەکان مەزنیان لەوەدایە کە دەتوانن پێشبینی ڕوداوەکانی ئاییندە بکەن.

"کانت" بەردەوام تەئکیدی دەکردەوە لەوەی دەبێت ڕۆژێك بێت سەردەمی بەربەریەت و دڕندایەتی کۆتایی بێت، ئەویش دوای ئەوەی شارستانیەت سەردەکەوێت و ڕوناکی خۆی بەسەر تەواوی جیهاندا پەخشدەکات.. ئەگەر سەرنج لە ئەوروپای ئێستا بدەین، دەبینین بەرەو یەکیەتی و بە ئەنجام گەیاندنی گەورەترین پەیجوری سیاسی لەسەردەمی مۆدێرندا دەچێت، ئەمەش مانای وایە پرۆژە فیکرییەکەی لانی کەمی بە ئەنجام گەیشتووە. ئەوەی ماوە ئەوەیە وا بکەین ئەم پرۆژە شارستانیە پەلبکێشێت و نەك ئەوروپا خۆرئاوا بە تەنها، بەڵکو تەواوی میللەتانی دنیا بگرێتەوە. ئەو کات سەرجەم مرۆڤایەتی لەبەرهەمی ئازادی و دیموکراسی و پێشکەوتن بەهرەمەند دەبن. ئەڵبەتە ئەمە خەونێکە وا زوو نایەتەدی، بەڵام ڕەنگە ڕۆژێ بێت و جێبەجێ ببێت.

"کانت" پرۆژە سیاسیەکەی لەسەر چوار بنەما دارشتبوو:

**یەکەم/** ئاشتی هەمیشەیی لە نێوان نەتەوەکاندا، لە ئەنجامی ئەو پەیوەندییە سروشتیانەدادێتە بەرهەم کە لە نێوان وڵاتە دیموکراسیەکان (یان لە نێوان وڵاتە کۆمارییەکاندا بە تەعبیری ئەوسەردەمە) دروست دەبێت. لێرەدا مەبەست لە دەوڵەتی کۆماری ئەو سستەمە سیاسیەیە کە لەسەر یاسا و دەستوری مەدەنی و پابەندبوون بە فەلسەفەی مافی مرۆڤ و هاوڵاتی، دادەمەزرێت.

**دووەم/** ڕۆژبە ڕۆژ ژمارەی وڵاتانی دیموکراسی زیاد دەکات، تاوای لێدێت هەموو نەتەوەکان دەگرێتەوە.

**سێیەم/** ئەو دەوڵەتانەی لەسەر بنەمای دیالۆگی دیموکراسی و ئازادی و ئیرادەی گەل دروست بوون، زیاتر حەزیان بە پەیوەندی دۆستانەیە لەگەڵ دراوسێکانیاندا نەك شەڕ و ئاژاوە.

**چوارەم/** وڵاتانی دیموکراسی بەلای ئەوەدا ناچن کە پەیوەندی دۆستانەیان لەگەڵ وڵاتانی تۆتالیتاری و ئسولێدا هەبێت، لەبەرئەوەی ئەمجۆرە دەوڵەتانە زمانی دیالۆگ نازانن و ئەوەی پێی ڕاهاتوون زمانی لێدانو سەرکوتکردنو بەربەریەتە.

بەڵام با بزانین کێ ئەم بەرنامە فەلسەفیە دانسقەیەی "ئیمانوێل کانت"ی جێبەجێکرد؟ ڕەنگە خوێنەر بەلایەوە سەیر بێت گەرپێی بڵێم کە سەرۆکەکانی ئەمریکا یەکەمین کەس بوون بە جدی بیریان لەوە کردۆتەوە. بۆ نمونە دەکرێت لێرەدا ناوی "دوردرۆ ویلسۆن" بهێنین کە بیست و

هەشتەمین سەرۆکی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو (1913–1921). ئەم پیاوە کە بۆ خۆی مامۆستای زانکۆ بوو، تەنانەت بەر لەوەشی تێکەلّ بە دنیای سیاسەت بێت و بگاتە لوتکە، سەرۆکی زانکۆی برنستۆن بوو، هەروەها خوێندکاری فەیلەسوفی ئەلّەمانی "کانت" بوو. "ویلّسۆن" ئەو کەسە بوو کە دەستبەجێ دوای کۆتایهاتنی جەنگی جیهانی یەکەم کۆمەلّەی نەتەوەکانی پێکهێنا، لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەی نێوان میللەتان بە گەڕانەوە بۆ یاسای نێو دەولّەتی، نەك چارەسەر کردنیان بە چەك و بەزەبری هێز.

بێگومان لەو کاتەدا ئەوە بیرۆکەیەکی تەواو شۆڕشگێڕانە بوو کە باوەڕت هەبێت بەوەی دەکرێت سستمێکی جیهانی دابمەزرێندرێت، لەسەر بنەمای شتێك دوور لە هێز و هاوکێشەکانی هێز. ئەم سەرۆکە مەزنە خێر و چاکەی بۆ تەواوی مرۆڤایەتی دەخواست، نەك تەنها بۆ ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. هاوکات پێیوابوو دەکرێت مۆراڵ و سیاسەت ئاشتبکرێنەوە و ئەمەشی بەکارێکی پێویست دەزانی، لەبەر ئەوەی سیاسەت بێ مۆراڵ مانایەکی نییە. بۆ نمونە دەلّێت: (سەردەمەکەمان پێویستی بە سستمێکی ترە بۆ شتەکان. ئەم سستمەیش پێوەرەکەی پرسیارگەلێکی لەم جۆرە دەبێت: ئایا ئەمە هەقە؟ ئایا ئەمە چاکە؟ ئایا ئەمە ڕەوایە؟ پاشان ئایا ئەمە لەبەرژەوەندی تەواوای مرۆڤایەتیدایە؟).

"دودرۆ ویلّسۆن" وەکو "کانت" لە بنەمالّەیەکی مەسیحی پرۆتستانت مەزهەب بوو، سەرشار بوو بە مۆرالّی لۆسەری، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ "مارتن لۆسەر" کە لە سەدەی شازدەهەمدا بەدەرکەوت و زەمینەی بۆ بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئایینی لە ئەوروپادا خۆشکرد. مۆرالّی لۆسەری مۆرالّێکی زۆر توند و تۆلّە و سازش لەسەر پرانسیپی هەق و ڕاستگۆی و دلّسۆزی لە کار و جێبەجێکردنی ئەرکەکاندا ناکات. مرۆڤ بۆ ئەوەی لە مە دلّنیابێت، ئەوەندەی بەسە کە ماوەیەکی کەم لە ولاّتانی باکوری ئەوروپای پرۆتستانی وەك: (ئەلّەمانیا و هۆلّەندا و سوید و.. هتد) بژی.

لێرەوە دەتوانین بلّێین گەر ئەمریکا شتێکی ئیجابی بەخشیبێتە جیهان، ئەوا بێگومان ئەمەیە. بەلاّم ئەلّبەتە ئەمریکا جگە لەمە ڕوویەکی دیکەشی هەیە، مەبەستم ڕووی "کیسنجەر و نیکسۆن" و کەسانی دیکەی پراگماتی و ماکیاڤیللیزمی وەك ئەوانن، کە کۆلەوە ناکەنەوە هەرچی شتێك هەیە بە کاری بهێنن لە پێناو گەیشتن بەوەی خواستیانە. واتە لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکادا لایەنی ڕوناك و لایەنی تاریك هەیە. سیاسەتێکی واقعیان هەیە کە زۆر دزێوەو شێوازی نهێنی و ژێر بەژێر بەکاردێنێت، بە مەبەستی ئەنجامدانی کۆدێتاکردن لە ولاّتانی ئەمریکای لاتین و ولاّتانی دیکەی دنیا. بەلاّم هەلّەیە گەر هەر ئەم ڕووەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا ببینین و ڕووەکەی تری ئومەی ئەمریکی فەرامۆش بکەین، کە ڕوویەکی مۆڕالّییە و پڕ ئومێدە. با جارێکی دی گوێ بگرین بۆ سەرۆك "ویلّسۆن": (پرانسیپێکی سەرەکی هەیە کە ئاڕاستەی تەواوی کار و سیاسەتەکانم دەکات، ئەویش پرانسیپی هەق و یەکسانییە بۆ سەرجەم گەل و نەتەوەکان. مەبەستم ئەوەیە مافی خۆیانە لە کەشێکی ئازاد و بەشێوەیەکی یەکسان، بە ئاشتی لەگەلّ یەکتریدا بژین، ئیتر ئەگەر لاوازبن یان بەهێز، ئەگەر ئەم پرانسیپە پێشێلکرا، نەعەدالەتی گەردوونی ڕودەدات و نە بەردەوامیش دەبێت. پێویستە میللەتی ئەمریکاش لەم پرانسیپە مۆرالّیە لانەدات و ئامادەش بێت قوربانی بە ژیان و

شەرەفو هەموو ئەو شتانەی هەیەتی بیدات، لە پێناو بەرگریکردن لەم پرانسیپە!).

کێ لە باریدایە قسە لەمە چاکتر بکات؟ یاخود سەرۆکی چ دەوڵەتێك دەتوانێت لەو دوورتر بڕوات؟ ئێمە لێرەدا ئاشتبوونەوەی گەورەی نێوان مۆراڵ و سیاسەت نابینین؟ ئێمەی بێدەسەڵاتانی سەر ئەم زەمینە لەمە زیاتر شتێکی دیکەمان دەوێت؟ بەداخەوە سیاسەتی ئەمریکی بەردەوام کاری بەم پرانسیپانەی "ویڵسۆن"ی مەزن نەکردووەو زیاد لە جارێك لە ڕاستە ڕێگا لای داوە، بەڵام ئەمە بەو مانایە نایەت کە بەردەوام بەدو و خراپ بووە، وەکو دیماگۆگی و هەڵوەڕەکانی جیهانی عەرەبی و ئیسلامی پێیان وایە، ئەوانەی تەقینەوەکانی نیویۆرك و واشنتۆن و دورگەی بالی لە ئەندۆنیسیا وڕیاز و دارلبەیزا، لەلایەن توندڕەوە تیرۆریستەکانەوە، بە کارێکی ڕەوا دەزانن. ئەوانە پێیان وایە تیرۆرستەکان مافی خۆیانە ئۆتۆمۆبیلە مینڕێژکراوەکانیان بە هاوڵاتیانی عێراقدا بتەقێننەوە، هەر لە نەجەفەوە بۆ هەولێر و فەلوجەو بەغدا و لە پای ئەم کارەشیاندا دەبێت ئافەرینیان بکەین، لەبەرئەوەی ئەوانە هێزی مقاوەمەن دژ بە داگیرکاران! ئیتر بزانن ئەم مقاوەمەیە چەند (مەزنە!).. بێگومان وەڵامی "جۆرج دەبلیو بۆش" بۆ ئەو تاوانبارانە، وەڵامێکی توند و بەهێزبوو. بەڵام ئایا هەر بە تەنها وەڵامی سەربازی بەسە، بێئەوەی هاوشان بێت بە سیاسەتێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و کلتوری پڕاوپڕ و هەماهەنگی لەگەڵ جیهانی ئیسلامیدا بکات بەشێوەیەکی گشتی؟

لێرەدا "جۆن کێری" دێتە ئاراو هەندێك بیروبۆچونی نوێ پێشنیار دەکات کە ئەوە دەهێنێت گرنگی پێبدرێت. بۆ نمونە ئەو پێیوایە جیهانی عەرەبی هەر لە مەراکیشەوە تا عێراق موبتەلای قەیرانی ئابووری و دۆگمای فیکری و هەژارییەکی بێئەندازەیە، هاوکات بە دەست تەقینەوەیەکی دیمۆگرافییەوە دەناڵێنێت، لەگەڵ داخرانی تەواوی هەموو ئاسۆیەك لە بەردەم دەرفەتی کارکردن و تەوزیفبوندا. بەمجۆرە هەموو ئەو ڕەگەزانە لە ئارەدان کە زەمینەی تیرۆر و توندڕەوی خۆشدەکەن.. واتە "کێری" بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆرستان وەکو "بوش" هەر بە تەنها لەسەری تیرۆر نادات، بەڵکو لە ڕەگو ڕیشەوە چارەسەری کێشەکە دەکات. "کێری" بەلایەوە سەیرە کە چۆن 60٪ ژنانی وڵاتانی عەرەبی نەخوێندەوارن، هەروەها سەری سوڕدەمێنێ لەوەی چۆن بەر لە سی ساڵ میسر و کۆریای باشوور لە ڕووی گەشەکردنەوە یەکسان و چون یەکبوون، بەڵام کوریای باشور لە ڕووی ئابورییەوە هەنگاوی گەورەی ناو، لە ئێستادا کێبڕکێ لەگەڵ وڵاتانی پیشەسازی خۆرئاوادا دەکات، ئەمە لە کاتێکدا میسر تا ئێستاش لە شوێنی خۆیدا دێت و دەچێت.. هاوکات ئەوەش بۆ ئەو شوێن پرسیارە کە چۆن جیهانی ئیسلامی، ئەو جیهانەی یەك لەسەر چواری دانیشتوانی دنیا (ملیارێكو سێسەد ملیۆن) پێکدێنێت، بەشداریکردنی لە ئابووری جیهانیدا تەنها لەسەدا چوار یان لە سەدا پێنج دەبێت!

هەموو ئەم پێدراوانە پێویستە بە هێند وەربگیرێت، تا تێبگەین بۆچی بزاوتە توندڕەوەکان و دەمارگیری لە جیهانی ئیسلامیدا لە هەڵکشاندایە. پێویستە لێرەدا هۆکاری ڕۆشنبیریش سەرباری هۆکارەکانی پێشو بخەین و باس لە ڕادەی هەژاری کتێبخانەی عەرەبی بکەین کە چەند بێبەشە لە سەرەچاوەی زانستی و فەلسەفی. بێگومان ئەو سەرچاوانە دەتوانن جیهانبینیەکی نوێ بێننە ئارا، لە بەرامبەر ئەو جیهانبینیە ئسوڵیەی لە ڕووی

مێژووییەوە باڵا دەستە. کەواتە دەبێت لەسەر زیاد لە ئاستێك قوڵی لێهەڵماڵین، تا کارەکانمان سەرکەوتووبێت و بەرهەم بدات. ئەمەش پرۆسەیەکی دژوار و درێژخایەنە و ئاکامیشی نادیارە. من لای خۆمەوە لایەنی فیکری بە ڕادەی گەشەی ئابووری و چاکترکردنی گوزەرانی خەڵك بە گرنگ دەزانم. بۆ دەرچوون لەو قەیرانە کوشندەیەی تێیکەوتوین، بیریاری میسری "سید القمنی" پێشنیار دەکات کار بە میتۆدە زانستیە مۆدێرنەکان بکەین، ئەمەش بۆ خۆی هەڵوێستی مرۆڤێکی دەروەست و خەمخۆرە. بەڵام ئەمە دەتوانێت لە بەرامبەر لێشاوی ئەو وتارە نابیناو فۆبیا ئامێزانەدا چی بکات کە لایەنگرانی ئایدیۆلۆژیای تەقلیدی ڕەواجی پێدەدەن؟

دەتوانین چیبکەین لە بەرامبەر ئەو گوتارە دەستەجەمعیە بێئامانەی دروشمی: مەرگ بۆ ئەمریکا و نەفرەت لە ئەمریکا و بڕوخێ ئەمریکا دەڵێتەوە؟! ئایا ئەوانە دەزانن کە تەواوی ئەو دۆزینەوە زانستیانەی لەسەرجەم بوارەکاندا دەکرێت، لە ئەمریکادا ئەنجام دەدرێت؟ لەوە بە ئاگان کە ئازادی ویژدان و بیروڕاو قسەکردن لە ئەمریکا و هەموو وڵاتنی ئەوروپیدا مسۆگەرە؟ ئەوانە دەزانن بۆ ماوەی چوار سەدەیە (ڕۆح) لە ئەوروپادا بارگەی خستووەو هەشت سەدەشە سەرزەمینی وڵاتانی ئێمەی جێهێشتووە؟ لێرەدا کە باس لە (ڕۆح) دەکەم، بە مانا هیگڵیەکەی باس دەکەم، کە مەبەست لێی: شارستانی و فیکر و باهۆزی ئازادییە.

**سەرچاوە**

www.assuaal.com

# بەرەو فەلسەفەی لێکبوردن

**ڕامین جەهانبەگلو**

**لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی**

لێکبوردن لەفەلسەفەی هاوچەرخدا چەمکێکی گرنگە و کارپێکردنی بە بەشێکی بنیاتنەری کۆمەڵگا لیبراڵ و فرەگەرا (پلوڕاڵ)ەکان دەژمێردرێ. کەواتە لەدونیای ئێمەدا لێکبوردن بووە بەمەسەلەیەکی گرنگ. بەڵام لەکولتوورە هاوچەرخەکاندا هیچ جۆرە ڕێککەوتنێکی گشتی لەسەر شێوە و ناوەڕۆکی لێکبوردن نییە. مانا و بنەما و سنوورەکانی لێکبووردن لە کولتوورە جیاوازەکاندا مایەی بیروبۆچوونی جیاواز و باس و خواسی ئایدیۆلۆژییە. خۆشبەختانە فەیلەسووفانی سیاسی بەگێڕانی ڕۆڵێکی گرنك لەبیرکردنەوەیاندا سەبارەت بەچەمکی لێکبوردن لەم سێ سەد ساڵەی دواییدا هەوڵیانداوە ئەم باس و خواسانە یەکلا بکەنەوە. ئەمەش نەك هەر بووتە مایەی ڕەتکردنەوەی تیۆرەدرۆزنەکان، بەڵکو بەیارمەتی بیروبۆچوونەکانی ئێمەش سەبارەت بەلێکبووردن ڕوونیش بوونەتەوە. فەلسەفەی سیاسی توانای ئەوەی بەئێمە بەخشیوە پەی بەوە بەرین کەمەرجی بڕیاری سیاسی تێگەیشتنێکی ڕوونە لەماهیەتی لێکبوردن و چۆنێتی کارپێکردنی. جگە لەوە پێویستە لەوە تێبگەین کەهەرچۆن سیاسەت بریتییە لە هونەری ڕێکخستنی کۆمەڵگا، بەم پێیە بەبێ چەمکی تەوەرییانەی لێکبوردن هیچ چوارچێوەیەکی گشتیی دیموکراتی ڕاستەقینە بوونی نییە.

ئەکرێ بڵێین ئەم چەمکە تەوەرییەی لێکبوردن دوو تایبەتمەندیی هەیە. تایبەتمەندیی یەکەم بریتییە لە توانای ڕەتکردنەوەی دەستێوەردانی زۆر لەو کاروکردەوانەی کەمایەی پەسەندکردنی ئێمە نین. دووەمیشیان لەسەر بنەمای ئەم دەستێوەرنەدا نەیە.

زۆر هۆ بۆ دەستێوەردان هەن (لەوانە ترس) کەلەگەڵ گەوهەری ئەخلاقیی لێکبوردندا بەو پێیەی ڕێزگرتنە لەتاکەکانی دی، جیاوازییەکی بنەڕەتیان هەیە. ڕێزگرتن لەوانی دی شێوازێکە بۆ لەبەرچاوگرتنی ئەوان بەو سیفەتەی بکەری

ئەخلاقیی سەربەخۆو هۆشمەندن. لەڕاستیدا، ڕێزگرتن لەوانی دی لێکبوردن وەك مافێكی ئەخلاقی ئەخاتە ڕوو كە پێویستە بەهەموو كەسێك ببەخشرێ، لەبەرئەوەی مرۆڤن.

لێکبوردن دان بەوەدا دەنێت کەکەسە جیاوازەکان تێڕوانینی جیاوازیان بۆ ژیانێکی باش هەیە و خوازیای ئەوەن کەلەڕووی سیاسی و ئەخلاقییەوە بەهایان بۆ دابنرێ و ڕێزیان لێ بگیرێ کردەوەی ڕێزگرتن لەوانی دی یارمەتیمان ئەدات کەلە بیرکردنەوەماندا لەسنوورەکانی لێکبوردن، مافی لێکبوردن بەو کەسانە ڕەوانەبینسن کەڕێزی لێ ناگرن. بەم پێیە ئێمە ناتوانین لەکەسێك ببورین کەوشەگەلێك بەکاردەبات لەخشتەبەر و توندوتیژن و ناکرێ ئازادیی لەقسەدا پێ ڕەوا ببینرێ. بەڵام نابێ هەرگیز ئەوەمان لەبیر بچێت کەلێکبوردن لەمەسەلەیەکی تایبەتدا بەمانی لێکبوردن لەبیروباوەر و کاروکردەوە یەکدایە کەئێمە بەو پێیەی بەهەڵەو ناپەسندیان ئەزانین، ڕەتیان دەکەینەوە، ئەگینا بەدەر لەمە هیچ پێویستی بەلەبەرچاوگرتنی لێکبوردن ناکات.

ئەمە بەو مانایە نایەت کەئێمە ناچارین باوەڕبەوە بهێنین کەئەو بیروباوەڕ و کاروکردەوانە ڕاست و دروستن. ئێمە تەحەموولیان ئەکەین لەبەرئەوەی هەڵەن: بەو مانایەی کەلەگەڵ تێروانینی ئێمەدا بۆ حەقیقەت وێکنایەنەوە. پاشان گەر وادابنێین کەتاقە حەقیەقتێك یان کۆمەڵێك حەقیقەت لەکۆمەڵگایەکدا باڵادەستە، ئەوکات هۆکارێك نییە بۆ لێکبوردن و ڕێزگرتن لەو کەسانەی کەڵەگەڵ ئەو حەقیقەتەدا تەبانین و، لەئەنجامیشدا، تاقەڕێگایەکی حەتمی کۆتکردن یان لەناوبردنی ئەوی ترە. بەم پێیە، لێکبوردن واتە ڕاگرتنی هاوسەنگی لەنێوان بەهاو بنەما و حەقیەقتەکانی خۆمان و تەحەمولکردنی ئەوانیتر کەهەڵگری بیروباوەڕێ جیاوازن. بەواتایەکی دی، قبووڵکردنی لێکبوردن وەك بەهایەکی ئەخلاقی و سیاسی پۆزەتیڤ، واتە توانای پێکەوە ژیان لەگەڵ ئەوانیتردا و بەشداریکردن لەگریمانەی بنەڕەتیی لیبراڵیزمی سیاسیدا، کەسەربەخۆیی تاکەکەس ئەنجامی جیاوازی و دژایەتی ئەم لایەنە باشانە و ئامانجەکانە.

ئەمەش بە مانایە دێت کەلێکبوردن زۆرباش لەگەڵ ئەو نەریتەی هزری سیاسیدا تەبایە کەکۆت و پێوەند بۆ ئازادی دانانێت. هەر لەبەرئەمەشە کەپارێزەران و ڕەخنەگرانی دیاردەی لێکبوردن، وەکو توخمێکی سەرەکیی نەریتی لیبراڵ سەیری لێکبوردن ئەکەن.

جۆن ڕاولز لەدواکتێبیدا ((لیبراڵیزمی سیاسی)) ئەوە دەستنیشان دەکات کە : ((سەرچاوەی مێژوویی لیبراڵیزمی سیاسی.. قۆناغی ڕیفۆرمی ئایینی و دەرەنجامەکانێتی، لەگەڵ ئەو مشتومڕە زۆرانەی کەلەسەر لێکبوردنی ئایینی ئەکرا لەسەدەکانی 16 و 17 دا)).

ئەوشتەی کەڕاولز لەم کتێبەدا ئەیخاتە ڕوو ڕەوتێکە کەتیایدا بەها لیبراڵەکانی ڕاوڵز لەنێویشیاندا لێکبوردن و سەربەخۆیی، تەنها لەبەرخودی خۆیان پەسەند کراون. ڕاولز بڕوای وایە کەخەڵك ئامادەگیی ئەوەیان تیایە کەبەمەبەستی پێکەوە ژیان لەگەڵ کەسانی تردا خۆیان بەپرنسیپی لێبوردنەوە ببەستنەوە. تێوەرکەی راولز سەبارەت بەلێکبوردن ئاراستەی

خەڵكانێك كراوە كە دەیانەوێ چ خۆیان و چ ئەوانیتر بەئەندامی ئازاد یەكسان كۆمەڵگایەك بزانن كەتیایدا هەموو كەسێك دەتوانێ بیروبۆچوونە گشتگیرەكانی خۆی سەبارەت بەژیانێكی باش لەسای بەرگریلێكردنی یاساییدا دەرببڕێت و بەهەمان ڕادەی ئەوانیتر هەلی سەركەوتنی بۆ بڕەخسێت.

تێوەرەكەی راوڵز دەربارەی لێكبوردن یەكەمین بەرگریكردنی لیبڕاڵیانە نىیە كە بۆ بەرگریكردن لەبیروبۆچونی گشتگیر بەڵام هاودژ خراوەتە ڕوو. یەكەمین هەوڵی بنەڕەتی بۆ هێنانەدیی بنەمایەكی فەلسەفی بۆ لێكبوردن لەلایەن بیرمەندێكی تری لیبراڵەوە خرایەڕوو كەناوی جۆن لۆك بوو. كارە بەناو بانگەكەی لۆك كەناوی ((نامەیەك سەبارەت بە لێكبوردن))ە تاساڵی 1689 بلاو نەبووبۆوە، واتە ساڵێك بەر لەبڵاوكردنەوەی ((دوو وتار دەربارەی حكومەتی مەدەنی)) و ((نامەیەك سەبارەت بەتێگەیشتنی مرۆیی))، بەڵام مەسەلەی لێكبوردن ساڵانێك بوو لەناوچەقی بیریدا جێگیر بوو بوو. لەرأستیدا ئەو لەساڵی 1667دا و لەتەمەنی 35 ساڵیدا هێڵە سەرەكیەكانی تیۆرەكەی خۆی دەربارەی لێكبوردن دیاری كرد. لۆك كەلەدایكو باوكێكی پێوریتان بوو و خوێندن و پەروەردەبوونیشی لەئۆكسفۆرد هەر لەسەر شێوازی پێوریتانەكان بوو، لەئەنجامیشدا بووە هاوڕێی نووسەرێكی وەكو شڤیتزبریو، لەبنەرەتدا لەگەڵ تێڕوانینی ئەقڵگەرایانە و لێبوردانەی حیزبی ویگ*دا تەبابوو كە بەرامبەر بە دیكتاتۆریەتی دۆگماتیكییانەی حیزبی تۆری – كەلەلایەن كلێساشەوە بەرگریی لێ دەكرا – بەرهەڵستیی دەكرد. ساڵێك دوای بڵاوبوونەوەی یەكەمین ((نامە دەربارەی لێكبوردن)) لەساڵی 1689دا، جۆناس پرواست پێشنوێژ و تۆژەری زانكۆی ئۆكسفۆرد، وەڵامێكی دایەوە. لۆكیش بەدرێژایی دەهەیەك و بۆ وەڵامدانەوەی رەخنەكانی پراوست و بەتایبەتیش وەڵامی ئەو تۆمەتەی كە گوایە لێكبوردن بە بێباوەڕی و رێژەگەرایی ئەخلاقی ئەشكێتەوەو كۆمەڵێك تۆمەتی تریش، نامەی دووەم و سێیەم و چوارەمی بڵاوكردەوە.

لۆك لەم نامانەدا هەروەكو خۆی دەڵێت: ((سێ تێبینی)) بۆ بەرگریكردن لەلێكبوردن لەمەسەلە ئاینیىیە پەترییەكاندا ئەخاتە ڕوو. یەكەم تێبینی ئەوەیە كە هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نىیە ئەوە پیشان بدات كەخوا چاودێرێكردنی نەفسی مرۆڤەكانی بەقازییەكانی دادگا مەسیحیەكان سپاردووە.

دووەم تێبینی ئەوەیە كەئەم هێزە ناتوانێ بیروباوەرەكان ملكەچی خۆی بكات. سێیەمیش ئەوەیە كەلەحاڵەتێكدا ڕێ لەخەڵك بگیرێ كە جگە لەئایینی دەربار بەهیچ ڕێسایەكی ترەوە وابەستە نەبن، ئەویە ئومێدێك لەئارادا نابێت بۆ گەیشتن بەئایینێكی ڕاستەقینە.

ئەوەی لۆك دەیەوێت لەسێیەمین تێبینیدا بیخاتە ڕوو ئەوەیە كە گەیشتن بەحەقیقەتی ئایینی كارێكی دژوارە، لەبەرئەوەی ئەوشتەی لەرێی دەقە پیرۆزەكانی مەسیحیەتەوە پێی دەگەین بەتەنها بیرۆكەیەكە سەبارەت بەحەقیقەت، نەك خودی زانستەكە خۆی. بەبۆچوونی لۆك ئەم مەسەلەیە ئامارژەی سیاسیی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە و ئەویش ئەوەیە كە زۆرلێكردن و ناچاركردنی خەڵك

لەلایەن حکومەتەوە، بەوەی گوایە ئەمانە لە دەقە پیرۆزەکانەوە وەرگیراون، نایاسایین. کەواتە لەبەرئەوەی کەحکومەت رووبەرووی بیروباوەڕی جۆراوجۆر ئەبێتەوە و ئامرازێکی زانستی لەبەردەستدا نییە تا لەیەکتریان جیابکاتەوە، پێویستە لەسەری هەڵسوکەوتێکی لێبوردانە بگرێتەبەر. بەم پێیە لۆك لێکبوردن لە بێدەربەستی ئایینی جیادەکاتەوە. لۆك نەك هەر بەرگری لەهەموو جۆرەکانی بیروباوەڕی ئایینی دەکات، بەڵکو بەرگری لەمافی هەموو کەسێکیش دەکات بۆ حوکمدان لەم بوارەداو بەرگری لەخۆی دەکات.

لە((نامەکان))دا لۆك کۆمەڵێك بەڵگەو پاساوی جیاواز بۆ بەرگریکردن لەلێکبووردنی ئایینی ئەخاتە روو، لەوانە:

1-دادوەرە مەسیحیەکان ڕیاکارن، لەبەرئەوەی لەهەمان کاتدا کەلافی ئەوە لێدەدەن خوازیاری نزیککردنەوەی ئایینین لەسەر بنەمای ((خۆشەویستیی ڕۆحی مرۆڤەکان .. بەڵام خۆیان دوچاری گەندەڵی و کەلەڕەقی و کاری ناشرینی تری لەمجۆرەن)).

2-ئەم دادگاییانە نامەسیحین. مەسیحیەتی ڕاستەقینە پشت بەئیمانێك دەبەستێت کەسەرچاوەکەی ((عیشقە، نەك زۆرلێکردن)).

3-بووجەی زۆرلێکردن بۆ وابەستەبوون بەیەك ئایینەو، زۆر زیاترە لەبووجەی تەحەمولکردنی جۆراوجۆرێتی ئایینی، ئەم جۆراوجۆرێتییەش بەلێکبوردن ئەشکێتەوە، نەك زۆرلێکردن.

4-چەکەکانی حکومەت هیچ کاریگەرییەکیان لەبانگەشەکردن بۆ ئەو ئیمانە ئایینییە ڕاستەقینەیە نییە کەئیماندارە ڕاستەقینەکان بەدوویدا وێڵن.

لای لۆك و لای گەلێ لەلیبراڵەکانی دوای ئەو، لێکبووردن رێك لەبەر ئەنجامە سوودمەندەکانی شتێکی پەسەند کراوو خوازراوە. هەربۆیە نەغمەی قسەکردنی لۆك لەوتارەکەیدا سەبارەت بەلێکبوردن نەغمەی هەستێکی ئاسایی و ئەقڵێکی دروستە. کەلۆك ئەخوێنێنەوە لەوە تێدەگەین کە هەرچەندە لەسەدەی 17دا بیرۆکەی لێکبوردنی ئایینی شتێکی قبوڵکراو نەبوو، بەڵام کەسانی هۆشمەند هەرئەوەندە سوودەکانی لێکبوردنیان لا روون دەبۆوە، روویان تێ دەکرد.

هەربۆیە مەسەلەی لێکبووردن لەبنەڕەتدا مەسەلەیەکی سیاسییە. لەوسەردەمەدا مەسەلەی ئازادیی ویژدان یان ئازادیی هزری ئەبستراکت لەئارادا نەبوو، مەسەلەی سنووری دەسەڵاتی قازی لەمەسەلە ئایینییەکاندا لەئارادا بوو. لۆك دەنووسێت: ((خۆشگوزەرانیی گشتی بەلای منەوە لەکۆمەڵگایەکدا هەیە کە بەتەنها لەپێناوی پاراستن و پەرەدان بە بەرژوەندییە مەدەنییەکانی ئەندامەکانیدا دامەزرابێت)). ئەوەی کەلۆك بۆ ئێمەی روون و ئاشکرا دەکات، ئەوەیە کەتیۆرەی لێکبووردن ئەنجامێکی مەنتیقیانەی بیرو بۆچوونەکانی تریەتی سەبارەت بە کۆمەڵگا و دەوڵەت. ئەو بەم شێوەیە ئەوە دەخاتە روو: ((ئەگەر ئادەمیزادەکان بیانتوانییایە بەئاشتی و ئارامی پێکەوە بژین، بەبێ ئەوەی لەژێر گوشاری هەندێ یاسادا یەك بخرێن و، خۆشگوزەرانیەکی گشتی و هاوبەشیان هەبێت، ئیدی هیچ پێویست بەدادوەر یان سیاسەت ناکات کەبەتنها بۆ ئەوە دروست بوون

تا ئادەمیزادەكان لەفریو و توندوتیژیی ئەوانی تر بپاریزن)) بەواتایەكی دی، لۆك چاو لەرێی چاودێری و پەرەدان بەسیستمێكی كۆمەڵایەتیەیە كەخۆی بنیاتنەرێتی . ئەو زۆر باش ئاگای لەو هەلومەرجانەیە كەدەشێ هەڕەشە لەو خۆشگوزەرانی یە گشتی و لێبوردانە و بگۆڕانە بكات كە ئەم خوازیارێتی. ئەو وەكو كەسێكی ئەزموونگەرا، لەئەزموونەوە ئەوە فێربووە كەپێویستە خۆمان لەهەندێ پێكهاتەی دەسەڵاتی كڵێسا و حكومەت دوور ڕابگرین. دواجار لۆك لەوە دەترسێت كە خەڵك متمانەیان بە كۆمەڵگایەكی بگۆڕێ لەمجۆرە لەق ببێت. بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەمەش، لەمافەكانی بوونەوەرە هۆشمەندەكاندا بەدوا سەرچاوەكانی لێكبوردندا ئەگەڕێت و دانی پیادەنێت. بەبۆچوونی لۆك ئەوە هەڵبژاردنێكی هۆشمەندانەیە كەمرۆڤ ژیان لەناو كۆمەڵگایەكی ڕێكخراودا هەڵبژێرێت، لەبەرئەوەی ئەو بەمجۆرە دەتوانێ بەباشترین شێوە چەمكگەلێكی وەكو ئازادی و خاوەندارێتی بەدی بهێنێت و پەرەیان پێێ بدات. هەربۆیە كۆمەڵگای ڕێكخراو بۆ مانەوەی مرۆڤەكان پێویستە و ڕۆڵی یاساش بۆ پەرەدان بەبەرژەوەندییەكانی مرۆڤەكان شتێكی ناچارییە. بەم پێیە هاووڵاتیان بەهەڵبژاردنێكی هۆشمەندانە ژیان لەناو كۆمەڵگایەكی ڕێكخراودا هەڵدەبژێرن و هەر لەبەرئەوەش پابەندی ئەوە ڕەندی (فەزیلەت)ە مەدەنییان دەبن كەمافە سەرەكیەكانی ژیان و خاوەندارێتی و ئازادییان لێ دەكەوێتەوە واش چاوەڕێ دەكرێ كەڕەفتاری حكومەت لەگەڵ هاووڵاتیاندا بەپێی پەیمان و ڕێكەوتنامەی دوولایەنە بێت، كەواتە بەبۆچوونی لۆك، لێكبوردن مافێكە كەلەسەر بنەمای كۆمەڵێك ڕەندیی مەدەنی لەكۆمەڵگایەكی خۆگۆڕ (خۆی خۆی دەگۆڕێت —و—) دا پەرەدەسێنێتو، فەزیلەتە مەدەنیەكانیش بەو پێیەی لەبەرژەوەندیی خەڵكانی ژیر و هۆشمەندن، لەلایەن ئەوانەوە دەپارێزرێن.

بەمجۆرە و بەبۆچوونی لۆك لێكبوردن مافێكە كەلەسەر بناغەیەكی ژیرانە دامەزرێ. هەر بۆیە شتێكی ناژیرانە و نامەنتیقیٌیە گەر حكومەتێك هەوڵبدات بەزۆر بیروباوەڕی ئایینیی خەڵك بگۆڕێت، لەبەرئەوەی ناتوانین بیروباوەڕ ملكەچی زۆرلێكردن بكەین. مەبەستی لۆك ئەوەیە كە ئێمە ناتوانین ڕۆحی خۆمان بخەینە ژێر ڕكێفی دادگایی مەسیحییەوە، چونكە هیچ دەستەبەرێك نیٌیە كەئەم دادگایە لەسەر هەق بێت. كەواتە هەر كەسەو ئەبێ شوێن ((تیشكی ئەقڵی خۆی بكەوێت)) ئەوەی لۆك دەیەوێ لەم باسەدا بیڵێت لەسەر ئەو بناغەیەیە كەدەڵێت نالێكبوردن نەك هەر لەڕووی ئاكارەوە بەهەڵەداچوونە، بەڵكو لەڕووی سیاسیشەوە نائاقڵانەیە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە كە لۆك لەم توێژینەوەیەی خۆیدا دەیەوێ بۆ دووركەوتنەوە لەدروستبوونی كۆمەڵگایەكی جەبری و ناڕێك، كڵێسا لەحكومەت جیابكاتەوە، بەواتایەكی دی، لۆك دەیەوێ لەڕێی ڕێكخستنی كۆمەڵگای مەدەنییەوە ئەقڵانیەت دابمەزرێنێ. بۆیە ئەو كڵێسا و حكومەت لەیەكتر جیادەكاتەو. لۆك دەنووسێت: ((كڵێسا خۆی بۆخۆی دابڕاوو جیایە لەكۆمەڵگایەكی فرەبەرژەوەند. سنوورەكانی ئەم دووانە جێگیر و نەگۆڕن)).

كەواتە ئەنجامەكە ئەوەیە كەقازیی مەسیحی ئەبێ تەحەمولی هەموو كۆمەڵگا ئایینییەكان بكات،

ئەم لێکبوردنە ئەبێ هەر مەسیحیەکان نەگرێتەوە، بەڵکو هەموو ئەو کۆمەڵگایانەی کەباوەڕیان بەخوا هەیە.

هەروەکو لۆك دەڵێت: (( ....نە موسڵمان و، نەجووڵەکە، نابێ بەهۆی ئایینەکانیانەوە لەمافە مەدەنیەکانی کۆمەڵگای بەرژوەند هاوبەش بێبەش بکرێن)). هەر لەبەرئەمەشە کە لۆك بەلەبەرچاوگرتنی پەیوەندی نێوان کڵێسا و حکومەت بەتێڕوانینێکی گەشبینانە تر لەوەی هۆبز ناسراوە سەبارەت بەسروشتی مرۆیی. بەڵام پێویست بوو کەڤۆڵتێر سەدەیەك دوای ئەمە دیدەکەی ئەو بەمجۆرە تەواو بکات: ((لێکبوردن چی‌یە؟ بەرەنجامێکی سروشتی‌ی ئینسانیەتی ئێمەیە. ئێمە هەموومان بەرهەمی لاوازی و سستین. کەمتەرخەمین و قابیلی هەڵەکردنین. کەواتە پێویستە لەدەبەنگیەکانی یەکتر ببوورین. ئەمە یەکەمین پرەنسیپە لەیاسای سروشتدا، یەکەمین پرنسیپی مافی گشت ئادامیزادەکان)).

ئەگەر بایەخ بە ڕوونکردنەوە لیبراڵ و ڕۆشنگەرانەکانی لۆك و ڤۆڵتێر بدەین، ئەگەینە پەیبردن بەتایبەتمەندییەکانی سیاسەتێکی لیبراڵی لێبوردە کە گرنگی بەکۆمەڵگایەك ئەدات کە ئەندامەکانی پێیان باشترە کە تەحەمولی جیاوازییەکانی یەکتر بکەن، نەك یەکتری لەناوبەرن. بەڵام قبووڵکردنی سیاسەتێکی لەمجۆرە بۆ هەمووان لەدونیای ئەمڕۆدا شتێکی ئاشکرا و بەڵگەنەویست نی‌یە. لەدونیای ئەمڕۆدا، ئەم دونیا فرە کولتوورەی کەلەسای فەزایەکی لێبوردە ئامێزی وڵاتە لیبراڵەکاندا گەشەسەندنی کۆمەڵێك کولتووری جیاواز بەخۆیەوە دەبینێت، خۆڕۆشنبیرکردن و بینینی تایبەتمەندییە فەلسەفی و سیاسیەکانی لێکبوردن، نابێ بەو سەختی‌یەی سەردەمی لۆك بێت. بەڵام ئەم بایەخدانە بەوانی تر و کرانەوە لەئاست حەقیقەتدا، لەهەندێ کولتووری ئایینی و سیاسیدا هێشتا نەبووتە بەشێك لەهەستی خەڵك.

گومان لەوەدا نی‌یە کە لێکبوردن لەهەموو سەردەمەکاندا ئاکارە، بەڵام ڕەنگە لەهەر سەردەمێکی تر زیاتر بۆ ئەم سەردەمەی ئێمە بگونجێت. لەبەرئەوەی ئەگەر بەوردی لێی تێبگەین پیشانمان ئەدات چۆن بەرامبەر بەو کەڵکەڵەی توندوتیژی و دیکتاتۆریە بەرهەڵستی ئەکەین کەلەلایەن هەندێ ئایدۆلۆژیای سیاسی ئەم سەردەمەوە بانگەشەی بۆ دەکرێ. ئەو وانەیەی کەلێکبوردن فێری ئێمەی دەکات وانەی تێڕوانینی ڕەخنەییانە و گومانکارانەیە بەرامبەر بەو بیرمەندە یۆتۆپیاگەرانەی کەدەیانەوێ ئێمە لەکۆمەڵگایەکدا بژین تیایدا ڕێز بۆ بەهاکانی فرەیی (پلورالیزم) دانەنرێ و دامەزراوەکان نەبنە جێی ڕەخنە و چاکسازی. بەڵام لێکبوردن بەو مانایەش دێت کەلێگەڕێین ئەوانەی ئێمە بیرو باوەڕیان بەمەترسیدار دەزانین لایەنگر بۆخۆیان بدۆزنەوە. تێڕامان لەمانی لێکبوردن دەشێ شێوازێك بێت بۆئەوەی هەموومان لەوە تێبگەین کە هیچ ڕێگەچارەیەك نی‌یە تاقە ڕێگەچارە بێت بۆ کێشەکانی ئێمە. بەو مانایەی کەکۆمەڵگای لێبوردەگەرا دەبێ هانی ئەندامەکانی خۆی بدات تا لەگەڵ یەکدا گفتوگۆ بکەن. قبووڵکردنی ئەمە وەکو پرەنسیپێك بۆهەنگاونان لەڕەوتی لێکبوردندا بەهەول و تەقەللایەکی ڕۆژانە دەژمێردرێ کەیەکەیەکەی ئێمە دەگرێتەوە.

## پەراوێز

* هەردوو حیزبی پێشووی ویگ (*Whig*)و تۆری (*Tory*) لەبەریتانیا، هەر لەکۆنەوە ڕکابەری یەکتربوون، لەکۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەیەمدا حیزبی ویگ بەدژایەتیکردنی چالزی دووەم و جەیمزی و دووەم بووە هۆی بەرپاکردن و سەرکەوتنی شۆڕشی شکۆداری سالی 1688، لەئەنجامی ئەم شۆڕشەدا پەرلەمان بەسەر بنەماڵەی پادشاییدا زاڵ بوو.

## سەرچاوە

تفاوت و تساهل – رامین جهانبگلو – نشر مرکز 1380.

# ڕۆژێك لە ئەسینای دێرین

ولیەم داڤیس

لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

## منداڵانی ئەسینا

خاتوونی ماڵ لەپاڵ سەرپەرشتیکردنی کۆیلەکاندا، بەشێوەیەکی سروشتی دەبوو خەریکی منداڵانیش بێت. ماڵێکی بێ منداڵ نەهامەتییەکی گەورە بوو، مانای ئەوە بوو تەمەنی پیری کزو گۆشەگیر بەسەردەبەن، لەوەش خراپتر ڕەشبوونەوەی وەجاخی خێزانەکەو پەرستشی خوداکانیان بوو. لە ئەسینا چەند شتێکی خورافییانە باوبوو، وەك مەسەلەی "پەرستنی پێشینان" بۆیە نەبوونی منداڵ مووچڕکەی بە لەشی مرۆڤدا دەهێنا بەوەی دواتر کەس نامێنێت پێشینانی شکۆدار بپەرستێت، کەس نابێت لە یادەوەریی ئەواندا قوربانی پێشکەش بکات. لەپاڵ ئەوەشدا واباو بوو کە ماڵی بێ منداڵ بەشدارییناکات لە نەمرکردنی شاردا، شارێکی وەکو کۆرینس، تێبێس سپارتە، تێبێس سەریانسوڕمابوو لەوەی ئەسینا بەدەستی خۆی نەوەکانی خۆی دەکوژێت، بۆیە لانیکەم تاقە کوڕێك شتێکی زۆر دڵخۆشکەر بوو. گەیشتنی ئەو ساوایە کامەرانییەکی گەورە بوو بۆ باوك، ئارامییەکی زیاتریش بوو بۆ دایکی لاو.

## لەدایکبوونی ساوا

ژمارەی ئەو منداڵانەی پێیانخۆشە بیانبێت، پەیوەندی بە بارودۆخەوە هەیە. پەروەردەکردنی منداڵان گرانە. پێویستییان بە پەروەردەکردنی گونجاو هەیە، پێویست دەکات میراتێکی باش بۆ کوڕەکان جێبهێڵدرێت[1]. هەروەها جیازییەکی باشیش بۆ کچان ئامادە بکرێت، ئەگینا "ناتوانن شوویەکی شایستە بکەن." بۆچوونی گشتیو یاساش ڕێگە دەدەن باوك (لانیکەم ئەگەر منداڵێك یان دوانی هەبێت) ئیمتیازێکی هەبێت، کە دواتر بە یەکێك لە نەنگیو لەکەکانی شارستانێتی یۆنان لەقەڵەمدەدرێت. دوای لەدایکبوونی کچ، بە ڕۆژێك یان دوان دایکە لاوەکە یان دایەنە دڵسۆزەکەی تووشی پەرێشانیو بێئارامی دەبێت.

ئایا باوکی پەروەردەی دەکات؟ ئایا ژمارەی پێویست کوڕیان هەیە؟ ئایا نائومێدبوونی پیاوەکە

لەوەی کچیان بووە زۆر ناخۆشە؟ ئایا ترسی ئەوەی نیە کە نەوەبڕ بنو کەس جێگایان نەگرێتەوە؟ یان دەتوانێت ئامادەکردنی جیازی بۆ کچەکە هەڵبسوڕێنێتو بیدات بە کوڕێکی بیانی بە خۆیان؟ یان ئایا کچەکەیان پەکەوتەو سیسو لاواز دەبێت یان نا، تۆ بڵێی ناشرینو دزێو نەبێت؟ ئەگەر هەریەکێك لەم مشتومڕانە گومانی راست دەرچوونی لێبکرێت، ئەوە باوك بڕیاری خۆی دەداتو گەڕانەوەی بۆ نیە. دەبێت تا رۆژی پێنجەمی لەدایکبوونی منداڵەکە بڕیار بدات. بۆی هەیە لەو ماوەیەدا دەتوانێت وشە کوشندەکان بدرکێنێت "فڕێیبدەن" ئیتر ئەو بونەوەرە بەستەزمانە دەخرێتە ناو بێشکەیەکی رەقوتەق، یاخود بە زۆریی دەیخەنە ناو کوپەیەکی قووڵەوەو لە شوێنێکی گشتی جێیدەهێڵن، وەك سەرسوچی ئاگۆرا، یان نزیکی وەرزشگا، یاخود لە بەردەروازەی پەرستگایەکدا. ئیتر زۆری پێناچێت لە برسانو لە هەراسانیدا دەمرێت. ئەگەر هۆیەکانی فڕێدانی منداڵەکە جەستەیی بێت، ئەوە کەس دەستی بۆ نابات، مردن چاوەڕێیەتی. خۆ ئەگەر تەندروستی باش بوو سیمایەکی جوانی هەبوو، ئەوە رێیتێدەچێت یەکێك بیباتو پەروەردەی بکات بۆ خۆی. هەروەها ئەو هارپیییەکان، ئەوانەی کۆیلە پەروەردە دەکەن، بە تایبەتی کۆیلەی مێیینە بۆ کاروباری ناپەسەند، ئەوانە لە بەزەییپێهاتنەوەدا نیە کە دەگەڕێن بۆ هەڵگرتنەوەی هەموو ساوایەکی فڕێدراو کە سیماو جەستەی پەسەندی هەبێت. ئەوانە پەروەردەیان دەکەن، ئەگەر کچ بوو، فێری دەکەن چۆن گۆرانی بڵێت، سەما بکات، گەمە بکات. هەربۆیەشە لە ئەسینادا ئافرەتانی سپی پێست لای خێزانە دەوڵەمەندەکان پەسەند بوون. ئەوە راستیەکە لای هەمووان ئاشکرایە، کەچی بە غەمزەی چاو ئاماژەی بۆ دەکەن. ئەریستۆفانێس شاعیرێکی کۆمیدییە، وەها باسی فڕێدانی منداڵ دەکات کە شتێکی باو بێت لە ئەسینادا. سۆکراتیش دەیووت کاتێك ئەو بیستەرانەکان خۆی لە ئایدیا دەستەمۆکان دەدزییەوە، خەمناك دەبوون وەك ئەو ئافرەتانەی منداڵەکانیان لێستێندراوە. "کەم کەس یان هیچکام لە پیاوانی دواتر جگە لە سەرزەنشت کردن شتێکی دیکەیان بەم نەریتە وتبێت"[2].

## ئاهەنگی لەدایکبوون

بەلام بەدڵنیاییی لە زۆرینەی حاڵەتەکاندا، هاتنی منداڵێك شتێکی یەکجار خۆشە، ئەگەر کچ بێت، ئەوا داوە خوری یاخود پاساڵێك بە دەرگای ماڵە بەختەوەرەکەوە هەڵدەواسرێت، ئەگەر کوڕ بوو، ئەوە چڵە زەیتونێك دادەنێن. پێنج رۆژ دوای لەدایکبوون، دایەنەکان ساواکە کە بەجۆرێك قوماتەکراوە خەریکە دەتاسێت، دەبەن بۆ لای ئاگردانی ماڵەکە "ئەندرۆن"و بە ساواکەوە شەش حەوت جار بەدەوریدا دەسوڕێنەوەو ئەندامانی خێزانەکەش بشادو گوشاد لە دوایانەوە دەڕۆنو کامەرانییان لێدەتکێت. ئێستا منداڵەکە لەژێر سایەی خوداوەندەکانی خێزانەکەدایە. خواردنو خواردنەوەیەکی زۆر دابەشدەکرێت. لێرەوە چیتر دەسبەرداربوون شیاو نیە. قورساییەکی زۆر لەسەر دڵی دایکەکە لادەچێت. بەلام لە "رۆژی دەهەم" دا ئاهەنگو خۆشی راستەقینە دەستپێدەکات. ئەمە رۆژی "ناولێنان"ە. هەموو خزمو کەسوکار لەوێن. ماڵەکە پڕە لە بۆنی بخورو تاجەگوڵینە. جێشتکەرەکان لە مۆبەق خەریکن. هەموو کەسێك دیارییەکی سادە دەهێنێت، لەگەڵ دنیایەك هیوای بەختی باشدا. قوربانی دەکرێت، دوای تەواوبوونی ئاهەنگەکە منداڵەکە ناودەنرێت. ناوی ئەسینایی

زۆر کورت‌و زۆر سادەن[3]. هەندێجار کوڕ ناوی باوکی هەڵدەگرت، بەڵام بەزۆریی بەناوی باپیرەیەوە ناودەنرا، بۆ نمونە سێمیستۆکلێسی کوڕی نێکۆلێسی کوڕی سێمیستۆکلێسە: بەگشتی ناوی باوك وەکو نازناوێك زیاد کراوە. بەمجۆرە چەند ناوێکی دیاریکراو دەبوون بە موڵکی خێزانێك، شتێکی زۆر ناخۆشیش دەبێت ئەگەر رۆژێك بێت‌و کوڕێك دەستنەکەوێت ئەو ناوانە هەڵبگرێت!

ئێستا منداڵەکە بە ئەندامێکی کۆمەڵەکە دەناسرێت، باوکی وەکو کوڕی شەرعی خۆی پەسەندی کردووە، بە یەکێك لە میراتگرە ئایندەییەکانی، لە کاتی پێویستیشدا هەموو مافەکانی هاوشاریی ئەسینایی پێدەدەرێت.

## ژیان‌و گەمەو گاڵتەی منداڵە بچووکەکان

حەوت ساڵی یەکەمی ژیانی کوڕی یۆنانی لەگەڵ دایەنەکانی‌و دایکیدا دەگوزەرێت. تا ئەو کاتە باوکی رۆڵێکی ناڕاستەوخۆ دەبینێت لە بایەخپێدان‌و کاری کوڕەکەیدا. هەرئەوەندەی پێنج رۆژی یەکەمی تەمەنی ساوا تێپەڕی، ئیتر بیانوویەك نامێنێت بۆ گلەییکردن لە مامەڵەو پەروەردەی. رەنج‌و زەحمەتێکی زۆر دەکێشرێت بۆ ئەوەی گەرم‌وگوڕ رابگیرێت‌و خۆراکی باشی پێبدرێت. خێزانی دەستڕۆیشتوو سەرەخولێی پێدەکەوێت بۆ پەیداکردنی دایەنێکی کارامە، دایەنە سپارتەییەکان داواکارییان زۆر لەسەرە، چونکە دەزانن چۆن ساوا تەندروست پەروەردە دەکەن. هەموو جۆرە لەیستۆکێکی هەیە، ئەرەستۆی فەیلەسوف ستایشی بەخشینی بەردەوامی ئەو لەیستۆکانە بە منداڵ دەکات، دەڵێت "ئەگەر وانەبووایە، منداڵان هەرچی شتی ناو ماڵ هەیە دەیانشکاند." بەبەکان شەقشەقەو خڕخاڵیان هەیە، کە گەورەتر دەبن، بووکەڵەی قڕینی رەنگکراو یان لە مێودروستکراویان دەدەنێ، هەندێکیان دەست‌و قاچی جوڵاویشیان هەیە، هەروەها قاپوقاچاخی منداڵانەو مێزو گالیسکەو گیانەوەریشیان هەیە. کوڕانیش شتی دیکەی یاریکردنیان هەیە، تۆپ، شتی دیکەی وەك عەرەبانەو ئەسپە دارینە. سەگی ماڵیشیان هەبوو، جۆرەها یاری و بازبازێن‌و زۆران‌و پێکاهەڵپرژان‌و گۆرانی‌و هاتوهاواریان هەیە[4]. منداڵانی ئەسینا بە کۆمەڵ پڕن لە گەڕەلاوژەو هەراوزەنا. ئەفلاتون بە جوانی باسی هەڵبەزودابەزو قاووقیژیان دەکات. هەتا گەورەتر دەبن، زیاترو زیاتر سووچی تەسکی حەوشەی ماڵەکانیان جێدەهێڵن‌و لەسەر شەقامەکان وازی دەکەن.

## وازی لەسەر شەقام

کۆڵانی تەسك‌و تروسك‌و پڕ تەپوتۆزو پیسی، تەنانەت منداڵی خێزانە خانەدانەکانیش رێگەیانپێدەدرێت لەوێدا یاری بکەن. دوای بارانبارینێك، منداڵان خەریکن بەلەمی گاڵتینەی چەرمین لەناو گۆلاوەکاندا دەخەنەڕێ، یاخود خەریکی دروستکردنی شتومەکن لە قوڕ. لە کەش‌و هەوای گەرمدا یاری بە قالۆنچەو مێرووەکان دەکەن، پەتێك دەبەستن بە قاچی مێرووەکانەوەو پاشان لێدەگەڕێن بفڕن، ئینجا بە پەتەکە رایاندەکێشنەوە بۆ لای خۆیان. وەك بۆق هەڵدەقونێنەوە، چاوشارکێ دەکەن، بەناو کۆڵانەکاندا هاروهاجی دەکەن. بەڵام شەقامەکان شوێنی باشی گەمەو وازیکردن نین. گەرچی خەڵك دەیانەوێت خۆیان خانەدان‌و ماقووڵ پیشان بدەن، بەڵام کە بەلای منداڵاندا تێدەپەڕن قسەیان پێدەڵێن، منداڵانیش گوێیان زۆر سووکەو چاویشیان تیژەو خێرا هەڵدێن. لە لایەکی دیکەشەوە، تێڕوانینێکی

بەڕێزانە بەرەو منداڵو منداڵی باوە، گەرچی زۆرجار منداڵان بە لاسارو سەرسەخت ناودەبەن. هیرۆدۆتی مێژوونووس باسی کارەساتێکی ناخۆشدەکات، بنمیچی قوتابخانەیەك رماو لە ژێریدا سەدو بیست منداڵی قوتابی مردن[5]، هیرۆدۆت ئەمە بە نەهامەتییەکی گەورە حیساب دەکات، لە کاتێکدا زۆر بە ئارامی باسی قەلاچۆکردنی خوێنساردانەی هەزاران پیاو دەکاتو بەلایەوە ئاساییە. لە راستیدا هیرۆدۆت گۆیندەیەکی زۆر باشە لەبەردەمی خەڵکی ئاسایی یۆنانیدا.

## چیرۆكو وانەکانی سەرەتا

ئەسینابیەکان باخچەی منداڵانیان نەبوو. یەکەمین فێرکردنی منداڵان لە شێوەی ئەفسانەو چیرۆکی جنۆکەو پەرییەکاندایەو لە دایكو دایەنەکانیانەوە فێریاندەبن، بەگشتی بۆ ئەوەیە بیانترسێنن بۆ ئەوەی ئاقڵ بن. چیرۆکەکانی لامای نەبینراو، مۆرمۆی سیحربازی تۆقێنەر کە منداڵە بزێوەکان دەگرێت، یان چیرۆکی ئیمپۆسا کە درنجێگە لە شوێنە تاریكو نوتەکەکاندا خۆی شاردۆتەوە، یان کابالۆی، ئەژدیهایەکی دڕندەیە لەناو دارستانەکاندایە.

پاشان چیرۆکە نەمرەکانی ئەیسۆپ دێن، کە مەبەستی حاشاهەڵنەگر لێیان ئەوەیە چاکە بکەن. دایكو مامۆستایانی ئەسینا سزای جەستەیی بەکارناهێنن، کوتەك هەرگیز نەیتوانیوە رێگە لە خراپبوونی منداڵ بگرێت، گەرچی لە ساڵی یەکەمی تەمەندا، لێدان بە سۆڵو نەعل هەیە،. منداڵەکان هەرزوو ترسێکی تەندروستیان لە دایەنەکانیان لا دروست دەبێت، بەڵام فێریش دەبن خۆشیان بوێن، هەمیشە لە یادیاندا دەمێننەوەو بۆنەو یادەوەریی تایبەتیان هەیە بۆ یادکرنەوەی دایەنەکانیان.

## مەشقدادانی کچانی ئەسینا

خوشكو برایان هەتا نزیکەی تەمەنی حەوت ساڵی پێکەوە لە جیناکۆنیتیس (ژووری ژنان) پێکەوە دەژین. پاشان کوڕان رەوانەی قوتابخانە دەکرێن. کچانیش لەماڵەوە دەمێننەوە تا کاتی شووکردنیان دێت. زۆر بە دەگمەن دایکوباوك هەستدەکەن پێویستە مامۆستا بۆ کچەکانیان بگرن. ئەوەی کچ دەیزانێت ئەوەیە کە دایکی فێری کردووە. ژمارەیەکی بەرچاوی ژنانی ئەسینا (تەنانەت ئەوەنەی سەر بە خێزانە خانەدانەکانیشن) نەخوێندەوارن، بەڵام ئەمە حاڵەتە باوەکە نیە، کچی ئاسایی لای دایکی فێری خوێندنەوەو نوسین دەبێت[6]. زۆرجاریش فێری سەماکردن دەکرێت، هەندێجاریش فێری ژەنینی ئامێرێکی مۆزیك دەکرێت، ئەمەی دواییان زۆر باو نیە بۆ ئافرەتە جاحێڵەکانی خێزانە خانەدانەکان. بە دەگمەن کەس خەون بەوەوە دەبینێت کە مەشقێکی پەروەردەیی سیستماتیکی بۆ ئافرەت دابینبکات[7]. ئەوەی زۆر گرنگە ئەوەیە فێر ببێت بڕێسێتو بچنێتو لەسەر تەون کاربکات، نەخشو گوڵچنین بزانێت، شارەزای چێشتلێنان ببێتو بتوانێت سەرپەرشتی ئاهەنگی نانخواردنی ئێوارە بکاتو میوانان بەڕێ بکات. کاتێکی کەمی هەیە بۆ فێربوونی هەموو ئەوانەو زۆری پێناچێت "هاوسەرێکی بۆ پەیدا دەکرێت"و رۆژانی منداڵی بۆ هەتاهەتایە کۆتاییان دێت[8].

لەو کاتەدا براکەی دەستیکردووە بە کۆرسی فێربوون، دەربارەی هەموو ئەوەی کە پیویستە بیکاتو ئەوەش کە دەبێت نەیکات، ئەمە یەکێکە لە دیارترین سیماکانی ژیانی ئەسینا.

## قوتابخانەکانی ئەسینا
## ئەسینایییەکان بەشێوەیەکی گشتی خوێندەوارن

لە ئەسینا خوێندن بەپێی یاسا شتێکی زۆرەملیٚ نیە، بەلاٚم ئەو باوکە ناتوانێت کوڕەکەی لانیکەم فێری بڕێکی کەمی خوێندن بکات، خەڵك بە چاوێکی سووك سەیری دەکەن، ئەوەش سزایەکی ناخۆشە. بەشێوەیەکی کرداری نزیکەی هەموو ئەسینایییەکان خوێندەوارن. لە کۆمیدیا نێودارەکەی ئەریستۆفان "سوارەکان" باس لە سجوق فرۆشێکی بێنەزاکەت دەکرێت، کە بۆ مەبەستی شانۆییەکە وەك کەسێکی زۆر نزمی ناو کۆمەڵگا سەیری دەکرا، ئەویش هاواردەکات "بڕواننە پەروەردەی من، بەشێوەیەك لە شێوەکان بە زەحمەت دەتوانم بخوێنمەوە"[9].

بێشك خەڵکی نەخوێندەوار لە ئەسینادا کەم نین، وتەیەکی باو هەیە کە بۆ وەسفکردنی خەڵکی گێل بەکاردەهێنرێت "ناتوانێت مەلە بکات[10] ناشتوانێت پیتەکان بڵێت". کاتێك کوڕ گەیشتە تەمەنی حەوت ساڵی، ئیتر سەردەمی فەرمانڕەوایی مێینە بەسەردەچێت. لێرە بەدواوە تێهەڵدان و فەلاقەکردن، کە بە زۆرییش روودەدات، لە دەستی نێرینەیەکی دڵڕەقەوە دێت.

## بیناکردنی نیهادی مرۆڤ ئامانجی پەروەردەیە

بێگومان پەروەردەو فێرکردنی راستەقینە زۆر پێش تەمەنی حەوت ساڵی دەستپێدەکات. کەسێتی تەنها بریتی نیە لە فێربوونی ناو کتێب، بەڵکو سەرەکیترین بابەتی پەروەردەیە لە ئەسینا، بۆ ئەوەی وا لە کوڕ بکرێت متمانەی بەخۆی بێتو میانڕۆ، زرنگ، شارپەروەر، هاوڕیٚ خۆشەویست، پیاوماقووڵێکی خانەدان بێت. بتوانێت نرخی راستی بزانێتو بەشداریی تێدا بکات، هاوسەنگ بێتو ژیانێکی جوانی هەبێت. پێویستە بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە، جەستەی مەشقی پێبکرێت، جیاواز لە هزری نا، بەڵکو شانبەشانی ئەو. ئەفلاتون، لە پرۆتاگۆراسدا، سەرنجێك دەردەبڕێت "هەرئەوەندەی منداڵ لەوە تێگەیشت کە پێیدەوترێت، دایەن، دایك، یاوەر باوکیش هەموویان پێکەوە هەوڵدەدەن بیکەن بە شتێکی باش، بەوەی هەرچییەك دەکات پیشانی بدەن کە "ئەمە راستە" و "ئەوە هەڵەیە"، "ئەمە جوانە" و "ئەوەش ناشرینە". ئەمەش بۆ ئەوەی فێرببێت دوای چی بکەوێتو خۆی لە چی لابدات. ئەگەر بەخۆشی خۆی گوێڕایەڵ بوو، ئەوە زۆر باشە. ئەگینا هەوڵدەدەن بە هەڕەشەو تەمبێکردن راستیبکەنەوە، چونکە ئەگەر شەتڵ لار بوو ئەوە کە بوو بە درەختیش هەر لاردەبێت. دوای ئەوەی دەشخرێتە قوتابخانە، مامۆستا بایەخێکی زیاتر دەدات بە ئاکارێتیو هەڵسوکەوتی منداڵەکەو لەچاو ئەو بایەخەدا کە دەیدات بەوەی لە خوێندنەوەو مۆزیکدا پێشبکەوێت.

## یاوەری منداڵ

ئەو رۆژەی منداڵی ئەسینایی مامۆستای بۆ دابیندەکرێت، رۆژێکی مەزنە لە ژیانیدا. ئەم کۆیلەیە (رەنگە هەر بۆ ئەم مەبەستەش پەیداکرابێت) مامۆستای نیە، بەلاٚم مەرجە کەسێکی زیاد لە پێویست ماقووڵو نیان بێتو زانیارییەکی باشیشی فێرکرابێت. ئەرکی سەرەکی یاوەر ئەوەیە لەگەڵ ئاغا منداڵەکەدا بێت بۆ هەموو شوێنێکی دەرەوەی ماڵ، بە تایبەتی بۆ قوتابخانەو وەرزشگا، کتێبەکانیو مێزی لەسەر نوسینی بۆ هەڵبگرێت، لە وانەکانیدا یارمەتی بدات، ئاگای لێبێت لاساریی

نەكات، هەڵسوكەوت‌و رەفتاری كۆمەڵایەتییانەی باشی فێربكات. وەڵامی ئەو هەزاران پرسیارە بداتەوە كە بە دڵنیایی منداڵێكی تەندروست دەیانكات، دواجاریش لە حاڵەتە كتوپڕەكاندا، ئەوكاتەی باوك یان مامۆستا لەوێ نین، تەمبێی بكات. یاوەرێكی بەتوانا بۆی هەیە مانای هەموو شتێك بێت بە نیسبەتی كوڕێژگەیەكی بچووكەوە، بەڵام ئەوە زەحمەتە بتوانرێت كە كۆیلەیەكی وەها پەیدا بكرێت كە هاوەڵێكی ئەوەندە نمونەیی بێت[11]. رێیتێدەچێت یاوەر مایەی خراپبوون‌و گەندەڵبوونی منداڵەكە بێت. هەرچۆنێك بێت ئەم سیستمە گومان هەڵدەگرێت.

دیاریكردنی یاوەر هاوكاتە لەگەڵ دەسپێكردنی رۆژانی خوێندندا، ئەسینایییەكان لێناگەڕێن منداڵەكانیان كاتی خوێندنیان بە فیڕۆ بدەن. هەر لە رۆژانی سەرەتای دامەزراندنی قوتابخانەوە (590 پ.ز) یاسایەك دانراوە لێناگەڕێت پێش هەتاوكەوتن قوتابخانە بكرێتەوە، یان هەتا دوای خۆراوا كراوە بێت. ئەم یاسایە بۆ ئەوە نەبووە كە منداڵەكان لەبەرچاو بن، بەڵكو بۆ ئەوەی ئاكاری باش فێر بن. بەڵام بێشك زۆرجار قوتابخانە لەو كاوەیە درێژتریش كراوە بووە. هەرچۆنێك بێت، لە سپێدەی بەیاندا هەموو منداڵێكی قوتابی دەكەوێتە ڕێ، یاوەرەكەی لەگەڵیدا دەڕوات‌و بە درێژایی رۆژ خەریكی ئەركۆ كارەكانی قوتابخانەی دەبێت‌و راناوەستێت. هەربۆیەشە كە منداڵانی ئەسینا حەزیان لە پشووە ئاینییە بێشومارەكانی شارە.

## قوتابخانەی ئەسینا

با ماڵی هاوڵاتییان جێبهێڵین كە بە دوورو درێژیی دەربارەی دواین‌و لە زۆر رووەوە سەیرمان كرد، ماڵەكەش‌و دانیشتوانەكەشیمان بینی. دیسان دەكەوینەوە سەر شەقام‌و دەچین بۆ قوتابخانە، كە لەوێ یەكێك لە منداڵەكانی ئەو خێزانەی لایلن بووین رەوانەی ئەوێ كراوە (یاوەرەكەی بردوویەتی). پێویست ناكات زۆر دووربكەوینەوە. قوتابخانەكانی ناو ئەسینا زۆر زۆرن، چونكە بچووكن. بۆ فێركردنی منداڵانی خێزانە هەژارەكان تەنها ژوورێكی مامناوەندی‌و چەند تەختێكی دانیشتن بەسە، دووكانێكی بەكرێنەدارو بەكەڵكی ئەمكارە دێت. بەڵام ئێمە رووده‌كەینە قوتابخانەیەكی پۆشتەتر. لە دەروازەی قوتابخانەكەدا ژووری چاوەڕوانی هەیەو هەرلەویش كەوشەكانت دادەكەنیت. یاوەری منداڵ لەوێ چاوەڕوانیدەكات‌و لەگەڵ یاوەرەكانی دیكەدا دەمەتەقێ دەكات. منداڵە بەڕێزەكانیش لە ژوورێكی گەورەتردا سەرقاڵی خوێندنن. بەشەكەی تری ماڵەكە كەلوپەلێكی ئەوتۆی لێ نیە. لەسەر دیوارەكانی ژووری خوێندن رەفەو تاقی كتێب هەیەو كتێبیان لەسەر كەڵەكە كراوە، هەروەها كەلوپەلی نوسین‌و گۆزەی ئاوخواردنەوەش هەر لەسەر ئەو رەفانەیە، هەندێك كەلوپەلی سادەی ئەندازەشی لێیە.

لەبەرئەوەی قوتابییەكان كەمن، بۆیە بە زۆری یەك مامۆستایان دەبێت، خوێندن‌و فێركردنیش بە بۆچوونی ئەو مامۆستایە دەبێت، گەرچی بەشێوەیەكی باو لە هەموو قوتابخانەكاندا شیعرو گۆرانی دەوترێتەوە.

## بەرنامەی قوتابخانە

بەرنامەی خوێندن لە ئەسینا بەپێی ئەو بابەتانەی دەخوێندرێن، دیاریكراو و سنوردارن: "نوسین، مۆزیك، وەرزش. پێویستە هەموو

منداڵێك شتێك لەوانە فێر ببێت. وانەی وەرزش درەنگ وەختانێك دەوترێتەوەو مامۆستایەكی تایبەت دەیلێتەوە، شوێنەكەشی قوتابخانەی زۆرانبازییە".

لەوانەیە وانەی مۆزیكیش لە لایەنی مامۆستایەكی جیاوە بوترێتەوە، كاری سەرەكی لەگەڵ كوڕێكی منداڵدا، بە دڵنیایی ئەوەیە فێری نوسین‌و خوێندنەوەی بكەیت. لێرەشدا پێویستە ئاماژە بدرێت بەوەی كۆمەڵێكی باش لە كتێبە كلاسیكییەكانی ئەسینایان لەبەردەستدایە. بۆ خوێندنەوەی دروشمێكی میللی، دەقی یاساكان، ئەو نامانەی جارجار بۆیان دێن، بەڵگەنامە بازرگانییەكان.. هتد، بەلای گەلێك لە ئەسیناییەكانەوە خوێندنەوە فێربوونێكی كافییە. منداڵان لە ڕێگای گوێچكەوە فێری هۆنراوە مەزنەكان دەبن، نەك لە ڕێگای چاوەوە، لەوانەیە منداڵێك ژیانێكی دوورو درێژی بەرێزانە بەسەر ببات بێ ئەوەی یەك دیوانی شیعر لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر بخوێنێتەوە. بۆیە فێركردنی خوێندنەوە زۆر سادەو ساكارە، ڕەنگە فێربوونی نوسینیش لەو باشتر نەبێت‌و هەمووی لە چەند دێڕێك تێناپەڕێت.

بیست‌وچوار پیتەكەی ئەلفوبێ لەبەردەكرێن، پاشان مامۆستا چەند دێڕێك لە سەر تەختەكە دەنوسێت بۆ ئەوەی قوتابییەكان كۆپی بكەن، زۆری پێناچێت منداڵ فێری نوسینەوەی پەرەگراف تەواو لە شیعری شاعیرە مەزنەكان دەكرێت. بەرەوپێشچوون لە ئەدەبدا زۆر خێرایە. كات بە مێژوو، جوگرافیا، زانستە فیزیكییەكانەوە بەفیڕۆ نادرێت. ئیتر بەوەی جەخت دەكرێتە سەر بابەتێكی سەرەكی، ئیتر منداڵی ئەسینایی زوو فێری ئەلفوبێ دەبێت‌و پیتەكان دەناسێتەوە، ڕەنگە بڕێك زمێرەشی پێ بوترێت، بەڵام تۆزقاڵێك. ئەگەر لە ژیانی داهاتوویدا، منداڵەكە نەبێت بە بازرگان یان بانكسان، ئەوە شەرم ناكات ژمارە بچووكەكان بە پەنجەی خۆی ببژێرێت، یان بەهۆی وردە چەوەوە. وەلێ ئەگەر باوك حەزبكات كوڕەكەی ببێت بە فەیلەسوف، ئەوە كەمێك ئەندازەشی فێردەكات.

دەبینین لە قوتابخانەی ئەسینادا "خوێندنی پیشەیی" بەتەواویی بزرە، هەموو هەوڵیان بۆ ئەوەیە نیهادێكی زیبا، خانەدان، ئازاد، سەربەرز لە منداڵدا بخوڵقێنن، نەك پیشەیەكی فێربكەن لێوەی بژی. هەتا دوا قۆناغی خوێندن، ئەوە شتێكی زۆر دزێو و نابەجێیە كە منداڵ فێری بكرێت شیتێك بخوێنێت كە كاروكاسپییەكی لێوە فێردەبێت. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە كە زۆر گرێنادرێتە ژمێرە، بەڵام كەمێك بوار هەیە كەمێك فێری وێنەكێشان‌و هێڵكاری بن، گەرچی هیچ پیاوێكی خانەدان هەوڵ نادات كوڕەكەی خۆی بكات بە نیگاركێش، بەڵام ئەو خوێندنە بۆ ئەوە باشە كە بتوانێت نیگارو پەیكەری نایاب بناسێتەوە. لەسەرووی هەموو ئەمانەشەوە، پێویستە مامۆستای قوتابخانە، وێڕای تووڕەیی‌و بێبەزەییەكەشی، شۆرەتی جوان بێت‌و مامۆستایەكی سروشبەخش بێت، نابێت هیچ دەرفەتێك لەدەستبدات بۆ وتنەوەی وانە ئاكارییەكان، تواناو تینی ئەوانەی پێی سپێردراون، پێشبخات.

سبۆگنیس، شاعیری دێرینی میگارا لەمبارەیەوە دەڵێت:

گەورەكردنی منداڵ ئاسانە، بەڵام فێركردنی ئاكارو رەفتار
شتێكە دەستمان پێی ناگات.
گەمژە بكەین بە دانا، خراپەكار بە پیاوچاك،
ئەوە زانستێكە هێشتا پەیمان پێنەبردووە.

## پەراوێزەکان

1. بیرۆکەی ئەوەی کوڕ بە منداڵی فێری خوێندن بکرێتو پاشان مەشقی پێبکرێت خۆی بژێویی خۆی پەیدا بکات، کە لە شوێنەکانی دیکەی جیهان باو بووە، پێچەوانەی تەواوی تیوریو پراکتیکی یۆنانییەکانە.

2. تاکە گللەیی‌و گازاندە لەم کارە ناپەسەندە لە بەردەستماندا هەبێت، بریتیە لەو راستییەی کە ژمارەی ئەو کەسانەی کە جەستەیان ناتەواوبووە، لە ئەسینادا زۆرکەم بوون، بۆیە کەس ئەوە بە ئەندێشەیدا نەدەهات کە ئەو منداڵەی گەورەی دەکات، ناتەواو دەبێت.

3. لەپاڵ ئەم سادەییەشدا لە ناوی کەسانی ئەسینادا، هەندێك ناوی ئاڵۆزو گرانیشیان هەر هەیە کە لە تۆماری شارەکەدا نوسراونەتەوە.

4. ئەوە هەمووجارێك کارێکی ئاسان نیە، هەموو وردەکارییەکانی ئەو گەمەو وازییە دێرینانە بزانین، چونکە زۆر بەدەگمەن رێساو رێساکانی ئەو وازییانە بەدەستی ئێمە گەیشتوون. بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی قسە بکەین، ئەوا وازیکردنی مداڵانی یۆنان، زۆر لەو گەمەو وازییانە دەچن کە منداڵانی سەدەی بیستەم دەیانکەن.

5. *Herodotus, VI. 27.*

6. نەخشێکی کلێنی قەشەنگمان لە یۆنانی دێرینەوە پێگەیشتووە (گەرچی هی ئەسینا نیە) کە پیشانماندەدات کچێك لەسەر ئەژنۆکانی دایکی دانیشتووە، لەو تۆمارەوە کە بە دەستی دایکییەوەیە شت فێردەبێت.

7. ئەفلاتون لە کۆمارەکەیدا *(V. 451 f.)* پێشنیاردەکات کە پێویستە ژنانیش وەکو پیاوان دەرفەتێکی خوێندنیان پێبدرێت، ئەمە پێشنیارێکی یۆتۆپیانە بووەو دەنگدانەوەیەکی بەدەستنەهێناوە.

8. لە بەشێکی داهاتووتردا باس لە تەدارەكو ئامادەسازیی زەماوەندی ئەسینایی دەکەین.

9. *Aristophanes, "Knights", II. 188-189.*

10. مەلەکردن لەناو یۆنانییەکاندا زۆر باو بووە، زۆر سروشتی بووە، چونکە بەشی زۆری ژیانیان لە نزیك ئاوەوە یان لەناو ئاودا دەگوزەراند.

11. گومان لەوەدا نیە کە زۆرجار یاوەری منداڵ خزمەتکارێکی بەساڵاچووی وەفادارو رەوشتبەرزو دڵسۆزی خێزانەکە دەبێت. لەو حاڵەتەدا پەیوەندی لەگەڵ منداڵەکەدا خۆشتر دەبێت.

## سەرچاوە

*WILLIAM DAVIS:*

*A Day in Old Athens*

# ئەسترید لیندگرێن (1907-2002)
# ئاورێك لە ژیان و بەرهەمی

لە سویدییەوە: ئەنوەر قادر محەمەد و خەبات عارف

ڕۆژی 2002/1/28 ژنە نووسەری ناوداری سویدی/ ئەسترید لیندگرێن، کۆچی دوایی کرد. بە ڕێوڕەسمێکی پڕ شکۆ و گەورەوە دوا ماڵئاوایی لەم نووسەرە گەورەیە کرا. کەم کەس هەن لە مێژووی ئەدەبیاتی جیهاندا ئەوەندەی ئەسترید – چ وەك مرۆڤ و چ وەك نووسەر – ناسراو و لای خەڵکی وڵاتەکەیان و دنیا خۆشەویست بن.

خەڵکێکی زۆر لە سکەندناڤیا و ئەورووپا و گەلێ شوێنی تری ئەم سەرزەمینە ئاشنای ناو وناوبانگ و بەرهەم و پاڵەوانەکانی ئەستریدن، بەتایبەتی منداڵ و لاوان. منداڵەکانی ئەڵمانیا، رووسیا، ئەمریکا، ئیسپانیا و ژاپۆن و.. هتد – وەك منداڵانی وڵاتەکەی – پاڵەوانەکانی ئەسترید: پیپی، میۆ، ئێمیل، کاڵسۆن، ڕۆنیا و زۆری تریان دەناسن و خۆشیان دەوێن.

چییە وایکردووە کە کچە جووتیارێکی ڤیمەربی – سمۆلاند بتوانێت مەشخەڵی هونەری بەرز و بەرهەمی نایابی لەسەر لووتکەی "پاڕناس" هەڵکا و خۆشەویستی و ڕێزی ئەو هەموو کەسە و بەتایبەتی منداڵان بۆ خۆی دابین بکات. ئەگەر بتوانرێت، ڕەنگە بە کورتی ئەمە لە دووخاڵی گرنگدا کورت بکرێتەوە: شاکاریی بەرهەمەکانی و هەڵوێستی منداڵ و مرۆڤدۆستانەی ئەو.

ئەسترید لیندگرێن، وەك هەر هونەرمەندێکی پێشڕەو و داهێنەر، چوار چێوەی ئەدەبی تەقلیدیی منداڵانی شکاند و گەلێ بیر و بۆچوون و بەهای ئیستێتیکیی تازەی هێنایە ئاراوە. هەر لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانیەوە و تاکو ئێستەش سەرنجیان ڕاکێشاوە و پاداشت کراون، هەرچەندە هەندێکیان دەمەتەقێی گەرم و مشتومڕیان ناوەتەوەو دەنێنەوە. هەندێ لە نووسەران و پەروەردەکاران، لە گۆشەنیگای زانستی پەروەردە و بەخێوکردنی منداڵانەوە، ڕەخنەیان لێگرتووە و هەندێ لە هەڵسوکەوتی پاڵەوانەکان و پەیامی هونەریی ئەستریدیان خستۆتە بەر پرسیار و خانەی دوودڵییەوە، بەڵام ئەسترید بە هۆشیارییەکی

تەواوەوە پەیامی خۆی ئەنجام داوە و تەنانەت لە رووی ڕوانینەوە بۆ دنیای منداڵان، پێش ڕۆژگاری خۆی کەوتووە و توانیویەتی پێشبینی ئەو گۆڕان و هەیتوهووتە بکات کە لەم دە ساڵانەی دواییدا بەسەر ژیان و دنیای منداڵاندا هاتوون.

## منداڵی و چەردەیەك لە ژیانی ئەسترید و دەستکردنی بە نووسین

ئەسترید 14ی نۆڤەمبەری 1907 لە ڤیمەربی – سمۆلاند، لە کێڵگەیەکی وەقفی کەنیسەی "نێس"، لە خێزانێکی فەلاحدا کە لەو زەویە وەقفکراوەدا جوتیاری کردووە، لە سروشت و دەوروبەرێکی دڵفڕێن و هەڕاو ئازاددا هاتۆتە دنیا. بە ناوچەکەیان دەگوت: "سمۆلاندی تاریك"، بەڵام ئەسترید پێی وابوو کە دارستانەکانی کێوی و جوانن. خۆی ئاوا وەسفی دەکات: "ئەگەر تۆ جارێك، بەیانییەکی زووی یەکشەممەی مانگی یونی، ڕێتکەوتبێتە دارستانێکی سمۆلاند، دەمودەست وەبیرت دێتەوە کە چۆن گوێت لە خوێندنی شالوور و کوکوختی دەبێت، کە دەڵێی شمشاڵت بۆ لێ دەدەن، پێ پەتییەکانت دەنێی بە گیای ڕێچکەکاندا و هەستی پێ دەکەیت چەند نەرمە، یان کاتێ دەڕۆیت و هەتاو پشتی ملت گەرم دادەهێنێت، دەڕۆیت و حەز لە بۆن و بەرامەی کەتیرەی قەدی سنەوبەر و دار کاژەکان دەکەیت، گوڵی تووی فەرەنگیی مێرگەکان دەبینیت چەند سپین! (*Reberg, A. s. 128*)

خەڵکی ناوچەکە ڕەنجدەر و جووتیار بوون و لێرەوار و زۆنگاوەکانیان بە ئارەقەی ناوچەوان و ڕەنجی شان دەکردە زەوییەك کە بە کەڵکی کشتوکاڵ بێت. هەروەها دەڤەرێکی بەڕاز و ئەفسانە و گۆرانی و سەمای میللی دەوڵەمەند بوو، کە هەر لە منداڵییەوە زاخاوی مێشکی ئەسترییدیان داوەتەوە و دواییش بوونەتە هەوێن و ئیلهامی نووسینەکانی.

ئەسترید لە خێزانێکی ڕەنجدەر و بەختەوەردا گەورە بووە و دایك و باوکی زۆر یەکتریان خۆشویستووە، ئەوینەکەشیان تا دوا ڕۆژەکانی ژیانیان بەردەوام بووەو کارێکی زۆر چاکی کردۆتە سەر شەخسییەتی ئەسترید و برا و خوشکەکانی.

ئەسترید زۆر بە تاسە و خۆشییەوە باسی منداڵیی خۆی دەکات، کە پڕ بووە لە گەمە و گاڵتە و یاری و ئاهەنگ و کار و شادی و ڕەنگ و دەنگ و بۆن و.. ئەمانە لە یادگارەکانی سەردەمی ژیانی "نێس"ن و لە کتێبی "ساموئێل ئاوگوست لە سێڤێدستۆرپ و هاننا لە هولت"دا دەڵێت: "ئەمە قەت مانای ئەوە نییە کە ئێمە هەموو دەمێ ئازاد و بێکار و بەڕەڵا بووین، تەبیعی و ئاشکرایە هەر بە شەش ساڵان دەبووایە خۆمان لەسەر کار ڕابهێنایە، شێلممان پاك دەکرد و گزگزۆکمان پوخت دەکرد. دەشبووایە بچینە دروێنە و کاری کێڵگە و ئەمەش لە پاشەڕۆژدا سوودێکی چاکی بۆ من هەبوو".

هەر لە هەمان کتێبدا باسی ئەم دیمەنەی ناوچەکە دەکات و دەڵێت: "من هەمیشە و تا ئێستەش لەبەرچاومە، ئەو بۆن و بەرامەیە دێت بەسەرمدا و هەست بەو شادییە دەکەمەوە کە لە دیتنی گوڵەشیلانی لێڕەوارێکدا چەشتوومە و بۆ یەکەم جار تێگەیشتووم کە جوانی چییە! ئێستەش دەنگی باڵندەی ئێوارانی هاوینی لێڕەوارەکان و خوێندنی بایەقووشی سەر "دارەبایەقووش"ەکەی شەوانی بەهار لە گوێمدا دەزرنگێتەوە.. یان ئەو تەزووی خۆشییەی کە بە لەشی مرۆڤدا دێت، دوای ئەوەی لەبەر بەفرە سەرمایەکی لەش دەرزی ئاژنکەرەوە خۆت دەکەیت بە ماڵێکی گەرموگوڕدا،

دەزانم دەستهێنان بەسەر و لەشی تەڕی گوێرەکەیەکی تازە لەدایکبوودا چییە، یان بۆنی کەروێشك، یان هی گەوڕێك چۆنە! ئەی ئەو چوڕە شیرەی کە خوڕ خوڕ لە کاتی دۆشیندا بۆ ناو جامێك دێتە خوارێ، یان چڕنووکی جووجکێکی تازە لە هێلکە جووقاو چ تەزوو و نەشەیەك بە گیاندا دەهێنێت.. دیارە ئەمانە بۆ خۆیان شتانێکی ئەوەندە بەبایەخ و سەرنجڕاکێش نین بۆ ئەوەی بیر بکەونەوە، بەڵام گرنگی و بایەخەکەی لەو جۆشوخرۆشەدایە کە مرۆڤێکی تازە هاتووە دنیا هەستی پێکردوون و لەگەڵیاندا ژیاوە". ( *Lindgren, A. s. 54-55*)

ئەسترید دەڵێت: "ئێمە – مندالآن شارەزای هەموو دار و بەرد و گوڵ و گیا و دەریاچەکانی ئەو ناوە بووین. هەر خەریکی یاریکردن و یاریکردن و یاریکردن بووین، نازانم چۆن نەدەپڕووکاین کە ئەو هەموو گەمەیەمان دەکرد. ڕاستییەکەشی مندالآنی "نێس" ئەوەندە گوێڕایەڵ و ڕاستاڵ نەبوون و، ڕقی دنیایان لە گۆرەویی خوری لەپێکردن و قوتابخانەی یەکشەممان بوو".

ئەسترید تابلۆی ئەم ژیانە و هەڵسوکەوتی مندالآنی زۆر بە شیرینی لە کتێبەکانی "ئێمە، هەموو مندالآنی بولەربی"دا کێشاوە، یان لە زاری (ئێمیل)ی بچکۆلەوە دەڵێت: "ئای کە خۆشە لە جەژنەکانی زستان و هاویندا بە میوانی بچیت بۆ شوێنان و ئاهەنگ بگێڕیت، خۆشە لە عەرەبانەیەکدا وەنەوز بتباتەوە و دارستانی ڕەش و ئاسمانی شین بە ڕاسەرتەوە بن".

ئەسترید هەر لە مندالییەوە حەزی لە خوێندنەوە بووەو هەرچی بەردەست کەوتبێت خوێندوویەتیەوە. حەزی لە نووسینەکانی نووسەری ناسراوی دانمارکی، هانس ئەندرسن دەکرد و دواتر بە باوکی گیانیی خۆی دەزانی. هەروەها لە هی نووسەری فینلاندی، ساکاریس توپیلۆس. بە دەساڵی کارتی کتێبخانەی دەرهێناوە و دەستی کردووە بە خوێندنەوە. "ئۆدیسا"ی هۆمیرۆس، "ڕۆبنسۆن کروزۆ"ی روبرت لویس و کتێبەکانی مارك توین و ڕۆمانەکانی ژولیا ڤێرن و ئەوانەی تۆم سویر و دواتریش حەزی لە بەرهەمەکانی تۆڵستۆی و دستەیۆڤسکی و گوگەل و چێخەف و گۆتە و.. هتد کردووە. هاودەمی هەمیشەیی خوێندنەوە بوو، بە تایبەتی لەو ساتانەدا کە تەنیا بووە.

ئەسترید لە تەمەنێکی زۆر کەمدا بەهرەی نووسینی دەرکەوتووە. جارێکیان لە قوتابخانە ئینشایەك دەنووسێت، ئەوەندە جوان و سەرنجڕاکێش دەبێت کە لە ڕۆژنامەی ناوچەکەدا بڵاوی دەکەنەوە. هاوڕێیانی شۆخی و گاڵتەی لەگەڵ دەکەن و پێی دەڵێن: "لاگەرلوێڤی سمۆلاند" (سەلما لاگەرلوێڤ، 1858–1940، ژنە نووسەری ناسراو و دیاری سویدییە و خەڵکی ڤارملاندە). لە تەمەنی شانزەساڵیدا لە تاقیکردنەوەدا دەردەچێت و لە زمانی سویدیدا باشترین نمرە دەهێنێت. هەموو کەس دەیانزانی کە کچەکەی ئێریکسۆن زۆر جوان دەنووسێت، بۆیە کارێکی هەڵە ڕاستکردنەوەیان لە ڕۆژنامەی "ڤیمەربی"دا داپێی. ئەمە دەستی ئەستریدی کردەوە و دەربارەی ڕووداوەکانی ناوچەکە دەینووسی.

هاوینی ساڵی 1925. ئەسترید بەپێ لەگەڵ هەندێ لە دەستەخوشکەکانیدا بەرەو "ئۆیستەر یۆتلاند" کەوتنە ڕێ، بۆ ئەوەی سەر لە نووسەری ڕۆمانتیکی سویدی، (ئێلین کێی) بدەن. ئەسترید لە ڕۆژنامەی "ڤیمەربی"دا دەربارەی ئەم سەفەرەی نووسی. هەرچەندە ئەم نووسەرە زۆر بە ڕووخۆشی

و گەرمی نەهاتبوو بە ڕوویانەوە، بەڵام ئەم دیدەنییە ئاسۆیەکی ڕوونی لە بەردەم ئەستریددا کردەوە، کەسێکی بینی کە کتێبی دەنووسی و بە دیواری ژوورەکەشیەوە ئەمەی هەڵواسیبوو: "ڕۆژێك – کە باتەقای سەرانسەری ژیانێکە".

ئەسترید قەت ئەم ڕستەیەی لە بیر نەدەکرد و تەنانەت دواتریش کردی بە ناونیشانی بەشێك لە چیرۆکی "ئێمە لە دوورگەی ساڵتکرۆکان". ئەم سەفەرە بووە ماڵئاوایی ئەسترید لە سەردەمی منداڵی و ژیانی سمۆلاند.

کاتێ ئەسترید بووە هەژدەساڵان، چووە ستۆکهۆڵمی پایتەختی سوید بۆ ئەوەی کارێك بدۆزێتەوە. نووسەر دواتر ئەمەی بە وەرچەرخانێکی بەرچاو لە ژیان و چارەنووسی خۆیدا لە قەڵەم دەدا. لەم شارەدا کەسی نەدەناسی و ژیان و گوزەرانی زۆر سەخت و ناڕەحەت بوو، بۆیە دەستی کرد بەوەی خۆی فێری چاپکردن و ستینۆگرافی بکات. ڕۆژانی ئاسایی خەریکی کار و خوێندن بوو، بەڵام ڕۆژانی شەممە و یەکشەممان زۆر هەستی بە وەڕسی و تەنیایی دەکرد و هاودەمی ئەم ساتانەی کتێب بوو.

ئەسترید زۆر جار بە سکی برسی سەری دەنایەوە و ڕۆژی دەکردەوە. ئەو نامانەی لەو ڕۆژگارەدا بۆ ماڵەوەی نووسیوون. پڕن لە خەم و پەژارەیەکی گاڵتەئامێز، بیر جددی و نوکتە و قسەی نەستەق، بەتایبەتی ئەو نامانەی کە بۆ گوننار‌ی برای دەنووسین، چونکە بە تەمەن لە یەکەوە نزیك بوون. لە یەکێکیاندا ئاوهای نووسیوە: "من تەنیا و هەژارم. تەنیام، چونکە وەهام. هەروەها هەژارم، چونکە لە دە ئۆرەییەکی دانمارکی زیاتر هیچ شك نابەم. زیندەقم لەو زستانەی داهاتوو چووە" (*Braide, L. p. 487*)

لەم ماوەیەدا لاسەی کوڕی لەدایك بووەو لەبەر بێدەرامەتی ناچار بووە بیداتە دەست ماڵێکی دانمارکی لە کۆبنهاگن. لاسە لەو ماڵەدا لە هیچی کەم نەبووە، بەڵام ئەسترید زۆر بۆی ناڕەحەت و نیگەران بووە.

ئەسترید کارێکی لە مەڵبەندی کتێبی ڕادیۆی ستۆکهۆڵم دەست دەکەوێت. هەر ئەوەندەش پارەی بلیتێکی کەوتۆتە گیرفان، یەکسەر تێی تەقاندووە بۆ لای کوڕەکەی. دوایی لەبەرئەوەی بێ پرس ڕۆیشتبوو و مۆڵەتی لە کارەکەی وەرنەگرتبوو، دەریانکرد.

دواتر لە بیرۆی کۆمەڵەی شاهانەی ئۆتومۆبیل کارێکی وەگیرکەوت. ژیانی هەر هێشتا باش نەبوو و نەدارا بوو. لەم ماوەیەدا ئیدای نەنکی، هەندێ خواردن و کرۆنێکی بۆ دەنێرێت. ئەمیش لە نامەیەکدا ئاوهای بۆ دەنووسێت: "ئانوساتی وا هەیە لەم ستۆکهۆڵمەدا مرۆڤ لای وایە کە تاکە کرۆنێك گەنجی قاروون و ئەوپەڕی دەوڵەمەندییە و تاکە کرۆنەکەی تۆ نەنە! لەو وەختەدا هات". (*Braide, L. p. 487*)

ئەسترید تیا ماوەو نەیزانیوە چی لەم کرۆنە بکات، بیدات بە هەقی ترامی هاتوچۆ، بە پەنجا ئۆرەی سەری چاك بکات، یان چی! دوایی داویەتی بە کێك و قاوە.

بەهاری ساڵی 1931 کوڕەکەی دەبا و لای ماڵی باوکی دایدەنێت. هەر بەردەوامیش دەبێت لەسەر کارەکەی و زۆر لێی ڕازی دەبن و قەدری دەگرن. هەر ئەو ساڵە شوو دەکات بە ستورە لیندگرێن کە بەرپرسی ئەو دەسگایە دەبێت.

ساڵی 1946 لە چاپخانە و بڵاڤخانەی (*Raben & Sjogren*) دادەمەزرێت. ئەم دەسگایە بەرهەمەکانی ئەستریدی چاپ دەکرد. ئەسترید تا

سالی 1970 لەم بلاڤخانەیەدا سەرپەرشتیکەری بەشی منداڵان بوو، کار و تەقەلا و کۆششی ئەسترید لەوێ لە وەسف نایەت. دەستی دەیان نووسەری منداڵانی گرتووە و دەستنووسەکانی بۆ دەسکاری کردوون و ڕێنموونی کردوون و سەرنج و تێبینی بەنرخی دەربارەیان داونەتێ.

## هەڵویستی منداڵ و مرۆڤدۆستانەی ئەسترید

کاروباری خێزان و منداڵ و کار وای لە ئەسترید نەدەکرد کە ئاگای لە دنیا نەمێنێت و نەزانێت چ لە سوید و دنیادا ڕوودەدات. لە سێپتێمبەری 1939وە دەستی کردەوە بە نووسینی ڕۆژژمێرەکەی کە ناوی "جەنگ"ی لێ ناوە. ئەسترید، زۆر بە توندی دژی جەنگ و هەموو جۆرە شێوە کردارێکی ڕەگەزپەرستانە و ناسیستانە بوو. ئەم هەڵوێستە جوامێرانە و مرۆڤدۆستانەی ئەو، بە ئاشکرا لەم ڕۆژژمێرەدا دەردەکەوێت و تا دوایین ساتەکانی ژیانی هەر خاوەنی بیروباوەڕ و هەڵوێستی ئینسانیی بەرزبوو. ئەسترید زۆر جار خەڵات کراوە، بەڵام لە هەموویان زیاتر دڵی بە خەڵاتی ئاشتیی کتێبفرۆشییەکی ئەڵمانیا شاد بووە. لەو نرخاندنەدا ئەسترید وەك نموونە و سەرمەشق و ڕەمزی منداڵانی جیهان دەستنیشان کراوە و لیژنەکە دەڵێت: "بەرهەمی ئەسترید بانگمان ناکات بۆ ئەوەی لە واقیع هەڵبێین، بۆ پشت لە جیهان کردن و تەرکی دنیا هانمان نادات، ئەسترید ڕێنماییمان دەکات بۆ جیهانێك کە تێیدا دەتوانین پێبکەنین و بگرین، خەوببینین و بژین. کتێبەکانی ژیان و گەرمیمان بۆ دەهێنن، هەروەها شادی و سیحر و ئەفسانە. ئەم بەنیانی و هێمنی ڕابەریمان دەکات، بەڵام بە جەختکردن و سووربوونەوە لەسەر ئەوەی کە دەبێت هەست بە بەرپرسی بکەین و بۆ دابینکردنی ئاشتی، بێ قەید و شەرت، لەگەڵ یەکدی هەڵبکەین." (*Reberg, A. s. 114*)

هەر بۆ نموونە لە بۆنەیەکی تردا هەڵوێستێکی لەم بابەتەی هەیە و دەڵێت: "ئێمە لە جیهانێکی جەنجاڵ و نائارام و ئاڵۆزدا دەژین، من وەك دایکێك زۆرجار بیر لەوە دەکەمەوە، کە چی چاوەڕێی ئەو ملیۆنان منداڵە دەکات کە دایك و باوکیان لای لانکەکانیانەوە وەستاون. منداڵان داهاتووی ئێمەن، ئەوان دەربڕو بەدیهێنەری ئاواتەکانمانن، بۆیە ئەرکی ئێمەی گەوران ئەوەیە کە داهاتوویان بپارێزین. دەبێت جیهانێکی وایان بۆ بڕەخسێنین کە ئازار و چەوسانەوەی تێدا نەبێت".

ئەسترید نەك هەر بە نووسین، بەڵکو دارایی و سامانی خۆشی خستبووە گەڕ بۆ خزمەتی منداڵان، بە خەستەخانەکردنەوەو پرۆژەی تر، هەروەها داکۆکیی لە مافی منداڵانی بێگانە و بەتایبەتیش هی کورد دەکرد. لە وەڵامی ئەو نامەیەشدا کە ئێمە بۆ داوای ڕێگەی لە چاپدانی "میۆ، میۆکەی من" بۆمان نووسیبوو، ئاواتی بەوە خواستبوو کە ئەو کتێبە بکەوێتە بەردەست و چاوی منداڵانی کورد.

## چیرۆکی پیپی گۆرەویدرێژ

سالی 1941 کارینی کچی ئەسترید کە تەمەنی حەوت ساڵان دەبێت، چەند مانگێك نەخۆش دەبێت و لە جێگادا دەکەوێت. هەموو ئێوارەیەك پەلپ لە دایکی دەگرێت، کە شتێکی بۆ بگێڕێتەوە. جارێکیان ئەسترید لێی دەپرسێت: "باسی چیت بۆ بکەم؟ کارین دەڵێت: "باسی پیپی گۆرەویدرێژم بۆ بکە". ئەستریدیش لە خۆڕا دەست دەکات بە باسی پیپی و بە ئێواران لەسەری بەردەوام دەبێت.

ناوێکی ئاوا سەیر و سەمەرە، ڕازی لە بابەتی خۆشی دەوێت.

ئەسترید مارتی 1944 کە نۆبەفرێك بەسەر زوقمە کۆنەکەدا دەبارێت، لە کاتی چوونەدەرەوەدا دەخلیسکێت و قاچی ئەزیبەتی پێ دەگات. لەم ماوەیەدا دەست دەکات بە ڕێکخستن و نووسینەوە و پاکنووسکردنی "پیپی گۆرەویدرێژ" و دەیەوێت لە جەژنی دەساڵەی کاریندا بە دیاری پێشکەشی بکات. مانگی مایی 1944 دەستنوسێکی دەنێرێت بۆ چاپخانەی "بۆنیەش" و نامەیەکیشی لەگەڵدا دەنێرێت. نامەکەی ئەسترید بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم زۆر پێش ڕۆژگاری خۆی کەوتووە لە ناسینی دەروون و دنیای منداڵاندا و ئەو گۆڕان و بەرەو پێشەوەچوونەی بەزەیندا تێپەڕیووە کە لە داهاتوودا ڕوو دەدەن و دەڵێت: "ئەگەر تاقەت و یارانی خۆسەرقاڵکردنتان هەبێت بە پیپی گۆرەویدرێژەوە کە دەیبینن باڵا و شەخسییەتی منداڵێکە کە لە کەشوهەوایەکی ئاساییدایە، بەڵام تەئسیری خۆی هەیە و بەهۆی ئەو بەهێزییە لە ڕادەبەدەرەوە کە هەیەتی و بەهۆی هەندێ هەلومەرجی ترەوە، بە ئارەزووی خۆی و بێ گوێدانە دنیای گەوران ژیانی خۆی بە سەربەستی بەسەردەبات و چۆنی بووێت وا هەڵسوکەوت دەکات، کە دەشچێت بەگژ گەوراندا هەمیشە دوا قسە و سەرکەوتن هەر بۆ خۆیەتی. بۆ ئەوەی دڵنیابم لەوەی ئەنجامی کار بە کوێ دەگات، ئەوا نوسخەیەکی دەستنووسەکە دەنێرمە بەر دەست پسپۆڕانی ئێوە و هیوادارم (ئەوەندە پێی سەغڵەت نەبن) کە خەبەر بە کۆمەڵەی منداڵپارێزان بدەن. بۆ ئەوەی متمانەتان هەبێت، دەمەوێت ئاماژەی ئەوە بکەم و جەختی لەسەر بکەم، کە منداڵە فریشتە ئاسا و زۆر ڕاستاڵ و باشپەروەردەکراوەکانی خۆم هیچ تەئسیرێکی خراپ و زیانبەخشی هەڵسوکەوتی پیپیان لەسەر نییە ئەمان زۆر چاك لەوە گەیشتوون کە پیپی ڕەسەن و دانسقەیە و زۆر جیاواز و دەگمەنە و دەشێت ببێتە نموونە و سەرمەشق بۆ منداڵێکی ئاسایی. (*Reberg, A. s. 85-86*)

ئەوە بوو دوایی پیپی خەڵاتی یەکەمی پێشبڕکێی وەرگر و چاپ کرا.

ئاشکرایە کە لە ناوەڕاستی ساڵانی 1900ەوە ئەوە لە حوکمی یاسا و دابی ئەدەبی منداڵاندا بوو، کە پاڵەوانی کتێبی منداڵان و مێردمنداڵان دەبووایە قیبلەنوما و بینۆگەیەکی مۆراڵی هەبێت. ئەوەی کردەوەی خراپ بکات بە سزای خۆی دەگات. ئەوەشی کاری چاکە بکات، پاداشتی دەدرێتەوە. لەبەرئەمە ساڵی 1945 کە "پیپی گۆرەویدرێژ" بڵاوبووەوە، هەراو شۆڕشێکی نایەوە. هەموو کەس پێشوازیی گەرمیان لە ئەسترید نەکرد و هەندێك بە توندی کەوتنە ڕەخنەگرتن لەم بەرهەمە و هەندێ لەوانەی کە پسپۆڕی پەروەردە و پێداگۆکی بوون، پێیان وابوو کە خوێندنەوە و ڤیدیۆ و تەلەفزیۆن بەشێك لەو ئەزموونانە پێکدێنن کە کار لە منداڵ دەکەن، بۆیە ئاسان نییە بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ سەیری ئەو ئەدەبیاتی منداڵانە بکەین، کە زەبر و زەنگ دەکاتە چەکی چارەسەرکردنی گەلێ گیروگرفتی ئاڵۆز و سەخت. هەروەها مرۆڤ ناتوانێت بە ئاسانی پەیامی ئەدەبێکی وەهای منداڵان بسەلمێنێت، لەبەرئەوە گفتوگۆ دەربارەی خوو ڕەوشت و داب و نەریت لە ئەدەبی منداڵاندا دەبێت لە پێشی پێشەوە بێت.

هەر لەم ڕوانگەیەوە زۆر لەم کەسانە پێیان وابوو، کە پیپی بەو هەڵسوکەوتەیەوە نابێت ببێتە نموونەیەك کە منداڵان چاوی لێ بکەن، چونکە ئەو کە دز دێنە سەری خۆی بە هێزی بازووەکانی

تەمێیان دەکات، یان تاقەتی چوونە قوتابخانەی نییە و قەشمەریی پێ دێت، لە دەعوەتی قاوەخواردنەوەدا بێ تەقیە هەڵسوکەوت دەکات و لەم بابەتانە.

ئەسترید خۆی دەڵێت: "زۆر جار ژنان و دایکان بە من دەڵێن کە پاڵەوانەکانی من جەربەزە و چەقاوەسوون، هەر ئەوە نییە ئەنارشیستی تەواو بن. چەقاوەسوو، چەقاوەسوون، بەڵام ئێوە بە چاوێکی تر و لە گۆشەنیگایەکی ترەوە بۆیان بڕوانن. ئەوان لە کاتی تین و تەنگانەدا دەست لە هاوڕێ بەرنادەن و پشتی تێ ناکەن، ئەوان خاوەنی گیانێکی بەرز و دڵێکی گەورەن".

ئەم بۆچوونەی خۆی لە زمانی خانمی سێتەرگرینەوە دەربڕیوە، کاتێ دەیەوێت تۆمی و ئەنیکا لەگەڵ پیپیدا ڕەوانەی دەریای خواروو بکات، بەو ژنانەی کە پێیان وایە ئەمە کارێکی نەشیاوە دەڵێت: ڕەنگە پیپی هەموو وەختێ هەڵسوکەوتی باش نەبێت، بەڵام دڵێکی گەورەی هەیە و کەس ئەوەندە لەگەڵ تۆمی و ئەنیکا دلۆڤان نەبووە و قەتیش زیانی لێ نەداون".

بەڵام زۆر نووسەر و پسپۆڕی تر هەن، کە ڕایان پێچەوانەی ئەوانەیە کە ڕەخنە لە ئەسترید دەگرن و پێیان وایە ئەم بەرهەمەی زۆر بەرزە. یەکێکیان لای وایە کە کتێبەکانی ئەسترید دەورێکی بنەڕەتییان لە هۆشیارکردنەوەی نەوەی نوێی ژناندا بینیوە، کە ڕاپەڕیون لە دژی جەنگ، لە دژی پیسکردن و وێرانکردنی دەوروبەر، لە دژی مرۆڤ و حەیوان ئازاردان. (*Reberg, A. s. 87*)

هەروەها ئوللالوندگڤیست، کە لێکۆڵینەوەیەکی سێسەد لاپەڕەیی دەربارەی پیپی نووسیوە، دەڵێت: "من هەر لە منداڵییەوە پەیوەندییەکی زۆر شەخسی و تایبەتم لەگەڵ "پیپی گۆرەویدرێژ"دا هەیە. کاتێ کتێبی یەکەمی دەرچوو من تەمەنم حەوت ساڵان بوو. ئەوە یەکەم جارم بوو چێژ لە کتێب وەربگرم. پیپی بەردەوام و هەموو ساڵەکان لێم جیا نەدەبووەوە، دواییش بەهۆی برا و خوشکە بچکۆلەکانم و منداڵانی ترەوە، ئەوەم هەست پێدەکرد و بەدی دەکرد کە کتێبەکانی "پیپی گۆرەویدرێژ" لەگەڵ ئەو هەموو بەرەو پێشەوەچوون و گۆڕانکارییانەشدا کە لە سایکۆلۆژیا و پەروەردەکردنی منداڵاندا ڕوویان داوە، دەوری ڕزگارکەرانەی خۆیان لە دەستنەداوە. چاپی چەندین جارەیان و وەرگێڕانیشیان بۆ سەر زمانانی تر، بە ئاشکرا و ڕوونی دەریدەخەن کە کتێبی "پیپی گۆرەویدرێژ" چەند پێویستە بۆ منداڵ و کتێبێکە کە بەرتەسك و سنووردار نییە و دەربەستی شوێن و کات نییە" (*Reberg, A. s. 88-89*)

مارگرێتا ستریۆمستێت، جەختی ئەوە دەکات کە ئەسترید منداڵی پێش هەموو کەسێك مەبەستە و دەڵێت: "ئەو خوێنەری گەورە وەل دەکات و گوێی پێ نادات. هەر لە یەکەم لاپەڕەوە یەکسەر چاوبڕکێ لەگەڵ خوێنەری منداڵدا دەکات و بەرەڵایان ناکات و چاویان لێ کلا ناکات. هەندێ شوێنی ڕازەکانی ئەوە دەردەخەن، کە ئەو هەر بە دەوری خوێنەری منداڵدا دەسووڕێتەوە و خوێنەری گەورە دەداتە دەست چارەنووسی خۆی." (*Reberg, A. s. 129*)

## نووسەرایەتیی ئەسترید و بیروڕای دەربارەی ئەدەبی منداڵان

لە ئەستریدیان پرسیوە: چ مەبەستێکت لە نووسینی کتێبەکانتدا هەیە؟ ویستوتە چ بیرێك بە زمانی پیپی گۆرەویدرێژەوە دەربڕێت؟ چۆن مرۆڤ دەتوانێت بەهۆی کتێبی منداڵانەوە تەئسیریان

تێبکات و پەروەردەیان بکات؟ ئەی کتێبێکی چاکی منداڵان چۆن دەبێت و کامەیە؟ هەروەها شتی زیاتری لەم بابەتانە. ئەسترید وتویەتی: "وەڵامتان دەدەمەوە و دەڵێم من ئەوەندەی تۆزقاڵێك مەبەستێکی ئاوهام نەبووە، چ لە کتێبی پیپی و چ لە ئەوانی تریشمدا. من کە دەنووسم دەمەوێت منداڵێتی لە ناخی خۆمدا ببزوێنم و بە ئومێدم هەر بەو شێوەیەش تۆزێ خۆشی ببەخشمە منداڵانی تر." (*Reberg, A. s. 142*)

ئەسترید لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "من کتومت دەزانم چۆنە یان ڕاستتره بڵێم چۆن بوو کە منداڵی فەلاحێکی سمۆلاندی بیت و چۆنە هی شارێکی بچکۆلە بیت، هەر بۆیەشە زۆربەی باسوخواسی کتێبەکانی من لەو دەوروبەر و کەشوهەوایەدا ڕوو دەدەن. "منداڵانی بولەربی"، ئێمیل لە لوێنەباریا"، "ڕاسموس" و "منداڵانی مێرگی خواروو"، دیهاتیی تەواون و لە دەرەوە دەژین، "پیپی گۆرەویدرێژ"، "سەرۆکی پشکنەران بلومکڤیست"، "منداڵانی برۆکماکەرگاتان" و "مادیکن" هی شاری بچکۆلەن. دوای ئەوەی من 30 ساڵی ڕەبەق لە دوورگە پڕ زنار و دارستانەکانی ستۆکهۆڵمدا ژیام، ئەوسا زاتی ئەوەم کرد کتێبێك دەربارەی ئەوێ بنووسم. "ئێمە لە ساڵتکرۆکان"، "کاڵسۆن دیسان لە سەربانەوە دەفڕێت" پاڵەوانی ڤاساستانی ستۆکهۆڵمن. ئەو دەوروبەرەش باش شارەزام، چونکە ئەوە شەست ساڵە لێی دەژیم. وەك وترا: من بە هۆشیارییەوە بە تەگبیر و مەبەست هەوڵی ئەوە نادەم کە منداڵ پەروەردە بکەم یان تەئسیری تێ بکەم، تەنیا دنەی خۆم دەدەم و بە ئومێدم کە ڕەنگە کتێبەکانم تۆزێك یارمەتیی ئەو منداڵانە بدەن کە دەیانخوێننەوە، تا مرۆڤدۆست بن و حەزیان لە ژیان بێت و بناغەی ڕوانینێکی دیموکراتییانەیان هەبێت." (*Reberg, A. s. 142-143*)

هەروەها ئەسترید ڕووی دەم لە نووسەری منداڵان دەکات و پێی دەڵێت: ".. کە کەسێك نییە لەم سەرزەمینەدا فێری ئەوەت بکات چۆن بۆ منداڵان بنووسیت. بۆ خاتری خودا! پێت وا نەبێت کە من کەشوفشی کتێبەکانمت بەسەردا دەکەم و لاموایە دەتوانم ڕۆڵی ڕێنیشاندەرێکی گەورەت بۆ بگێڕم. نەخێر! بەڵام من چارەکە سەدەیەکم لە چاپخانەیەکی کتێبی منالاندا بەسەر بردووە و هەموو جۆرە دەستنووسێکم بەلادا تێپەڕیوە، هەندێ پەند و دەرسی بچووکم وەرگرتوون و ڕەنگە بە دەرد بخۆن و سوودێکیان لێ ببینیت، ئەمانە دەستوورێکی زۆر هاکەزایین و ئەوەکەی تری دەکەوێتە سەر خۆت، کە تا چەندێ توانای خوڵقاندن و داهێنانت هەیە." (*Lindgren, A. s.69*)

هەروەها ئەسترید دەڵێت: "یەکەم شت مەسەلەی زمانە، من لاموایە لە هەموو شتێك گرنگ و بەبایەخترە، دەبێت زمان و ناوەڕۆکی کتێبەکە هارمۆنیایەکی وایان هەبێت کە "یەکەیەکە" دروست بکەن. ئەگەر تۆ ڕووی قسەت لە پێنج ساڵان بێت، ئەوا ئەو وشە و زاراوانە بەکار مەهێنە کە دەبێت بەلای کەمەوە ئەو منداڵە تەمەنی دە ساڵان بێت، تا تێیان بگات. من دەزانم ڕاست نییە ئاوها بم لەگەڵت، تۆ دیارە ڕەچەتەیەکی لەم چەشنەت نەدەویست. کەسێك تۆزێ هۆش و ئاوەزای هەبێت، قەت پێی وا نابێت کە مرۆڤ بە گوێرەی ڕەچەتە دەتوانێت دابنیشێت و کتێبێکی چاك بۆ منداڵان بنووسێت، بێگومان تۆ دەزانیت شیعر ئامێزیش مەرجێکی پێویستی کتێبی منداڵانە – ئەگەر باش بێت و بەهایەکی هەبێت – هەروەك چۆن بۆ هەموو ئەدەبیاتێکی دیش پێویستە." (*Lindgren, A. s.69*)

ئەسترید گەشە بەم بیروبۆچوونانەی دەربارەی ئەدەبی منداڵان دەدات و دەڵێت: "هەندێ نووسەری وا هەن دڵگران و زیز دەبن ئەگەر پیاو سەرنجیان بۆ ئەو وشانە ڕابکێشێت کە هەڵیانبژاردوون ولێیان بپرسێت: ئاخۆ ئەوان ئاگایان لەوەیە کە بۆ منداڵان دەنووسن!؟ ئەوسا ئەوان لێت دێنە دەم و دەڵێن: نابێت نرخ بۆ منداڵ دانەنێیت، پیاو نابێت لای وابێت کە پێویستە ئاستی خۆی نزمبکاتەوە، لەبەرئەوەی بۆ منداڵ دەنووسێت. ئەوان زۆر لەوە زیاتر تێدەگەن پیاو بۆی دەچێت. منیش هەر بیرو بۆچوونم وایە، کە پیاو دەبێت لەگەڵ منداڵدا دەربارەی هەموو شتێك بدوێت، بەڵام ئەمەش هەمووی بەوەوە بەندە کە چۆن پیاو لەگەڵیان دەدوێت و وایان لێ دەکات گوێ بگرن. ڕاستە مرۆڤ دەبێت ئەو وشانەشیان بداتێ کە نایزانن بۆ ئەوەی خۆشیی چێژ لە وشە وەرگرتن و زانینیان لا بوروژێنن.. زۆر چاکە، وا بنووسە هەم بۆ منداڵ و هەم لەبەربای دڵی گەورانیش خۆش بێت، بەڵام دەستم دامێنت! هەرگیز لە کتێبی منداڵاندا ئەوە مەنووسە کە عەقڵت پێت دەڵێت، هەر بۆ گەوران خۆشە." (*Lindgren, A. s.70-71*)

هەر لە سەر گرنگیی زمان و دەوری زمان و جۆری نووسینی، لێنارت هیلسینگ، کە پسپۆڕێکی ئەم مەیدانەیە، دەپرسێت: "کە ئاخۆ ئەو نهێنییە چییە لە نووسیندا و چی ئەو توانایە دەدات بە نووسەر کە سەرنجی منداڵ و هی گەورانیش بەیەکەوە بۆ لای خۆی ڕابکێشێت!؟" خۆشی دەڵێت: "ماوەیەکی زۆر لام وابوو نهێنییەکە لە زماندایە، بەڵام پێموایە هەمووشی هەر کاری زمان نییە بە تەنیا، بەلای زۆرەوە لە ڕوانیندایە بۆ ژیان و لە شێوەی نووسین و داڕشتنیشدایە". (*Edstrom, V. s 7*)

ئەسترید خۆی پێیوایە کە نووسەری ڕاستەقینە هەمیشە بەشێك لە دڵی دەخاتە نووسینەکەیەوە. لە "هەڵبەستراوەکانی من"دا دەڵێت: "ژان و ئەندێشەی منداڵییەکی دوور بلاْچە دەدەن و دێن لە یادی مرۆڤدا دەبریسکێنەوە، وەکوو لە ئاگرێکی بڵێسەدارەوە بێن وایە و نووسەری هەڵکەوتوو، جیهان و گەردوونێك بە هێزی ژیان و مەکۆیەکی تایبەت بە خۆیەوەیان لێ دەخوڵقێنێت." هەر خۆی وتوویەتی: "کە هەموو منداڵییەك سەرنجڕاکێشە." ئەو ئیدیاڵەی کە بووە بە باو و ترادیسیۆن، ئەم گیانێکی نوێی دەکات بە بەردا و قوڵپە خوێنی تازەی پێ دەبەخشێت، ئەو دنیایانە بە شێوەیەکی هاوچەرخ بنیات دەنێتەوە، کەوا دەکەونە نەخشەی جیهانی منداڵیی ئەمڕۆ و ئێمەوە. (*Edstrom, L. s. 10-11*)

منداڵیی ئەسترید و خوشك و براکانی جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەوانەی "ڤیمەربی"دا نەبوو، هەر ئەوە بوو ئەمان زۆر سەرەخرێ بوون و حەزیان لە یاری بوو. ئەسترید هەموو ئەم موتیڤ و وێنە و دیمەنانەی بە شێواز و ستایلێکی بەرز و ناسك دەردەبڕی و تەئسیری سەبکی ئینجیلیش بە هەندێك لە نووسینەکانیەوە دیارە. ژوور و وڵات و موبەق – سیمبوْلی هەموو ماڵ و سرووشتن بە خۆشی و ناخۆشییەوە. ئەو شتانە هەموو ڕەمزی خۆیان هەیە. هەروەها دارستان و شار و باخچە. ئەسترید، ڕاز و ئەفسانەکان چ وەك ئامێرێك بۆ نیگارکێشانی ژیانی ئادەمیزاد و چ وەك شێوازێك بۆ ئەوەی هێزێکی ئەفسووناوی بدەنە ڕاز و چیرۆکەکانی – بەکاردێنێت، بە کورتییەکەی ئەم هەم ترادیسیونیست و هەم نوێخوازە. کاتێ ئەسترید ژیان و سرووشت لە ئاست ڕەقی و زەبرو زەنگدا ڕاست دەکاتەوە، باڵای زیاتر وەك

شاعیرێك هەڵدەچێت. لەو ڕاز و چیرۆکانەیدا كە واقیع دەردەبڕێت و دەیداتە بەر ڕۆشنایی و مانایەكی پێ دەبەخشێت، بەهێزترین ئەنجام وەدەست دێنێت، بەڵام بەشێوەیەكی ئاسان و ڕەوان و گەمە و گاڵتەئامێزیش دەریدەبڕێت. جاری وا هەیە موتیڤێك بە چەند ستیل و ئاستی جیاجیا دەردەبڕێت. یان بە شێوەیەكی كۆمیدیایی، یان ڕازی بابەتی شۆڕەسواری، یان بە زمانی ئاسایی ڕۆژانەی خەڵك، یان لە كاتی باسی یاری و گاڵتەو پێكەنیندا، لە كتێبێكدا بۆ دەربڕینی بابەت و ناوەڕۆك، ئاستی زمانەكەی جۆراوجۆر و هەمەڕەنگە.

ئەسترید لەسەرجەمی نووسین و بەرهەمیدا، بە پلەی یەكەم، مەبەستی منداڵ بوو، هەمیشەش لە كانی دڵیەوە و بە نەرم و نیانی لەگەڵیان دەدوا، لە كۆڕێكدا كچێكی بچووك لێی پرسیوە: "كاتێ تۆ چیرۆك دەنووسیت، یەكسەر ناونیشانی بۆ دادەنێیت، یان دوایی؟" ئەو گەورانەی لەوێ دانیشتوون هەموو دەدەنە قاقای پێكەنین و گاڵتەیان بەم پرسیارە دێت. تەنیا ئەسترید پێناكەنێت و زۆر بەجددی وەڵامی كچەكە دەداتەوە و دەڵێت: "جاری وا هەیە چیرۆكەكە پەیدا دەبێت و دوایی ناونیشانەكە. جاری واش هەیە شێوەی پاڵەوانەكە دەكەوێتە ڕوو، ئەوسا ناونیشان و ڕووداوەكان هەموو بە دەوری ئەمدا كۆ دەبنەوە." (*Braide, L. p.487*)

كاتێ لە ئەسترید دەپرسن، كە ئاخۆ كتێبی منداڵان دەبێت چۆن بێت، دەڵێت: "ئەگەر تۆ لە من دەپرسیت كتێبی منداڵان دەبێت چۆن بێت، من دوای زۆر ڕامان و بیركردنەوە وەڵامت دەدەمەوە كە دەبێت كتێبێكی چاك بێت. باوەڕم پێ بكە! من زۆر جار بیرم لەم مەسەلەیە كردۆتەوە و لەوەش زیاتر كە وتم، هیچ وەڵامێكی دیكەم بە بیردا نەهاتووە." (*Lindgren, A. s. 67*)

نووسەر پەرە بەم گۆشە نیگایەی خۆی دەدات و دەڵێت: "كاتێ تۆ دەتەوێت كتێبێكی هەژێنەر بۆ منداڵان بنووسیت، كە چەند سەخت و مەحاڵە لەم دنیایەی ئێمەدا مرۆڤ بیت، دەبێت تۆ لەمە گەیشتبیت و ماف ئەمەت هەبێت. ئەگەر تۆ دەتەوێت دەربارەی چەوسانەوە لەسەر جۆری ڕەگەز و خەباتی چینایەتی بنووسیت، دەبێت تۆ ماف ئەمەت هەبێت. كە دەشتەوێت دەربارەی دوورگەیەكی باوەش شین و پڕ گوڵ بنووسیت، دیسانەوە دەبێت ماف ئەمەت هەبێت." (*Lindgren, A. s. 71-72*)

هەروەها لە ئەستریدیان پرسیوە، كە ئاخۆ دەیەوێت بۆ گەوران بنووسێت، ئەم وەڵامی داوەتەوە: "نا! نامەوێت بۆ گەوران بنووسم".

ئەمە دوا وەڵامی بووەو وتویەتی: "من دەمەوێت بۆ ئەو خوێنەرە بنووسم كە توانای خوڵقاندنی پەرجوو (موعجیزە)ی هەیە، ئەمەش منداڵان دەیخوڵقێنن، كاتێ كتێب دەخوێننەوە و بیری پەرت و شێواو و بێسەروبەری ئێمە وەردەگرن و ژیانی بەبەردا دەكەن و دەیدرەوشێننەوە".

هەر ئەم بیرەشیەتی كە لە زمانی پیپی و تۆمی و ئەنیكاوە دەریدەبڕێت، كە ئەوان هیچ حەزیان لە دنیای پڕ سەرقاڵی و هەیتوهووتی گەوران نییە و نایانەوێت قەت گەورە بن.

ئەسترید سیمبولی منداڵانە و خۆشەویستیانە، چونكە زۆربەی ژیان و هەموو بەرهەمەكانی بۆ ئەوان و ئازادی و خەملاندن و بەرەو پێشەوە بردنی جیهانی ئەوان تەرخان كردووە.

## چەند وشەیەك دەربارەی كردنی
## پیپی گۆرەویدرێژ لە سویدییەوە بە كوردی

دوای چاپ و بڵاوبوونەوەی "میۆ، میۆكەی من"ی ئەسترید لیندگرێن بە كوردی، چاپخانەی (*Raben & sjogren*) پێشنیاری بۆ بڵاڤخانەی "ئاپێك" كردبوو، كە هەر سێ كتێبەكەی "پیپی گۆرەویدرێژ"یش بكرێن بە كوردی و بە كتێبێكی گەورە چاپ بكرێن. "ئاپێك"یش ڕووی لە ئێمە ناو ئێمەش پەسەندمان كرد، بەبێ ئەوەی – سەرباری ئاگاداری و چەند جار خوێندنەوەی كتێبەكە – تا چوونیە ناو كارەكەوە لە ئاڵۆزی و سەختیی وەرگێرانی ئەم بەرهەمە گەیشتبین.

"پیپی گۆرەویدرێژ" كاری بنەڕەتی و بڕبڕە پشتی بەرهەمەكانی ئەستریدە، بە خۆڕاییش نییە كە ناو وناوبانگی ئەسترید لە سەرەتادا و بەشێوەیەكی فراوان بەم بەرهەمەیەوە بەندە و نووسین و دەمەتەقێ و باسوخواسیش دەربارەی هەر نەبڕاوەتەوە. ئاشكرایە مرۆڤ ناتوانێت قورسی و ئاڵۆزیی كارێكی ئەدەبی 400 لاپەڕەیی و ماوەی زیاد لە دوو ساڵ كوڵ و ئەندێشەی كاركردن و بە كوردیكردنی ئەم بەرهەمە لەم چەند لاپەڕەیەدا جێ بكاتەوە. ئێرە جێگەی ئەوەش نییە، كە مرۆڤ سەری خوێنەر و مندالان بەوەوە بیەشێنێت. خۆ خوێنەریش "كاڵەكخۆرە نەك بێستانڕن!" بەلام بۆ كەسێ مەبەستی بێت، بەتایبەتی كە خەریكی نووسین و كاری وەرگێران بێت بۆ مندالان، ڕەنگە تۆزێ دووان لەم ئەزموونە سوودێكی هەبێت، یان بۆ كەسانێك كە بە پەلەپەل بیانەوێت ڕەنج و كۆششی فەرهادانەی خەڵك بە نووكە قەڵەمێك و هەندێ قسەی بازاڕی و نەزانانە ئەمدیو و ئەودیو بكەن و سەری خەڵكی بیەشێنن. بە كورتی لە هەندێ گیروگرفت دەدوێین.

دیارە و ئاشكرایە زمانەكەی ئەسترید ئاسان نییە بۆ وەرگێران، جا زمان بە هەموو ئاست و لابەلا و خەسیەتەكانیەوە. ئەسترید ئەم خەملاندنی زمانەی لە چوارچێوەی سویدیدا – زمانە ئەسڵەكەدا – كردووە و مەبەستی بووە بە زمانێك بنووسێت لای مندالْ خۆش بێت. ئەمەش هەر بە شارەزایی دەستووری زمان نابێت، بەڵكو دەبێت شارەزای هەست و نەست و خولیای مندالان بێت و لەم ڕوانگەیەوە ئاست و هەمەڕەنگیی زمان بخەیتە كار، بەلام گیروگرفتی ئێمە وەك وەرگێر، زیاتر لە مانای وشە و ڕستە و فراز و لایەنەكانی تری زماندایە، كە چۆن هاوتای پڕ بەپێستیان بە كوردی بۆ بدۆزینەوە. كەواتە پڕیشكێكی گەورەی سەختی و هەڵزنان بۆ هەڤدان بە دەقەكە و نەشێواندنی، ئێمەشی گرتۆتەوە.

ئەسترید خۆی سەرجەم، نەك هەر سروشت و دەوروبەر و داب و نەریتی سویدی و جەژن و لایەنەكانی ژیاری و كۆمەلایەتیی سوید، بەڵكو شتە تایبەتییەكانی شارێكی بچكۆلەی سمۆلاند، هەروەها شێوە زمانەكەشی لەم بەرهەمەیدا وەكوو گەلێكی تری، بەكارهێناوە.

خۆی "پیپی گۆرەویدرێژ" دەخاتە خانەی ژیانی شاری بچكۆلەوە. ئەمە لەلایەك و لەلایەكی ترەوە ئەو هەموو پەند و قسەی نەستەق و ناسكوێژییەی كە لە زماندا خستوویەتیە گەڕ، ئەگەر دەقاودەق هەندێكیان بكرێن بە كوردی، نەك خوێنەری كورد تێیان ناگات، بەڵكو ڕەنگە ببێتە مایەی لاقرتی و سەرسووڕمانیش. زۆر جار هەر تەرجەمەی ڕستە و شتە ئاڵۆزەكان قورس نییە، بەڵكو ڕستەی وا هەیە لە زمانی سویدیدا كە ماڵ و

پیاوی شارەزووری کوردی سوید هەموو دەیزانن، بەڵام وەرە چۆن ئەمە دەکەیت بە کوردی، هەر بۆ نموونە کەس هەیە نەزانێت کە : *"Jag klarar mig alltid", sa Pippi.* مانای چییە؟ بەڵام باوەڕتان هەبێت، چەندیٚ بۆ ڕستەیەکی پڕ بەپێستی ئەمە گەڕاوین، ئەوەمان نەدۆزیوەتەوە کە دڵمان ئاو بخواتەوە. تەنانەت لەو تۆزە سەرودەرییەشدا کە لە هەندیٚ زمانی تردا هەمانە، هەر باتەقایەکی سەدلەسەد و هەقی تەواودەر بەم ڕستەیەمان چنگ نەکەوتووە.

بێجگە لە بەکارهێنانی فراز و وشەی باوی ڕۆژانە و شتی تری لەم جۆرە، ئەسترید بۆ تەواو کێشانی نیگاری شەخسییەتی پیپی، دەوری وشەداتاشین و شێواندنیشی داوەتیٚ. — پیپی هەروەك سەیر و دەگمەنە، دەبێت زمانەکەشی لەخۆی بچێت– لێرەدا ئەسترید لە سەنگەری پیپییەوە پلارێکیش دەگرێتە پرۆفیسۆرە زمانەوانەکان، ئەوانەی وشە دەدۆزنەوە و دادەنێن! پیپی بە لاساییکردنەوەی ئەمان وشەی "سپونك" دادەهێنێت و دەگەڕێت بە دوای ماناکەیدا! یان بە کوردیکردنی ئەو هەموو خەیاڵبازی و شووڵلێهەڵکێشان و فیشاڵبازییانەی پیپی، کە دەچنە چوار چێوەی فانتازیایەکی ڕووت و جڵەوی خەیاڵ شلکردنەوە. ئەمەش هەمووی بۆ کەمەنکێشکردن و ڕاکێشانی سەرنج و وروژاندنی منداڵانە. بۆ نموونە، کە گایەك لە پەنجەرەی شەمەندەفەرەوە دەفرێتە ژوورەوە و سەیری خشتەی کاتی شەمەندەفەرەکە دەکات کە کەی دەگاتە فاڵشوێپین! یان باهۆزی ناو دەریا و فڕینی مێووژی ناو شۆربا و پێستی پشیلەکە و ئەو هەموو خواردن و تەختەیەی فریدۆڵف لووشی دەدات. جاری وا هەیە مرۆۆ بەدگومان و لەخۆ دوودڵ دەکات، کە ئاخۆ شتی وا دەبێت و ئێمە بە ڕاستی تەرجەمەمان کردووە!

ئێمە ناوەکانمان نەگۆڕیوە — هەرچەندە کار لەوەش ئاسانتر نییە، ئەگەر پیاو بیەوێت — هەروەها داب و نەریت و دەوروبەرە سویدییەکەمان هەر وەك خۆیان هێشتوونەوە، چونکە ئەمە بەرهەمێکی سویدییە و با منداڵی کورد، بەتایبەتی ئەوانەی لە کوردستان و دەرەوەی سوید دەژین، کە کەسوکار و هاوڕیٚ و کۆمەڵێکی نیسبەتەن زۆری خەڵکی هاوزمان و هاوولاٚتییان لەم ولاٚتە دەژین، با ئەوانیش شارەزاییەك لە کولتووری سویدیدا پەیدا بکەن. گرنگ ئەوەیە و بە ئومێدین کە توانیبێتمان بە زمانێکی ڕەوانی وەها کە خەڵك و بەتایبەتی منداڵاٚن تێی بگەن، ئەم بەرهەمەمان کردبێت بە کوردی. ئەینا هەرچی ناوە بیگۆڕیت: "بەراز" بکەیت بە "مەڕ" و "بیرە" بکەیت بە "شەربەت" و.. هتد بەڵام زمانی وەرگێرانەکەت لار و خوار و پڕ گرێوگۆڵ بێت، هیچ داد نادات. تۆ با لەوەش بگەڕێین کە بەشێك لە کاراکتەرو باڵاٚی هونەریی پیپی بەندە بە ناوەکەیەوە. لە تەرجەمەدا بۆ زمانە ئەورووپاییەکان، پیپی وەکوو خۆی ماوەتەوە، بە لای ئێمەوە گۆڕینی پیپی بۆ ناوێکی عەرەبی، فارسی، یان کوردی زەدەکردن و شێواندنی ڕەسەنێتیی شەخسیەتی پیپییە.

بێگومان ئێمەش جاروبار هەندیٚ وشەی کوردی پڕبەپێستی وشە سویدییەکانمان بۆ نەدۆزراوەتەوە، بۆیە هەوڵمانداوە شتێکی نزیك لەوەی لە زمانی کوردیدا بۆ بدۆزینەوە. بۆ نموونە "*pannkaka*" کە بە تام و شێوە لە "شلکێنە"ی کوردی دەچێت. ئەوە خۆ ناوی هەندیٚ نوقڵ و شیرینی و شۆکولاد هەن، کە تا ئێستەش لە کوردستاندا نین و منداڵی کورد نازانێت تام و

ناویان چییە. زۆر جار ئەو ناوانەمان وەك خۆیان هێشتۆتەوە یان وشەیەکی ترمان، کە کتومت ئەوەش نەبێت و لێیانەوە نزیك بێت، بەکارهێناوە.

بە کوردیکردنی "پیپی گۆرەویدرێژ" بێ بەکارهێنانی فەرهەنگ، کاری کەردەنی نییە. مەبەستمان لەوەیە، کە خوێنەر بزانێت ئەمە وەك کاری کانهەڵکەندن وایە و زەحمەت و کوڕە! قیرسیچمەیی و تاقەتێکی زۆری دەوێت و ئێمەش بەشی خۆمان لەم بەزمەمان بووە. لێرەدا هەر بەمەندە واز دەهێنین و خوێنەر خۆی دەتوانێت بۆچوون و ڕای خۆی هەبێت و ئەو سەنگی مەحەکی نرخاندنی چۆنێتیی وەرگێڕانەکەیە. هەرچەندە خراپ نییە، ئەوەشی بخەینەوە یاد کە ئەمە بەرهەمی یەکێکە لە نووسەرە گەورەکانی دونیا و ئەدەبی منداڵان.

دوای ئەو هەموو هەوڵ و ڕەنج و تەقەلایە و دوای ئەوەی وەرگێڕانەکەمان چەندین جار پاکنووس کردەوە، دەربارەی هەندێ شوێن و کردنی بە کوردی، بیروبۆچوونمان ئاڵوگۆڕ دەکرد و کە دەشمانخوێندەوە، پێمان وا بوو: "ڕەنگە خراپمان نەکردبێت بە کوردی!" لەگەڵ ئەمەشدا بۆ دڵنیایی زیاتر بڕیارماندا کە لەگەڵ وەرگێڕانە عەرەبی یان فارسییەکەدا ئەوەی خۆمان بەراورد بکەین. ئەوەندەی ئێمە بزانین، هەر کتێبی یەکەمی کراوە بە عەرەبی و فارسی (شایانی باسە، کورتکراوەیەکی کتێبەکە لەلایەن فەرهاد شاکەلییەوە کراوە بە کوردی).

کتێبی یەکەممان لەگەڵ وەرگێڕانە عەرەبی و فارسییەکەدا بەراورد کرد، بەڵام هێشتا دڵمان ئاوی نەخواردەوە و گەڕاین، تا خواوڕاستان، هەرسێ کتێبەکەمان بە ڕووسی چنگ کەوت، کە ژنێکی ئەستریدناسی ڕووس، (ل. برایدە) کە زۆربەی بەرهەمەکانی کردووە بە ڕووسی و چەندین جار سەری لە ستۆکهۆڵم لە ئەسترید داوە و گفتوگۆی لەگەڵ کردووە و کە ئەستریدیش لە ڕووسیا بووە، لەگەڵی بووە، بۆیە هەرسێ کتێبەکەمان لەگەڵ تەرجەمە ڕووسییەکەدا بەراورد کرد و ڕاستییەکەشی لەملاولەولا گەلێ هەڵە و پەڵەی خۆمانمان پێ ڕاست کردەوە. ئەمەش ورە و دڵنیابوونێکی داینێ.

ئێمە مەبەستمان لەم سەرگوزشتە نووسینە هێشتا ئەوە نییە، کە خوێنەر لەوە دڵنیا بکەین کە ئەمە کارێکی بێ کەموکوڕییە و ئیتر ئەو پەڕیەتی. بە پێچەوانەوە، خوێنەر و وەرگێڕ و نووسەری ئازیز! ویستوومانە بڵێین کارەکە ئاسان نییە و ئەگەر هەڵە و ناتەواویی دیشمان بەسەردا تێپەڕیبوو، ئەوا بە وردە سەرنج و تێبینیی ئێوەو کەسانی سویدی و کوردی زان، دەتوانین کارەکە پوختتر بکەین و سا ئەگەر خوای کرد و لە کوردستان چاپ کرایەوە، ئەوا ڕەچاوی ئەو سەرنج و بیروڕا بەجێیانەتان بکەین.

دەمانەوێت لە کۆتاییشدا بڵێین، کە ئەو چەند لاپەڕەیەی دەربارەی ژیانی ئەسترید و بەرهەمەکانیەتی، زیاتر ئامادەکردنە تا نووسین و توێژینەوە، چونکە ئێمە پێمان وایە: "دەبێت بتوانین چی بخەینە سەر خەرمانی ئەو هەموو نوسین و لێکۆڵینەوە لە ژمارەنەهاتووەی کە بە زمانی سویدی و زمانانی تر دەربارەی ئەسترید و بەرهەمەکانی نووسراون؟" ڕاستە ئێمە خۆمان دامانڕشتۆتەوە و گوڵبژێری ئەو خاڵ و لایەنانەشمان کردووە کە لە مەودای کورتی ئەم چەند لاپەڕەیەدا جێگەیان بێتەوە و بەتایبەتی خوێنەر و نووسەری کوردمان لەبەرچاو گرتووە. هەندێ شوێن، کە بە پێویستمان زانیبێت، ئاماژەی

سەرچاوەکەشمان کردووە و لە کۆتاییشدا ناوی ئەو سەرچاوانە هەن، کە یارمەتیی نووسینی ئەم چەند لاپەڕەیەیان داوین.

## بەرهەمەکانی ئەسترید لیندگرێن

### کتێبی منداڵان و لاوان

1944 بریتماری دڵی خۆی دەکاتەوە.
1945 شەشتین و من.
1945 پیپی گۆرەویدرێژ
1946 پیپی گۆرەویدرێژ سواری کەشتی دەبێت
1946 سەرۆکی پشکنەران، بلومکڤیست
1947 ئێمە، هەموو منداڵانی بولەربی
1948 پیپی گۆرەویدرێژ لە دەریای خواروو
1949 نیلسن کاڵسۆن – پیوسلین
1950 کایسا کاڤات
1950 کاتتی لە ئەمریکا
1951 سەرۆکی پشکنەران، بلومکڤیست لە خەتەردا دەژی
1952 تەنیا هەر خۆشی و شادییە لە بولەربی
1952 و 1971 کاتتی لە کاپیتانگاتان (کاتتی لە ئیتالیا)
1953 کالە بلومکڤیست و ڕاسموس
1954 میۆ، میۆکەی من
1954 کاتتی لە پاریس
1955 لیللەبرور و کاڵسۆن لە سەربان
1956 ڕاسموس بە گەڕۆکی
1957 ڕاسموس، پۆنتوس و توکەر
1958 منداڵانی برۆکماکەرگاتان
1959 مێرگی خواروو
1960 مادیکن
1961 لۆتتای بۆرکماکەرگاتان
1962 دیسان کاڵسۆن لە سەربان دەفڕێت
1963 ئێمیلی لوێنەباریا
1964 ئێمە لە دوورگەی ساڵتکرۆکان
1966 بزێوی و پەنگە تازەکانی ئێمیلی لوێنەباریا
1968 دیسان، کاڵسۆن لە سەربان، بە پێدزکە دێت
1970 هێشتا ئێمیل لە لوێنەباریا دەژی
1973 برایان، شێردڵ
1976 مادیکن و سەنگپای یونیباکە
1979 پیپی گۆرەویدرێژ سنەوبەری جەژنی لەدایکبوون کۆ دەکاتەوە و لا دەبات
1981 کچەچەتە، ڕۆنیا
1984 کاتیٚ ئیدای بچکۆلانە دەیەوێت بزێوی بکات
1985 بزێوی ژمارە 325ی ئێمیل
1986 ئێمیلی لوێنەباریا وتی: بیٚ هیچ چرووکی و ڕەزیلییەك
1987 ئاسەر بووبلا
1991 کاتیٚ لیسابێت بە پەنجە لەتکەنۆکێکی ئاخنیە لووتیەوە
1993 مادیکن وتی: پشووی جەژنی کریسمس هەڵبەستراوێکی چاکە

### کتێبەکانی تری ئەسترید

1971 هەڵەبستراوەکانی من، هەڵبژاردەیەکە لە پیپییەوە تا ئێمیل

1975 ساموئێل ئاوگوست لە سێڤێدەستۆرپ و هانا لە هولت، نووسەر دەربارەی باوك و دایك و منداڵیی خۆی دەدوێت. ساڵی 1987 چاپێکی تازەی ئەم کتێبە دەرچوو و دوو وتاری پێشووتر

چاپبووی ئەستریدیشی خرابووە سەر و لەگەڵیدا بڵاوکرابوونەوە.

1987 سمۆلاندی من، بە هاوکاری لەگەڵ مارگریتا ستریۆمستێت. وێنەکان هۆگۆ نورمان گرتوونی.

1990 مانگاکەم دەیەوێت بەخۆشی بەسەری بەرێت. ئەمە هاتنە دەنگە لە دەمەتەقێیەك کە دەربارەی حەیوانپارێزی بوو، چۆن و بۆچی دەبێت ئاوها بێت، بە هاوکاریی کریستینا فۆشلوند، نیگارەکان هی "بێون بێری"ن.

1992 جەژنی کریسمسێك کە من منداڵ بووم -ڕازێکە-. سەپەرشتیکار: هاریەت ئەلفۆنس و مارگوت هێنریکسۆن.

1993 کتێبی بیرەوەرییەکانی لۆتا. نیگارەکان هی ئیلۆن ڤیکلاندن.

بەرهەمەکانی ئەسترید کراون بە 63 زمان، بڕوانە:

*Reberg, A. Uppvaxt med Astrid Lindgren. Stockholm, 1996.*

## سەرچاوە

ئەمە پاشەکی کتێبی "پیپی گورەویدرێژ"ی نووسەری ناسراوی سویدی ئەسترید لیندگرینە، کە ئەنوەر قادر محەمەد و خەبات عارف لە سویدییەوە کردوویانە بە کوردی.

# حکومەتە سەرۆکایەتی و پەرلەمانیەکان

عبدالرحمان عالم

لە فارسییەوە: دلاوەر عەبدوللا

حکومەتەکان لەسەر بنچینەی پەیوەندی نێوان دەسەلأتی یاسادانان و دەسەلأتی ڕاپەڕاندن ڕیزبەندی کراون. ئەگەر دەسەلأتی ڕاپەڕاندن لەبەرامبەر پەرلەمان یان دەسەلأتی یاساداناندا بەرپرسیار بێت ئەو حکومەتە بە پەرلەمانی یان کابینەیی ناوزەد دەکرێت، بەلأم ئەگەر دەسەلأتی ڕاپەڕاندن بەرپرس نەبێت لەبەردەم پەرلەماندا سیستمی حکومەت دەبێتە سەرۆکایەتی. لەسیستمی سەرۆکایەتیدا دەسەلأتی ڕاپەڕاندن لە پەرلەمانەوە نەهاتوە یان پەرلەمان ناتوانێت لەکاری بخات. بەواتایەکی دی حکومەتی پەرلەمانی یان کابینەیی لەسەر هاوکاری و ئیتلاف دەسەلأتی یاسادانان و ڕاپەڕاندن وەستاوەو حکومەتی سەرۆکایەتیش لەسەر جودایی تەواوی ئەو دەسەلأتانە چەقیبەستوە. بەریتانیا نمونەی حکومەتی کلاسیکی پەرلەمان و ئەمریکاش نمونەی حکومەتی سەرۆکایەتیە.

بۆناسینی وردتری سیستمی حکومەتی پەرلەمانی و سەرۆکایەتی پێویستە سەبارەت بەئۆرگانەکانی حکومەت وجیاکردنەوە و هاوسەنگکردنی دەسەلأتەکان ڕونکردنەوە بدرێت.

### 1- ئۆرگانەکانی حکومەت:

هەروەك لەلێکۆلێنەوەی توخمە پێکهێنەرەکانی دەوڵەتدا باسکرا، حکومەت جێبەجێکارێکە بەهۆیەوە ئیرادەی دەوڵەت ڕێکدەخرێت و دادەڕێژرێت، ڕادەگەیەنرێت و پاشان دەچێتە قۆناغی پراکتیکەوە. حکومەت ئامرازێکی پێویستە بۆ خزمەتکردنی ئامانجەکانی دەوڵەت. دەتوانرێت لەڕوانگەی خاك، دابەشبونی ولأت یان لەڕوانگەی کارکردن ببینرێت. لەڕوانگەی خاکەوە حکومەتەکان لەسەر دوو ئاستی جۆراوجۆر ڕاوەستاون: سەنترالی، هەرێمایەتی یان لۆکالی. لەڕوانگەی کارکردنەوە حکومەت بەشێوەیەکی نەریتیانە بۆ سێ لق دابەش دەبێت: دەسەلأتی یاسادانان، دەسەلأتی ڕاپەڕاندن و دەسەلأتی داد.[1] لقی یاسادانان ئیرادەی دەوڵەت دادەڕێژێت، لقی ڕاپەڕاندن دەیخاتە بواری پراکتیکەوەو لقی دادیش

ئەو ئیرادەیە ڕاڤە دەکات و چاودێری دروست پیادەکردنی دەبێت.

هەموو لێکۆڵیاران لەسەر دابەشکردنی سێ لایەنەی ئەرکەکانی حکومەت کۆك نین. (ویلفوبی) دەڵێت: دەبێت دوو دەسەڵاتی دیش زیاد بکرێت. یەکێکیان ڕێکخستنی ئیداری و ئەویدیان لیژنەی دەنگدەرانە. (فاینەر) دەڵێت: بۆ هەنگاونانی تەواوی حکومەت دووشت پێویستن: بڕیاردان و پیادەکردن. لقی بڕیاردان باس لە (گروپی دەنگدەران، پارتە سیاسیەکان، پاڕلەمان، کابینەو سەرۆکی دەوڵەت) دەکات و لەلقی پیادەکردنیشدا باس لە (کابینە، سەرۆکی حکومەت، کارمەندان و دادگا) دەکات. دەڵێت: (بۆئەوەی هەنگاوەکانی حکومەت کامڵ بێت هاوکاری نێوان سەنتەری سەرەکی چالاکی سیاسی پێویستە. ئەم دیدە هێشتا لەلایەن گشتەوە پەسەند نەکراوە. بەڵام لقی ڕێکخستنی ئیداری، کەلەناو دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنەوە هاتووەو نوێنەری (کوالیستۆن- هەواڵبەندی دەسەڵاتی یاسادانان، ڕاپەڕاندن، بەشی بەڕێوەبردن و دادگایە)خۆی وەك دەستەواژەی (لقی چوارەمی دەوڵەت) دەخاتەڕوو. گومانی تێدا نییە دەستەی دەنگدەران و پارتە سیاسیەکان سەنتەری گرنگی چالاکی سیاسین. لەگەل ئەوەشدا ئۆرگانە ئاساییەکانی حکومەت پێکناهێنن.

چۆن ئەم ئۆرگانانە پێکەوە کاردەکەن؟ لەو وڵاتانەی پەڕلەمان لەکۆمەڵێك حزبی سیاسی پێکهاتوە بڕیارەکان لەسەر ئاستی پارت و وەزیرەکان وەردەگیرێن و پاشان وەك لیست بەدەسەڵاتی یاسادانان دەدرێت. ئەم لیستە لەوانەیە کۆمیتەکان یان کۆمیسیۆن دەسەڵاتی یاسادانان بدرێت و ئەو قۆناغە جۆراوجۆرانە لەیەك یان دوو کۆبونەوەی یاسادانەراندا بخرێتە دەنگدانەوە، ئینجا لەلایەن بەرپرسانی خاوەن دەسەڵات ئیمزا دەکرێت و لەڕۆژنامەی فەرمیدا بڵاودەبێتەوەو هێزی پیادەکردن بەدەستدەهێنێت. دەبێت دەستوری کارکردن سەبارەت بەشێوەی پیادەکردنی ئەو یاسا قبوڵ کراوە لەسەر شێوەی ڕێنمایی یان ڕونکردنەوە بەکارمەندان بدرێت. ئەو تاکانەی پەیڕەوی ناکەن لەلایەن پۆلیسەوە دەسگیر دەکرێن و دەدرێن بەدادگاو بۆ سزادان بەند دەکرێن. بەمجۆرە ئاشکرایە کەبەڕێوەبردنی پێویستی بەهاوکاری نزیك و هاوئاهەنگی نێوان لقە جۆراوجۆرەکانی حکومەتە. ئەگەر یەکێك لەو لقانە کەموکورتی لەبەجێهێنانی ئەرکەکانیدا بنوێنێت یان خۆی لەهاوکاری ببوێرێت، شڵەژان و ئاژاوە دێتە ئاراوە. ئەگەر ئۆرگانە جۆراوجۆرەکانی حکومەت خۆیان لەهاوکاری یەکدی بەدوربگرن یان دەست بخەنە ناوکاروباری یەکدییەوە، ژیانی ڕێکخراوو شارستانی دەکەوێتە بەرمەترسی. بۆ بەڕێوەبردنێکی لێوەشاوە پێویستە ئۆرگانەکانی حکومەت یەکگرتوانە کاربکەن و ملکەچی ئەو بڕیارانە بن، کە بۆ دەستەبەرکردنی ئامانجەکانی دەوڵەت پێویستن تائازادی تاك زامن بێت و بەدیبێت.

## 2- جیاکردنەوەی دەسەڵات:

(مۆنتسکیۆ) لەو باوەڕەدا بوو بۆئەوەی مرۆڤەکان ئازادبن دەبێت سێ دەسەڵاتەکە لەیەکتری جیابن. بەواتایەکی دی ئازادی مرۆڤەکان پێویستی بەجیاکردنەوەی سێ دەسەڵاتەکەیە. ئەم تیۆرە بەو واتایە دێت، کەسێ ئەرکەکەی حکومەت لەلایەن گروپی جیاجیاوە جێبەجێ بکرێت و هەریەك لەوگروپانەش دەبێت لەبواری کاری خۆیدا سنوردار بێت و لەو بوارەشدا سەربەخۆو باڵادەست بێت.

بەزۆری تیۆری جیاکردنەوە یان دابڕینی دەسەڵاتەکان بۆ (ئەرستۆ) دەگێڕنەوە، کەوەک سێ ئەرکی حکومەت ئاماژە بۆ ڕاویژکردن، پیادەکردن و دادوەری دەکات. ئۆرگانی ڕاوێژکاری لەلای ئەرستۆ پرسەکانی جەنگ و ئاشتی، دانانی یاسا، پێکهاتنی یەکێتیەکان، سەپاندنی سزاکان، دورخستنەوەو دەسبەسەراگرتنی داراییەکان و هەروەها دانانی پلەکانی جێبەجێکردن دەگرێتەوە. ئۆرگانی جێبەجێکردنیش ئەرکێکی شێوە تایبەتمەندی هەیە، بەڵام ئۆرگانی ڕاوێژکاری لەو زیاتر پشکی لەبەردەستدایە. سەرئەنجام ئۆرگانی دادوەریی، کەبریتی نییە لەگروپێك دادوەر، بەڵکو دادگا گشتیەکانە. لێرەوە دیدی (ئەرستۆ) جیاکردنەوەکانی (مۆنتسکیۆ) یان ڕەوشتی نوێ زۆر جیاوازترە.

لەسەدەی شانزەدا (ژان بۆدین) پێشنیازی کرد نابێت (میر– شهریار)ئەرکی بەڕێوەبردنی دادپەروەری لەئەستۆ بێت و دەبێت بسپێرێت بەدادگایەکی جیاواز. جیانەکردنەوەی دوو دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن و داد بەواتای (ئاوێتەکردنی ڕاستەوخۆی دادپەروەری و بەبەزەییبون، ڕەچاوکردنی وردی یاساو نادیدەگرتنی بەئارەزویان) دەبێت.

لەسەدەی حەڤدەدا ئاماژەکانی ئەم تیۆرە لەنوسینێکی (ژان لاك)دا بەناوی (حکومەتی مەدەنی) دەبینرێت، کە ئاماژە بەدابەشکردنی دەسەڵاتەکان بۆ یاسادانان، ڕاپەڕاندن و (فیدانیڤسی –فیدراتیۆ) دەکات. (ژان لاك) لەوبڕوایەدابوو ئەم ئامڕازانە لەکۆمەڵگەی مەدەنیدا بۆ پاراستنی مافە سروشتیەکان، کەمرۆڤ وەك بونەوەرێکی ئاقڵ خۆبەخۆ ئەو مافانەی هەیە، دروستکراون. (ژان لاك) لەوباوەڕەدابوو لەکۆمەڵگەی بەرژەوەندییە هاوبەشەکاندا، کەباش ڕێکخراوە، دەبێت دەسەڵاتی یاسادانان لەڕاپەڕاندن جودابێت، لەهەمان کاتیشدا هەماهەنگی بەپێویست دەزانێت و جەختی لەسەر دەکاتەوە.

(مۆنتسکیۆ) لەنوسینێکیدا بەناوی (ڕۆحی یاساکان)، کە لە (1748)دا بڵاوکراوەتەوە، تیۆری کلاسیکانەی دەسەڵاتەکانی خستۆتەڕوو، ئەم تیۆرەش بەناوی (مۆنتسکیۆ)وە ناسراوە. تیۆرەکەی لەسەر هەڵسەنگاندنی هۆشمەندانەی سایکۆلۆژی دەسەڵاتخوازی مرۆڤ وەستاوە. لێکدانەوەی میکانیزمی دامەزراوەی سیاسی بەریتانیا (مۆنتسکیۆ)ی گەیاندە ئەو باوەڕەی کەئینگلیزەکان بەشێوەیەکی سەرەکی توانیویانە بەرامبەر بەیەك سود لەئازادی ببینن، چونکە دەستوریان بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتی پیرۆز کردوەو بەرزنرخاندویەتی. لێرەوە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە بۆ بەدەسهێنانی ئازادی، نابێت دەسەڵات چڕکراوە بێت، بەڵام بەگشتی بڕوای (مۆنتسکیۆ) ئەوەبوو، کەئەو ڕۆحە ڕزگار دەکات، کەلەڕەهەندی حکومەتدایە نەك لە سیستمەکەیدا. لەو بڕوایەدا بوو تەنها لەحکومەتە میانڕەوەکاندا ئازادی هەیە، لەوێشدا تەنها لەبارێکدا هەیە، کەخراپ سود لەدەسەڵات وەرنەگیرێت. بۆ ڕێگرتن لەو خراپ بەکارهێنانەش پێویستە هەموو شتەکان بەدروستی جێگایان دیاری بکرێت، دەسەڵات بەدەسەڵات کۆنترۆڵ بکرێت. دەبێت دەستور بەجۆرێك دابڕێژرێت، کە هیچ کەس ناچار بەهەڵسوڕاندنی کارێك نەبێت، کەیاسا پێینەسپاردبێت یان ئەو کارانە ئەنجام بدات، کەیاسا مۆڵەتی ئەنجامدانی نەداوە). بەمپێیە بنەمای تیۆرەکەی بۆ دابەشکردنی سێ لایەنەی ئەرکەکانی حکومەت نییە، بەڵکو بۆ دابەشکردنی

دەسەڵاتە (لەنێوان بەرپرسەکاندا کەلەوانەیە ڕەقیبی یەك بن). دوائامانجی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی (مۆنتسکیۆ) میانڕەوی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی (مۆنتسکیۆ) میانڕەوییەو دەرئەنجامەکەشی ئازادی مرۆڤەکانە.

پوختەی دیدەکانی (مۆنتسکیۆ)، کە زۆر باسدەکرێت، ئەمەیە:

(ئێستا دەبێت لەوە تێبگەین ئەگەر یەکێك لەوسێ دەسەڵاتە دەستبخاتە ناو کاروباری ئەوانی دییەوە یان هەرسێ دەسەڵاتەکە لەدەستی یەك تاکە کەس یان دەستەیەکدا بێت یان دەسەڵاتی یاسادانان و ڕاپەڕاندن تێکەڵ بکرێن یان دەسەڵاتی داد لەپشکی یەك لەو دوو دەسەڵاتەی تردا بێت یان بەپێچەوانەوە، دەبێت دامەزراوەی دەوڵەت و هەلومەرجی ژیانی خەڵکی چی بەسەر دێت؟

کاتێك دەسەڵاتی یاسادانان و ڕاپەڕاندن تێکەڵ بکرێن و لەپشکی تاکەکەسێکدا یان دەستەیەکدا بن ئیدی ئازادی بونی نامێنێت، چونکە ئیتر دەبێت سڵ لەوەبکرێتەوە کەئەم تاکە کەسە یان دەستەیە یاسای زۆردارانە دابڕێژرێت و بەزۆریش بیخاتە بواری پیادەکردنەوە، هەروەها ئەگەر دەسەڵاتی داد لەدەسەڵاتی یاسادانان و ڕاپەڕاندن جودا نەبێت دوبارە ئازادی بونی نابێت، لەبەرئەوەی پشکی ژیان و ئازادی تاکەکان خۆپەرستانە دەبێت و کاتێك دادوەر خۆی یاسادانەرو خۆشی جێبەجێکار بوو دەسەڵاتەکەی زۆردارانە دەبێت. ئەگەر تاکێك یان دەستەیەکی پێکهاتوو لەپیاوانی ناسراو و دەوڵەمەند ئەم سێ دەسەڵاتەیان لەژێر چنگدا بێت، واتە هەم یاسا دابنێن و هەم بڕیاری گشتی بخەنە بواری پراکتیکەوەو هەم کێشەو گرفتی نێوان خەڵك چارەسەر بکەن و سزای تاوانبارانیش بدەن ئەو دەمە هەموو شتێك لەناو دەچێت.[3]).

بەمجۆرە (مۆنتسکیۆ) نەیاریی چڕبونەوەی دەسەڵاتەکان بوو لەدەستی تاکەکەسێك یان دەستەیەکداو بڕوای وابوو، کەئەرکەکانی هەرسێ ئۆرگانەکەی حکومەت لەئەستۆی کەسانی جیاوازدا بن. بەوتەی (فاینەر) (مۆنتسکیۆ) (گەڕانی بەدوای ئەمڕازی سنوردارکردنی پاشا بۆ دۆزینەوەی دەستور، ڕێچکەکانی، کەبەهۆیەوە نەك لەسەروو یاساوە دەسەڵات پیادە دەکرێت، (لیژنەی ناوبژیوان) بۆ ڕێگری لەئەگەری زۆرداری و زیادەڕەویکردن لە دیموکراسی بوو[4]). سەرنجڕاکێشە ئەوە بزانرێت (مۆنتسکیۆ) بەپێچەوانەی ئەوەی وێنادەکرا هەرگیز لەبیری جیاکاری تەواو و ڕەهادا نەبوو، بەڵکو تەنها چاوی لەکەمکردنەوەو چڕکردنەوەی دەسەڵات بوو. لەگەڵ جەختکردنەوەی لەسەر بەڕێوەبردنی دامەزراوەیی ڕایگەیاندوە کەئازادی بەرهەمی ڕۆحی ئازادو میانڕەوییە. جگەلەمەش (مۆنتسکیۆ) لەخستنە ڕووی تیۆری جیاکاری دەسەڵاتەکاندا ئەوەی دیاریکردوە کەڕەنگە (ببێتە هۆی باری ڕاوەستاو و چەقبەستن)، بەڵام تاڕادەیەك زاڵبوو بەسەر نیگەرانیەکەیدا: (بەڵام بەحوکمی جوڵەی شتەکان ناچار دەبن هارمۆنی و هاودەستانە بجوڵێن). (سابایین)یش لەو بڕوایەدابوو کە (مۆنتسکیۆ) چاوی لەجیاکارییەکی سنوردار یان ڕێژەیی دەسەڵات بوو: (لەڕاستیدا مۆنتسکیۆ خواستی جیاکاری ڕەهای دەسەڵاتی نەبوو. دەبێت دەسەڵاتی یاسادانان بەپێی خواستی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن کۆببێتەوە، دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن مافی ڤیتۆکردنی بڕیارەکانی دەسەڵاتی یاسادانان بۆخۆی دەپارێزێت

و دەسەڵاتی یاسادانان دەبێت پشکی دادوەری نائاسایی پیادە بکات[5].

### 3- کۆنترۆڵ و هاوسەنگیەکان:

تیۆرەی کۆنترۆڵ و هاوسەنگیەکانیش وەك تیۆری جیاکاری دەسەلاَتەکان لە هزری (مۆنتسکیۆ)وە هاتون. جدی بونی (مۆنتسکیۆ) لەدەستەبەرکردنی ئازادی مرۆڤەکان بەرەو ئەو ڕێچکەیەی برد کەنابێت تەنها سێ ئۆرگانی (یاسادانان، ڕاپەڕاندن و داد) بەسبێت، بەڵکو دەبێت هەریەك لەئۆرگانەکانی حکومەت کۆنترۆڵ بکرێن. (مۆنتسکیۆ) دەیویست دەسەلاَت ڕامبکات و بەرامبەر بەخراپ بەکارهێنانی فلتەرێك دابنێت، لەڕاستیدا دەیویست دەسەلاَت بەدەسەلاَت ڕامبکات. ئەوەی لە هزریدا بوو شتێکی لەجۆری وەك سیستمی (کۆنترۆڵ و هاوسەنگیەکان)بوو.

بۆ یەکەمجار لەئەمریکا تێزی کۆنترۆڵ و هاوسەنگیەکان و جیاکردنەوەی دەسەلاَتەکان لەکاتی داڕشتنی دەستوری ئەو وڵاتەدا پەسەند کرا. حکومەت نەك تەنها بۆ کۆنگرێس (پێکهاتەی ئەنجومەنی نوێنەران و سەرنا)، سەرۆکایەتی کۆمارو دادگای فیدراڵی دابەشبوو، بەڵکو ئەم ئۆرگانانەی حکومەت بونە خاوەنی کۆنترۆلکردنی یەکدیش، بەجۆرێك تاهیچ کامیان بۆ دیکاتۆریی نەگۆڕێن. دەستوری ئەمریکا لەگەڵ تایبەتمەندکردنی تەواوی هەریەك لەدەسەلاَتەکان بەلقێکی حکومەتەوە(بەواتای بەشی شێر) بەشێکی بچوکتریشی بە هەریەکە لەو بەشانە بەخشی[6]. دەبێت هەموو لقەکانی حکومەت خۆیان لەو سنورەدا بهێڵنەوە کەدەستور بۆی دیاریکردون. کۆنترۆڵەکان لە ئەمریکا بەمجۆرەیە:

1- کۆنترۆڵەکانی سەر دەسەلاَتی ڕاپەڕاندن. دەسەلاَتێکی مۆنۆپۆلی ڕاپەڕاندن بەسەرۆك کۆماری ئەمریکا دراوە. ڕێگاپێدانەکانی زۆرو بەرپرسیاریەکانی گرانن. دامەزرێنەرانی کۆمەڵگەی ئەمریکی ویستویانە دڵنیابن لەوەی سەرۆکی کۆمار نابێتە دکتاتۆرێك. لەبەرئەوە مافیان بەئەنجومەنی سەنا داوە پەیماننامەکان و گرێبەستەکانی دەوڵەت بخاتە بەردەنگدان یان بیروڕا لەسەر پۆستە بەرزەکانی وڵات دەرببڕێت. هەموو پەیماننامەکانی ئەمریکا دەبێت دوو بۆ سێی ئەنجومەنی سەنا دەنگی بۆ بدات. سەنای ئەمریکا پەیماننامەی بەناوبانگی (ڤێرسای) ڕەتکردەوەو ئەو وڵاتە نەیتوانی ببێتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. لەوەش زیاتر هەرکاتێك سەرکۆمار بەئارەزوی خۆی بجوڵێتەوە ئەگەر هەیە لەلایەن کۆنگرێسەوە بکەوێتە بەرپرۆسەی تاوانبار کردن. مەترسی ڕاگەیاندنی تاوانبارکردن وەك شمشێری (داموکلیس) لەسەر سەرۆکی ئەمریکاوە هەڵواسراوە. دیوانی باڵاش وەك کۆنترۆڵێك سەبارەت بەخراپ بەکارهێنانی دەسەلاَت لەلای سەرۆك کۆمار کاردەکات. ئەم دیوانە دەتوانێت هەنگاوو فەرمانەکانی سەرکۆمار بەپێچەوانەی دەستور دابنێت و لەو ڕێگایەوەو لەڕووی یاساییەوە ڕایگەیەنێت کەمایەی جێبەجێکردن نییە.

2- کۆنترۆڵەکانی سەرکۆنگرێس (دەسەلاَتی یاسادانان). دەستور ڕێگەپێدانێکی مۆنۆپۆڵ کراوی تایبەتی یاسادانانی بەکۆنگرێس بەخشیوە. ڕێگا بەسەرۆك کۆمار نەدراوە بەشداری کۆبونەوەکانی کۆنگرێس بکات، بەلاَم بۆ ڕێگەگرتن لەئەگەری زۆرداری کۆنگرێس، مافی ڤیتۆ بەسەرۆك کۆمار بەخشراوە. لە زۆر بواردا مافی ڤیتۆی

هەڵپەسێردراوی سەرۆك كۆمار كارامەیی خۆی پیشانداوە. ئەو داواكاریانەی سەرۆك كۆمار پاش ڤیتۆكردنی دوبارە بۆ كۆنگرێسی دەنێرێتەوە تا دەنگی لەسەر بدرێت، كەپێویستی بە دووبۆ سێ لەدەنگەكان دەبێت و زۆرینەی دوو بۆ سێش بەئاسانی بەدەست نایەت. بۆ سەرۆك كۆماریش هێندە دژوار نییە تا (3|1+1)ی دوو ئەنجومەن بەدەسبێنێت. تامەیلی كۆنگرێس بۆ زاڵبون بەسەر ڤیتۆی سەرۆك كۆمار پوچەڵ بكاتەوە.

سەرەڕای بونی ڤیتۆو هەڕەشەی بەكارهێنانی، سەرۆك كۆمار دەتوانێت لەڕێگای پەیمانەكان، كۆنفرانسە نارەسمیەكان لەگەڵ سەرۆكی ئەنجومەن، لەگەڵ سەرۆكی فراكسیۆنەكانی لەئەنجومەن و كەسایەتیە گرنگەكانی دیكەی كۆنگرێس كاریگەری لەسەر كۆنگرێس پیادەبكات. لەورێگەیەوە كارتێكردنی سەرۆك كۆماری ویلایەتە یەكگرتوەكان لەكۆنگرێس بەتەواوی فرە ڕەهەندە. سەركۆمار بەوەش، كەمافی دەركردنی فەرمانی ڕاپەڕاندنی هەیە لەكاتی قەیرانەكان یان ڕوداوە پێشبینی نەكراوەكاندا، ڕۆڵی یاساساز دەگرێتەوە. دیوانی باڵاش وەك كۆنترۆڵێكی سەر كۆنگرێس كاردەكات و دەتوانێت یاساكانی كۆنگرێس پوچەڵ بكاتەوە، ئەگەر بەپێچەوانەی دەستور دابڕێژێت. هەمان ئەو پشكە بەسە تاكۆنگرێس لەجێگای خۆیدا بهێڵێتەوە.

3- كۆنترۆڵەكانی سەر دەسەڵاتی داد. ئەگەر چی دەسەڵاتی دادی فیدراڵی بەسەربەخۆ ناسراوە، بەڵام لەدەسەڵاتی كۆنگرێس نەپارێزراوە. كۆنگرێس مافی ئەوەی هەیە دژ بەدادوەرەكان تاوانباركردن ڕابگەیەنێت و لەلایەكی دیشەوە دانانی دادوەرەكانی فیدراڵ لەلایەن سەرۆك كۆمارەوە بەڕەزامەندی (سەنا) ئەوە پیشاندەدات، كە دەتوانێت هەركاتێك پۆستێك بەتاڵ بێت لەپێكهاتەی دادگای فیدراڵدا ڕۆڵێكی یەكلاكەرەوە ببینێت. كۆنگرەش مافی ئەوەی هەیە ژمارەیەك لەدادوەرەكان و مافەكانیان دیاری بكات. هەروەها كۆنگرە دەتوانێت دەسەڵاتی تێهەڵچونەوە (ئیستئناف)ی دادگای فیدراڵی سنوردار بكات.

سەبارەت بەمیكانیزمی تیۆری جیاكردنەوەی دەسەڵات لەبەریتانیا دەبێت بوترێت لەدیموكراسی پەرلەمانیدا تیۆری جیاكردنەوەی ڕەهای دەسەڵات بەكارێكی مەحاڵ دانەنراوە، چونكە دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن لەناودەرونی دەسەڵاتی یاسادانانەوە هەڵدەبژێرێت و لەبەرامبەریدا بەرپرسیارە. پەرلەمان دەسەڵاتی یاسادانانە و دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن و ئینجا دەسەڵاتی داد، كەسەربەخۆیە لەدەسەڵاتی ڕاپەڕاندن، لەژێرسێبەری خۆیدا كۆدەكاتەوە. بەڵام ئەم سادەكردنەوەیە زیاد لەپێویست واقیعیە. سیستمی كابینەیی زیاتر لەجیاكردنەوەی دەسەڵاتەكان دەلالەت لەچڕبونەوەی دەكات. كابینە هێڵێكی پەیوەندییە كەوەك بەندێك بەشەكانی ڕاپەڕاندن و داد پێكەوە گرێدەدات. ئەو كابینەیەی لەئەنجومەنی عەوامدا لەلایەن زۆرینەوە پشتگیری بكرێت دەتوانێت بەهۆی دەستورەوە چی بخوازێت ئەنجامی بدات. ڕیشەی كۆنترۆڵ و هاوسەنگی لە دەزگا سیاسیە باڵاكانی بەریتانیادا شایانی پیادەكردن نییە. ئەنجومەنی لۆردەكان بەرزترین دادگای تێهەڵچونەوەیە. لۆرد چانسەر یان سەرۆكی لۆردەكان ئەندامی كابینەی بەریتانیایەو كاتێك ئەنجومەنی لۆردەكان دەبێتە دیوانی تیهەڵچونەوەی ئینگلستان دەبێتە دادوەری یەكەم. بەمپێیە جیاوازییەكی ڕون لەنێوان پشكەكانی دەسەڵاتی یاسادانان، ڕاپەڕاندن و داد لەبەریتانیا نابینرێت.

پاش ئەم لێکۆڵینەوە کورتەی ئۆرگانەکانی حکومەت و تیۆری جیاکردنەوەی دەسەڵات و ڕونکردنەوەی پوخت دەربارەی کۆنترۆڵەکان و هاوسەنگیەکان ئێستا دەکرێت لێکۆڵینەوە سەبارەت بەدوو سیستمی پەڕلەمانی و سەرۆکایەتی حکومەت دەسپێبکرێت و لەژێر ڕۆشنایی ئەو بابەتانەدا کەباسکران دوبارە پێناسە بکرێنەوە.

### 4-فۆرمی حکومەتی پەڕلەمانی.

لە فۆرمی پەڕلەمانیانەی حکومەتدا هاوبەندییەکی نزیك لەنێوان دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن و دەسەڵاتی یاسادانانندا هەیەو (تیایدا خولی وەرگرتنی پۆستی پلەی پیادەکردنی واقیعی پەیوەستە بەویستی دەسەڵاتی یاسادانانەوە.) ئەم فۆرمەی حکومەت لەبەرئەوەی تیایدا کابینە خاوەنی دەسەڵاتی حکومڕانیەو بەشێوەی گروپ لەبەردەم ئەنجومەنی یاسادانانی هەڵبژێراوی خەڵکی بەرپرسە، بەفۆرمی خاوەن بەرپرسی حکومەتیش ناوبراوە. لەم فۆرمی حکومەتەدا دەسەڵاتی یاسادانان باڵادەستی یاسایی و ڕێسایی بەسەر دەسەڵاتی ڕاپەڕاندندا هەیەو لانی کەم لەڕوی تیۆرییەوە بیروڕای پێچەوانە دەتوانێت کابینە بڕوخێنێت، کەدەسەڵاتی ڕاپەڕاندنی واقیعانەی وڵاتە. لەم سیستمەی حکومەتدا پلەیەکی ڕاپەڕاندنی ون یان شانازی ( ئیفتخار)یانەی جیا لەکابینەش هەیە. کابینە دەسەڵاتی خۆی بەناوی پۆستی ڕاپەڕاندنی ونەوە پیادە دەکات. پلەی جێبەجێکاری وەهمیی کابینەکەی لەنێو پارتی زۆرینە یان ئیتلافی پارتەکان لەدەسەڵاتی یاساداناندا پێکدێنێت و لەبەرامبەر دەسەڵاتی یاساداناندا بەرپرس دەبێت، کەلەڕێگای جۆراوجۆرەوە دەبێت وەك: پێشنیازی سەرزەنیشتکردن، دەنگنەدان بۆ داواکاری دارایی یان بودجە، ڕەتکردنەوەی ئاسایی لیستەکانی پێشکەشکردنی وەزیرەکان، کەدەبێتە ئاستەنگی بەردەم پێشنیازەکان یان پرسیارکردن و ڕونکردنەوە، کەبەڕای فەرمی متمانەنەبەخشین کابینە دەڕوخێنێت. لەبەرامبەردا کابینە ئەو مافەی هەیە پەنا بۆ لیژنەی هەڵبژاردنەکان بەرێت تادوامەسەلە ڕونبکرێتەوە.

ئەم فۆرمی حکومەتە لەپێش هەموو شوێنێکەوە لەبەریتانیا سەقامگیربوو. لەوەودوا هەندێك لەوڵاتەکانی وەك فەڕەنسا، کەنەدا، ئوسترالیاو هەندێك لەوڵاتانی ئاسیایی وەك هندستان پەسەندیان کرد. دەتوانرێت بوترێت کەچرۆی فۆرمی پەڕلەمانیانەی حکومەت توانیوێتی لەبەردەم تۆفانە توندوتیژە سیاسیەکانی بەریتانیان و وڵاتە هاوبەرژەوەندەکاندا بەرگری بنوێنێت و شکۆفە بکات، هەرچەندە لەهەندێك وڵاتانی دیدا نەیتوانیوە لەبەرامبەر هێرشە تۆفانەکانی دیدا خۆی ڕابگرێت و جێگای بۆ دیکتاتۆرەکان چۆڵ کردوە.

فۆرمی پەڕلەمانیانەی حکومەت تەنها لەژینگەیەکی لێکچودا دەتوانێت بپشکوێت و گەشەبکات. (نورمەن) دروستی وتوەکە: (پێشمەرجی تایبەت هەیە، کەبەبێ ئەوانە، ئەگەر هەیە بەئاسانی حکومەتی کابینەیی بۆ شتێکی تەواو جیاواز بگۆڕێت.). هەندێك پێشنیازی پێویستی فۆرمی پەڕلەمانیانەی حکومەت بەمجۆرەیە:

أ‌-بوونی سەرۆکێکی وەهمی. بونی پۆستێکی پیادەکردنی وەهمی یان سەرۆك دەوڵەت بە یەکەمین پێشمەرجی فۆرمی حکومەتێکی پەڕلەمانی دادەنرێت. دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنی حکومەت بەناوی

سەرۆکی دەوڵەتەوە کابینە پیادە دەکات. دەبێت کابینە بەشێوەیەکی گشتی متمانەو پشتیوانی زۆرینەی دەسەڵاتی یاسادانانی لەپشتەوە بێت. لەڕوی یاساوە کابینە سەرۆکی دەوڵەت دادەنێت و دەشتوانێت لەکارەکەی وەلای بنێت.، بەلاّم لەڕوی سیاسیەوە شتی لەوجۆرە مایەی وێناکردن نییە، مەگەر پێشتر کابینە متمانەی دەسەڵاتی یاسادانانی لەدەسدابێت. پاشای بەریتانیاو سەرۆك کۆماری ئەڵمانیا لەنمونەکانی سەرۆکی یاسایی دەوڵەتەکانن، کابینەکانیان بەسەرۆکایەتی سەرۆك وەزیران یان پلەیەکی مەزن- صدر اعظم) دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنی واقیعانە پێکدێنن. لەوڕوانەوە سەرۆك وەزیران یان پلەیەکی مەزن بەسەرۆکی حکومەت دەناسرێن. سەرۆکی دەوڵەت لەخولەنێوەندەکان یان ئەوکاتانەی کابینە دەسی لەکارکێشاوەتەوەو کابینەی نوێ لەڕەوتی فۆرمگیریدایە هەموو دەسەڵاتەکان بەدەستەوە دەگرێت. ئەم خولەنێوەندە لەودەوڵەتانەی خاوەنی سیستمی فرەحزبیەو هیچ کام لەپارتەکان ناتوانن زۆرینەی دەنگەکان مسۆگەر بکەن ئەگەر هەیە چەند ڕۆژێك یان چەند هەفتەیەك درێژە بکێشێت.

ب-بەرپرسیارێتی بەکۆڵ. وەزیرەکان، کەلەفۆرمی حکومەتی پەرلەمانیدا دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنی واقیعی پێکدێنن، لەبەرامبەر ئەنجومەنی نوێنەراندا بەرپرسیارێتی بەکۆمەلیان لەئەستۆیە. پرەنسیپی (هەموو لەپێناوی یەکێك و یەکێك لەپێناوی هەموان) لەفۆرمی کابینەیی حکومەتدا بەکاردەبرێت. کاتێك کابینە سیاسەتێکی تایبەتی داڕشت دەبێت وەزیران لەبەرامبەر دەسەڵاتی یاسادانان و کۆمەڵەی خەڵکدا بەرەیەکی یەکگرتوو پێشکەش بکەن. سەبارەت بەوەی کە وەزیرێك ئەو سیاسەتەی بەدڵ نەبێت و تەواو نەیاری بێت دەبێت کابینەکە بەجێبێڵێت. لەبەرهەمان هۆ لە (1938) (ئەنتۆنی ئایدن)، کەڕازی نەبوو بەسیاسەتی دەرەکی (چمبرلین)ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا لەکابینەکە دەستی لەکارکێشایەوە. لەوبارەیەوە ئەگەر وەزیر نەیاری سەرۆك وەزیران بێت و لەکابینەکەشی دەست نەکێشێتەوە بڕیارەکانی کابینە دەبێتە ناچاری و پێویستە جێبەجێبکرێت. لەم بارەدا دەبێت لەبەردەم ئەنجومەنی نوێنەراندا بەرگری لەسیاسەتەکانی حکومەت بکات و لەوبابەتەوە کەدەسەڵاتی یاسادانان پێداگریەکی نەیارانە دەکات لەگەڵ وەزیرەکانی دی دەسلەکاردەکێشێتەوە. بەمپێیە کابینە سیاسەت دادەڕێژێت و بەشێوەیەکی بەکۆمەڵ لەبەرامبەر ئەو سیاسەتەدا بەرپرسیارە.

ت-بەرپرسیارێتی تاکەکەس. هەریەك لەوەزیران، کەبەرپرسی بەڕێوەبردنی وەزارەتێکن، لەپێناوی شێوازێکی کاریگەرانەی ئەو وەزارەتەدا لەبەردەم دەسەڵاتی یاساداناندا بەرپرسیارییەکی تاکانەی دەبێت. ئەم بەرپرسیارێتیە بەشێوەیەکی ئاسایی لەبەردەم ئەنجومەنی نوێنەراندایە. سەبارەت بەوەی کەوەزیرێك ڕوبەڕوی ڕەخنەی نەیارانەی ئەنجومەن دەبێتەوە ئەگەر پێویست بێت لەپێناوی تێوەنەگلانی هاوکارەکانی خۆی کەنارەگیر دەکات. هەڵبەتە نابێت ئەمجۆرە بابەتانە زۆر گشتگیر بکرێت.

پ-هاوئاهەنگی سیاسی. بریتییە لەوکابینەیەی لەئەندامانی هەڵبژێراوی یەك پارتی سیاسی پێکبێت، کەخاوەنی زۆرینە بێت لەدەسەڵاتی ڕاپەڕاندندا. ئەم ئەندامانە دەبێت گروپێکی هاوئاهەنگ پێکبێنن. ئەگەر کابینە لەپارتی سیاسی جیاوازی خاوەن ئایدیۆلۆژیای دژبەیەك و شێوەی کارکردن بەپێی بیروباوەڕی

سیاسی جۆراوجۆر پێکهاتبێت بەدژواری کارەکانی هاوئاهەنگ دەبێت. هەندێك لەوڵاتەکانی وەك فەرەنسا لەبارێکدا، کەفۆرمی کابینەیی حکومەتی تیایدا پایەدارە، ڕوبەڕوی ئەم گرفتە دەبنەوە، چونکە هیچ کام لەپارتەکان ناتوانن لەدەسەڵاتی یاساداناندا زۆرینە بەدەسبێنن و دەبێت حکومەتی (ئیتلاف- کوالیسیۆن) پێکبێت. ئەمجۆرە حکومەتانە زۆرجار لەو پارتانە پێکدێن کەدیدیی سیاسی جۆراوجۆریان هەیەو چونکە هەمیشە ئەگەری دروستکردنی پێکهاتەیەکی دی لەپارتەکان لەئارادایە تازۆرینە پێکبێت کوالیسیۆنێکی سەقامگیر زۆرکەمە. حکومەتە کوالیسیۆنیەکان تەنها لەکاتی قەیرانە نەتەوەییە توندەکاندا، کەپارت و گروپەکان جیاوازیەکانیان لەپێناوی بەرژەوەندی وڵاتدا بەشێوەیەکی گشتی دەخەنەلاوە، دەتوانن بەبێ دژواری کاربکەن.

ج-بەئەندامبونی پەرلەمان. ئەندامانی کابینەو وەزیرەکانی دی بەشێوەیەکی ئاسایی ئەندامانی پەرلەمانن یان لەماوەیەکی دیاریکراودا دەبێت ببنە ئەندامی پەرلەمان. ئەمبارە ئەو توانستەیان پێدەبەخشێت بەشداری لێکۆڵینەوەکانی دەسەڵاتی یاسادانان بکەن و لەکاروباری یاسادانان، بەڕێوەبردن و داڕشتنی سیاسەت پێشڕەوی کارەکان لەئەستۆ بگرن. ئەم حاڵەتە ئەو توانایە بەپەرلەمانیش دەدات لەڕێچکە جۆراوجۆرەکانی بەردەستیەوە چاودێری کارەکانی حکومەت بکات.

ح-نهێنیبونی شێوازی کارکردن. ئەو کابینەیەی لەیەك پارت پێکهاتبێت نەك تەنها خاوەنی لێکچونە بەڵکو نهێنی گفتوگۆکانیش بەپارێزراوی دەهێڵێتەوە، کەئەوەش پێشمەرجێکی دیکەی فۆرمی پەرلەمانیانەی حکومەتە. لەهەندێك لەوڵاتەکاندا سەبارەت بەئاشکرانەبونی نهێنیەکانی حکومەت یاسا هەیەو کەسانێکی پێچەوانەی ئەوە دەجوڵێنەوە سزا دەدرێن. لەسەردەمی ئێستادا پاراستنی نهێنیەکان بەمەرجی بنەڕەتی سەرکەوتنی حکومەتی پەرلەمانی دادەنرێت، کەتیایدا وڵاتەکان بەدروستی هەوڵدەدەن لەوانی دی باشترو باڵاتربن.

خ-ڕێبەرایەتی سەرۆك وەزیران. لەفۆرمی پەرلەمانیانەی حکومەتدا سەرۆك وەزیران ڕابەری کابینەیە. ئەو( کۆڵەکەی دامەزراوەی کابینەکەیە)و وتەبێژی سەرەکی حکومەتە لەناوخۆو دەرەوەی پەرلەمان، وتەکانی وەك ڕاگەیاندنی متمانەداری سیاسەتی کابینەکەی سەیردەکرێت. سەرۆك وەزیران لەئاستی ڕابەرایەتی گروپی کابینەدا نەك تەنهاگروپەکەی خۆی ڕێکدەخات بەڵکو چالاکیەکانی هاوئاهەنگ دەکات و ئاڕاستەی پێویستی پێدەبەخشێت. تاڕادەیەکیش ئازادە گۆڕانکاری لە دامەزراوەی کابینەکەی خۆیدا بکات.

د-ئۆپۆزسیۆنی تەندروست و کارا. کەدەوترێت ئۆپۆزسیۆنی توندوتۆڵ و کارامە حکومەتی ئەڵتەرناتیڤە ڕوح و جەستەی دیموکراسی پەرلەمانیشە. بە بڕوای (لاسکی) ژیانی دەوڵەتی دیموکراسی لەسەر سیستەمی پارتایەتی بیناکراوە. قسەکردن سەبارەت بەدیموکراسی پەرلەمانی بەبێ ئۆپۆزسیۆن مایەی وێناکردن نییە. ئۆپۆزسیۆن بەومەرجەی تەندروست و چاپوك بێت پارتی دەسەڵاتدار لەسەر ڕێچکەیەکی دروست دەهێڵێتەوەو بوارنادات خراپ سود لەدەسەڵات وەرگرێت و ببێتە زۆردار.

سەبارەت بەخاڵەدرەوشاوەکانی سیستەمی پەرلەمانیانەی حکومەت دەکرێ ئاماژە بەم بابەتانە بدرێت، وەك: هاوئاهەنگی نێوان دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن، بونی ئاستەنگ

لەبەردەم گۆڕانی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن بەدەسەڵاتێکی ستەمگەر، حکومەتی پیاوان و ژنانی بەتوانایە، بڕیارەکان بەئاسانی دەدرێن، بەئاگابونی تەواو لەبیروڕا باوەکانی نێوان ئەنجومەن و خەڵکی، بونی ئۆپۆزسیۆنێکی بەهێز بەحکومەتی ئەڵتەرناتیڤ دەناسرێت، هەبونی وەڵام لەبەرامبەر هزرە گشتیەکاندا، توانیی نەرمونیانی، بەهاداریی پەروەردەیەکی بەرفراوان، بەدیموکراسی بونی پاشایەتیەکان (سیستەمە مۆنارتیەکان) و داهێنان لەیاساداناندا.

لەگەڵ ئەوەی سیستمی پەرلەمانی خاوەنی خاڵی درەوشاوەیە لەڕەخنەش بەدور نییە: جیاکاری دەسەڵات ڕەتدەکرێتەوە، شێوەیەکە ناجێگیری حکومەتە، بەردەوامی و هەمیشەیی لەسیاسەتەکاندا بونی نییە، وڵات بەرەو ئاژاوە کێش دەکرێت، دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن دەبێتە ستەمگەر، بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان نادیدە دەگیرێن، قەیرانە نەتەوەییەکان بەشێوەیەکی گونجاو چارەسەرناکرێن، ئەگەر هەیە هاوکاری نێوان دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن زیانبار بێت، بیروکراسی پەرەدەسێنێت و ناکۆکی تەنها بۆئەوە سەرهەڵدەدات کەبڵێ دژم، دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن لەبەردەم دەسەڵاتی یاساداناندا دەبێتە ژێردەستە، هەروەها حکومەتی پەرلەمانی حکومەتی سیاسەتکارەکان دەبێت.

لەگەڵ ئەمەشداحکومەتی پەرلەمانی خۆشەویستیەکی زۆرو گەلەك سەرکەوتنی بەدەسهێناوە. لەڕاستیدا لەبارەی کەموکوڕی حکومەتی کابینەییەوە زیادەڕۆیی کراوە. پەرلەمانیە دیمکراسیەکان نەبونەتە هۆکاری پەشێوی وڵاتەکان. بەهۆی خۆگونجاندنی ئەمجۆرە دیمکراسیانەوە توانیویانە لەکاتی قەیرانەکاندا دەمودەست توندوتۆڵانە کاربکەن. ئەگەر ئەم فۆرمەی حکومەت کارامە نەبوایە زۆر لەپێشتردا کەنارەگیر دەکرا. لەفۆرمی پەرلەمانیانەی حکومەتدا لەوڵاتانی وەك بەریتانیادا لەجیاتی جێگەی گەرموگوڕی پیلان و پلانگێڕی حکومەتێکی پارتایەتی هاوسەنگ و یەکسان هەیە. بەشێوەیەکی ئاسایش ئۆپۆزسیۆن ڕۆڵی دروستکەر دەگێرێت. سەرەڕای ئەوە لەوڵاتەکانی خاوەنی سیستمی دوو پارتن حکومەتە پەرلەمانیەکان بەتەواوی سەقامگیربون. ستەمگەری کابینە ڕاستیەکی نکوڵی لێنەکراوە، بەلام ئەگەر پەرلەمان ئەو کابینەیەی کردبێتە ستەمگەر، بەوتەی (لاول)، ئەو زۆرداریەی بەخۆشویستیەکی زۆرەوە لەژێر دەستدرێژی بەردەوامی ڕەخنەگرتندا کاری کردوە. پەسەندکردنێکی بەرفراوانی فۆرمی پەرلەمانیانەی حکومەت لەوڵاتە تازە سەربەخۆبوەکان ئاماژەی گشتی بون و سودبەخشبونێتی.

## 5- فۆرمی حکومەتی سەرۆکایەتی.

سەربەخۆیی و جیاکردنەوەی تەواوی ئۆرگانەکانی دەسەڵاتی یاسادانان و ڕاپەڕاندن خەسڵەتی تایبەتی فۆرمی سەرۆکایەتیانەی حکومەتە. لەمجۆرە فۆرمەدا سی ئۆرگانی حکومەت (دەسەڵاتی یاسادانان، دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن و دەسەڵاتی داد) جودالەیەك لەدەسەڵاتی گونجاودان. لێرەوە هەریەکەیان بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەبواری خۆیدا کاردەکات. لەم فۆرمی حکومەتەدا سەرۆکی ڕاپەڕاندن سەرۆکێکی باڵا نییە، بەڵکو هەم سەرۆکی دەوڵەتەو هەم سەرۆکی حکومەت. کابینەکەی پێکدێت لەو ڕاوێژکار، یاریدەدەرو هاوکارانەی بەتەواوی پەیرەوی لێدەکەن و لەبەردەم ئەودا بەرپرسن نەك لەبەردەم دەسەڵاتی یاسادانان.

لەواقیعدا ئەندامانی کابینەکەی ناتوانن لەنێوئەندامانی دەسەڵاتی یاساداناندا بن. ئەم کەسانە بەرپرسانی بەڕێوەبەرایەتین و مافی پێشنیازکردنی یاسایان نییەو لەدەسەڵاتی یاسادانانیشدا ناتوانن ڕابەرایەتی شێوازی دارشتنی یاسا بکەن. سەرۆکی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنیش ئەندامی دەسەڵاتی یاسادانان نییەو مافی بەشداریکردنی لەگفتوگۆکانیشدا نییە، کاتی پۆست وەرگرتنەکەشی، کەدیاریکراوە، پەیوەندی بە دەسەڵاتی یاسادانانەوە نییە. بۆ لێپێچینەوە لەسەرۆکی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن بەپێی دەستور ڕەوشێکی تایبەتی هەیە.

ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا شێوەی سەرۆکایەتی حکومەتی پەسەند کردوە. ئەو ویلایەتانەشی پێکیدێنن خاوەنی سیستمێکی سەرۆکایەتیانەی حکومەتن.

## 6- بەراوردی نێوان حکومەتی پەرلەمانی و سەرۆکایەتی.

دەکرێت لەچەند ڕویەکەوە فۆرمی پەرلەمانیانەی حکومەت بە فۆرمی سەرۆکایەتی بەراورد بکرێت.

**یەکەم**، لەفۆرمی سەرۆکایەتیانەی حکومەتدا سەرۆکی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن سەرۆکێکی وەهمی (بەناو) نییە، وەك لەوەی لەفۆرمی پەرلەمانیدایە. ئەو سەرۆکی واقیعیانەی حکومەتە. دەسەڵاتی جێبەجێکردنی حکومەت لەڕوی یاسایی و پراکتیکەوە بەو سپێراوە. لەلایەکی دیشەوە لەفۆرمی پەرلەمانیانەی حکومەتدا سەرۆکی دەوڵەت و سەرۆکی حکومەت دوو کەسی جیاوازن. سەرۆك وەزیران سەرۆکی حکومەتە، لەکاتێکدا کەپاشا (لەئینگلستان)، فەرماندەی گشتی (لەکەنداو ئوستراليا) يان سەرۆك كۆمار (لەئەڵمانیا) سەرۆکی وەهمی دەوڵەتەکانی خۆیانن. لەبەرهەمان هۆیە کەسیستمی پەرلەمانی بەسیستمی دوو سەرۆکیش ناودەبرێت، لەبەرامبەردا سیستمی سەرۆکایەتی یەك سەرۆکییە.

**دوەم**، سیستمی سەرۆکایەتی پشت بەتیۆری جیاکردنەوەی ڕەها دەبەستێت لەکاتێکدا فۆرمی حکومەتی پەرلەمانی ڕاگیرە یەکێتی و ئاوێتەکردنی دەسەڵات یان جیاکاری ڕێژەیی دەسەڵاتە.

**سێیەم**، لەفۆرمی سەرۆکایەتیدا سەرۆکی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن بەپێی دەستور لەدەسەڵاتی یاسادانان سەربەخۆیەو ئەم دەسەڵاتە ناتوانێت لەڕێگای دەنگدانی لێسەندنەوەی متمانەوە کەنارەگیری بکات. لەسیستمی پەرلەمانیدا کابینە گرێدراوی دەسەڵاتی یاسادانانەو ئەم دەسەڵاتە دەتوانێت بەپێشنیاری سەرزەنیشتکردن ڕێگری لەهەنگاوەکانی بکات یان بەدەنگدان بۆ سەندنەوەی متمانە کەنارەگیری بکات.

**چوارەم**، لەسیستمی سەرۆکایەتیدا کابینە ئافریدەی سەرۆك کۆمارەو ئەندامەکانی بەشێوەیەکی دیاریکراو لەبەرامبەریدا بەرپرس دەبن نەك لەبەردەم دەسەڵاتی یاساداناندا. لەلایەکی دییەوە لەسیستمی پەرلەمانیدا سەرۆکی دەسەڵاتی جێبەجێکردن (پاشا یان سەرۆك کۆمار) بەپێی دیدەکانی سەرۆك وەزیران وەزیرەکان دادەنێت، بەڵام ئەوانە لەبەردەم دەسەڵاتی یاساداناندا بەرپرس دەبن و ڕاوێژکارە تایبەتەکان یان ئەوانەی پشتی پەردەی سیستمی سەرۆکایەتی پێکناهێنن.

**پێنجەم**، ئەندامانی کابینەی سەرۆکایەتی لەبەرئەوەی ئەندامی دەسەڵاتی یاسادانان نین ناتوانن یاسادانەربن یان لەدەسەڵاتی یاساداناندا دەنگی بۆ بدەن. لەفۆرمی پەرلەمانی حکومەتدا

بەتەواوی بەپێچەوانەوەیە. وەزیرەکان نەك تەنها ئەندامی دەسەڵاتی یاسادانانن، بەڵکو دەتوانن هەموو یاسایەکی گرنگ دابهێنن و لەپەرلەماندا چاودێری دەنگ لەسەردانی بکەن.

**شەشەم**، لەفۆرمی سەرۆکایەتیدا خولی پۆست وەرگرتنی سەرۆکی دەسەڵاتی جێبەجێکردن دیاریکراوو جێگیرەو بۆ کەنارەگیرکردنی ڕەوشێکی تایبەت لەئارادایە. لەلایەکی دییەوە لەفۆرمی پەرلەمانی حکومەتدا درێژەی خولی کابینەکە وابەستەی پشتگیری دەسەڵاتی یاسادانانە.

فۆرمی سەرۆکایەتی حکومەت هەم خاڵی درەوشاوەو هەم خەوشی هەیە، کەدروست خاڵی بەرامبەرە لەگەڵ خاڵی درەوشاوەو خەوشەکانی فۆرمی پەرلەمانی حکومەت. دەکرێت تازیارەکانی فۆرمی سەرۆکایەتی حکومەتی بەمجۆرە کورت بکرێتەوە: گرنتیە بۆ سەقامگیری حکومەت، سیاسەتێکی بەردەوام و هەمیشەیی پیادەدەکرێت، سەرۆکایەتی کۆمار لەلایەن خەڵکەوە هەڵبژێراوەو لەبەردەم دەسەڵاتی یاسادانانیدا بەرپرس نییە، ئاستێکی شیاوە بۆ وەڵامدانەوەی پێداویستیەکان، باشتر سود لەخزمەتی کارمەندان دەبینرێت، بۆ ئەو وڵاتانەی خاوەنی گروپی جیاوازن باشترین جۆری حکومەتە، دڵنیایی سیاسەتەکان دەسەبەرکراوە، ڕۆحیەتی حزبگەرایی بەنزمترین ئاست دەگات.

لەخەوشەکانی سیستمی سەرۆکایەتی دەکرێت ئاماژە بەم بابەتانە بکرێت: سەرۆکی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن دەبێتە زۆردار، سەختگیریەکانی ناهێڵیت لەگەڵ سەردەمدا هاوهەنگاو بێت، بڕیارەکان لەدواخستنێکی نائاساییدا دەدرێن، بۆ وڵاتێکی خاوەن فراوانیەکی ناوەند نەگونجاوە، بەرپرسیاریەکان گرنتی نەکراوە.

سیستمی سەرۆکایەتی لەگەڵ بونی دواکەوتوی و سنوورداریەکانی لەئەمریکا زۆر سەرکەوتوو بوە. ڕوداوە مەترسیدارەکان نەیانتوانیوە پایەکانی دیموکراسی سەرۆکایەتی لەو وڵاتەدا بلەرزێنێت. لەڕاستیدا لەپاش هەر قەیرانێك بەهێزتربوە. بەڵام ئەم فۆرمی حکومەتە لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین هێندە سەرکەوتوو نەبوە.

## حکومەتی تاك بونیادو فیدراڵەکان.

ئەگەر دەسەڵاتی حکومەت لەیەك جێدا چڕبوبێتەوە حکومەت تاك بونیاد دەبێت و ئەگەر لەنێوان سەنتەرو چەند یەکەیەکی لۆکاڵیدا دابەش بوو بێت حکومەت فیدراڵی دەبێت.

### 1. حکومەتی تاك بونیاد (یونیتەری).

لەحکومەتی تاك بونیادا حکومەتێکی سەنتراڵی بەدەسەڵاتی تەواوەوە بونی هەیە. بۆئاسانکاری بەڕێوەبردن لەوانەیە وڵات بۆ چەند یەکەی پارێزگا، دەڤەرو ناوچەی دابەشبووبێت، بەڵام بون و تواناکانیان پەیوەستی خواست و ئیرادەی سەنتەر دەبێت. سەنتەر هەرکاتێك بخوازێت دەتوانێت ئەو یەکانە بسڕێتەوە یان بەپێی بەرژەوەندیەکان یەکەی نوێ دابمەزرێنێت. (فاینەر) بەمجۆرە پێناسەی (دەوڵەتی تاك بونیاد)ی کردوە: (دەوڵەتێکە هەموو ڕێپێدان و دەسەڵاتەکانی لەتاك ناوەندەوە بڕیاری لەسەر دەدرێت، کەویست و کارگێڕەکانی بەشێوەیەکی یاسایی لەسەرانسەری وڵاتدا ئامادەییان هەیە[1]). بەبڕوای (فیلۆبی) لەفۆرمی حکومەتی تاك بونیادا: (لەهەنگاوی یەکەمدا هەموو پشکەکانی حکومەت بەحکومەتی سەنتراڵ

سپێراوەو ئەم حکومەتە ئازادی تەواوی هەیە بەپێی بەرژەوەندیەکانی خۆی و ئەو ڕێپێدانانەی بەسەر بەشەکانی وڵاتدا دابەش بکات(2).

بەوتەی (سترانگ): (دەوڵەتی تاك بونیاد خاوەنی حکومەتێکی سەنتراڵی ڕێکخراوە، لەژێر بەڕێوەبردنی حکومەتێکی سەنتراڵی و بەپێی بەرژەوەندیەکانی ئەو حکومەتە هەموو ڕێگەپێدانە جۆراوجۆرەکان دەدرێت بەناوچەکانی یەك وڵات و دەسەڵاتی سەنتەر بەبێئەوەی دەرئەنجامی ڕێگەدانی تایبەت بەناوچەکان بەشێوەیەکی یاسایی خۆی سنوردار دەبێت، لەسەرانسەری وڵاتدا باڵادەستی هەیە(3)).

بەبڕوای (گارنەر): (لەهەرشوێنێك بەپێی یاسای بنەڕەتی حوکمڕانی بەیەك یان چەند ئۆرگانێکی سەنتراڵی درابێت و حکومەتە لۆکاڵیەکان هەموو دەسەڵاتێکی ئۆتۆنۆمی و لەڕاستیدا بونیان لەودەسەڵاتەوە وەربگرن، ئەوە سیستمی ئەو حکومەتە تاك بونیادە دەبێت(4)).

ڕاڤەکردنی ئەم پێناسانە ئەوە دەردەخات، کەحکومەتی تاك بونیاد، حکومەتێکی سەنتراڵی خاوەن هەموو پشکی تەواوەو یەکپارچەیی دەوڵەت دەپارێزێت. یەکەکانی دی تەنها ڕۆڵی ناوەنجیان هەیەو ئەنجومەن- لیژنە یان ئەو کارگێرانە پاشکۆی سەنتەرن، کەبەپێی خواست و باش دیتن و بەرژەوەندی حکومەتی سەنتەر دروستکراون وبەپێی پێداویستی بەڕێوەبردن لەوانەیە پشکی دیاریکراویان پێدرابێت. بۆ نمونە، لەبەریتانیا بەرپرسە لۆکاڵیەکان دەسەڵاتداری تەواون، بەڵام سەنتەر سەرچاوەی دەسەڵاتیانەو ئەگەری هەیە لێیان زەوت بکرێت. بەریتانیا، فەرەنسا، ئیتالیا، بەلژیکا، ژاپۆن و ئێران لەنمونەی حکومەتی تاك دامەزراوە.

**أ/ شایستەیی حکومەتی تاك بونیاد.**

حکومەتی تاك بونیاد ئەم شایستەیی و تازیارانەی هەیە:

- کاریگەرترین فۆرمی حکومەتە. لەیەك سەنتەری گشتیدا بڕیار دەربارەی هەموو بابەتە گرنگەکان دەدرێت. چڕبونەوەی دەسەڵات زیاتر لە پەرتوبڵاوبونی گرنتی حکومەتێکی بەهێز دەکات.
- سادەیی ڕێکخراوەیی. دیاریکردنی فۆرمی حکومەت بۆ سەرانسەری وڵات دەکەوێتە ئەستۆی دەستور.
- نەرمیی زۆر. حکومەتی تاك بونیاد بەبەراوردکردن لەگەڵ حکومەتی فیدراڵی نەرمی زیاتر هەیە. بۆگونجاندن لەگەڵ پێشهاتەکانی هاوچەرخ بەئاسانی مایەی ڕیفۆرمسازییە. لەلایەکی دییەوە فۆرمی فیدراڵی حکومەت تاڕادەیەك گران و سەخت و هەمیشە لەگەڵ پێداویستیەکانی سەردەم توانای هەماهەنگی کردنی نییە.
- نەگەیشتنەوەیەك یان ناکۆکی بەرژەوەندیەکان. فۆرمی تاك بونیادی حکومەت بەهۆی یەکبونیەوە مایەی سەرنج لێدانە. هەموو تازیارەکانی حوکمڕانی لەسەنتەردا چڕبۆتەوە. ئۆرگانە جۆراوجۆرەکانی حکومەت بەشەدانەبڕاوەکانی یەك پارچەیی میکانیزمیانەی بەڕێوەبردن پێکدەهێنن. لەوڕووەوە پرسی لێکدان یان ناکۆکی بەرژەوەندی لەئارادا نابێت. لەسەرانسەری وڵاتدا یەك ڕیتمی یاساو بەڕێوەبردنی هەیە. لەلایەکی دییەوە حکومەتی فیدراڵ یەکێتی ئامانج و ڕێکخراوی نییە.
- توانایی لەسیاسەتی ناوخۆی و دەرەکیدا. لەبەرئەوەی هەموو پشکەکانی لەسەنتەردایە ئەگەری ئەوە هەیە لێبڕاوانە سیاسەتە ناوخۆیی دەرەکیەکان دابڕێژێت و بەنەترسیەوە پیادەبکرێن.

لـەفۆرمی ئـەم حکومەتـەدا بڕیـاری دەمودەسـتانەو خێرای کارکردن زۆرە.

• تێچـونی کـەم. حکومـەتی تـاك بونیـاد بەشـێوەیەکی ڕێـژەیی تێچـونی کەمـە، چـونکە لەسەرئاسـتی ناوچـەیی دوو هێنـدبونی دەزگـا سیاسیەکان بونی نییە.

• بـۆ وڵاتـە بچـوکەکان گونجـاوە. دەوترێـت حکومـەتی تـاك بونیـادی بـۆ وڵاتـانی بچـوك، کـەم دانیشـتوان، خـاوەن یەکپارچـەیی و لێکچـوی کەلتوری شیاوترین فۆرمی حکومەتە.

• یەکپارچـەیی و وەفـاداری هاوڵاتیـان. بەپێچـەوانەی فـۆرمی فیـدراڵی لـە حکومـەتی تـاك بونیادا وەفاداری هاوڵاتیان یەکپارچە دەمێنێتەوە. لەحکومەتی فیدراڵیدا هاوڵاتیان هەموو بۆسەنتەرو بۆ هەرێمـەکانی خۆشیان وەفادار دەبن. سیسـتمی لـەوجۆرە تـۆویی جوداخـوازی لـەناو یەکەکانـدا دەچێنێت. سیسـتمی تـاك بونیـادی لەومەترسـیانە زامنەو هاوڵاتی تیایدا یەك پارچەیە.

## ب/ ناشایستەکانی حکومەتی تاك بونیادی.

حکومـەتی تـاك بونیـادی کـەموکوڕی هەیـە، لەوانەیە:

• پایـــــەماڵکردنی دەسپێشـــــخەرییە لۆکاڵیـەکان. چـڕبونەوەی بـەرفراون و نزمبونـەوەی یەکـە لۆکاڵیـەکان بـۆ شـوێنگەیەکی کـارگێڕی ڕوتـی سەنتەر دەسپێشخەری لۆکاڵیی لەناو دەبات و زیـان بەتوانستی ژیانی حکومەتە لۆکاڵیەکان دەگەیەنێت، کەبۆسـەرکەوتنی دیمکراسیەت بنچینەیین، چونکە حکومـەتی سـەنتەر خـاوەنی ئاگایـەکی تـەواو نییـە سەبارەت بە پرس و پێداویستیە لۆکاڵیەکان.

• سـتەمکاری سـەنتەر. دەسـەڵات حـەزی بەگەندەڵیـەو دەسـەڵاتی ڕەهـا بەشـێوەیەکی ڕەهـا دەبێـت. بەخشـینی دەسـەڵاتی ڕەهـا بەسـەنتەر زۆرجـــار کاریگـــەری گەنـــدەڵبونی لەســـەر دروسـتکردوەو سـەنتەر بـەرەو زۆرداری هـەنگاو دەنێت.

بەوتـــەی (لاســـکی): (... چـــڕبونەوەی زۆر لەدەوڵـەتی نوێـدا دوژمنـی گـەورەی ئـەو سیسـتمە یاســـاییەیە کـــەدەخوازرێت، چـــونکە تـــەنها لەجێگایەکدا کەدەسـەڵات بـەفراوانی بڵاوکرابێتـەوە کاریگـەری سـنورداركردنی بەسـەر خاوەنەکانیـەوە هەیە[5]).

• بێدەســەڵاتی ســەنتەر بەرامبــەر پرســە لۆکاڵیەکان. لەم چەرخی دەوڵـەتی خۆشگوزەرانیەدا چـــالاکیەکانی حکومـــەت لایـــەنی جۆراوجـــۆر لـەخۆدەگرێت. حکومـەتی سـەنترالی کـاتی تـەواوی لەبەردەسـتدا نییـە بـۆ لەئەسـتۆگرتنی پرسـە لۆکاڵیـــەکان. لـــەوڕوەوە ئـــەو پرســـانە مایـــەی پشتگوێخســتن دەبــن. بەواتایــەکی دی ســەنتەر سـەبارەت بەپرسـە پێشـهاتەکانی بـوارە لۆکاڵیـەکان ئاگـایی تـەواوی نییـەو سـەرئەنجام دوچـاری زیـانی گـەورە دەبـن. ( لاسـکی) دروسـت ئـەوەی دەربڕیـوە: ( ناکرێـــت بەتـــەواوی لەســـودەکانی حکومـــەتی دیمکراسـی بگـەین، مەگـەر ئـەوەمان پەسـەند بێـت، کەهـەموو پرسـەکان سەرتاسـەری و سـەنترالی نین و بۆ چارەسەرکردنی ئەوجۆرە کێشانەی پەیوەندی بە سەرانســەری وڵاتــەوە نییــە دەبێــت لەوناوچــەیەدا کەسـانێك چارەسـەری بکـەن کـە هەسـت بـەقوڵی کێشەکە دەکەن).

• ئاســـانیی هەڵوەشـــانەوە. ڕەخنـــەگران دەرکیـان بـەوە کـردوە، کەسیسـتمی تـاك بونیـاد لەوانەیـە لـەژێر فشـاری نـاوخۆیی و دەرەکیـدا زۆر بەئاســانی هەڵوەشــێت. لەبەرامبــەر مەترســیەکی لەوجۆرەدا بونی چەندەها سەنتەری دەسەڵات وەك

زامنکارێکە، کەتەنها لەفیدراسیۆندا هەیەو لەفۆرمی حکومەتی تاك بونیادا نییە.

(گارنەر) بەپوختەکردنی کەموکوڕییەکانی حکومەتی تاك بونیاد وتویەتی: (حکومەتی تاك بونیاد دەسپێشخەری لۆکاڵی سەرکوت دەکات و لەبری هاندان و ئاڕاستەکردن بەپرسەگشتیەکانی لەناوی دەبات و زیان بە ژیانی حکومەتە لۆکاڵیەکان دەگەیەنێت و ئاسانکاری بۆ فراوانبونی بیرۆکراسیەتی سەنتراڵی دەکات[6]).

## 2. فیدراسیۆن و کۆنفدراسیۆن

زاراوەی فیدراسیۆن لە زاراوەی لاتینی (*FOEDUS*) وەرگیراوە، کەبەواتای پەیمان یان ڕێکەوتن دێت. فیدراسیۆن کاتێك پێکدێت کەدوو یان چەند وڵاتێکی سەربەخۆ ڕێکبکەون دەوڵەتێکی سەربەخۆ دروست بکەن و حوکمڕانێتی خۆیانی پێبسپێرن یان کاتێك کەیەکە ئیداریەکانی بەشێك لەوڵاتێکی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی تاك بونیاد ڕەزامەندی سەنتەر بۆ ئۆتۆنۆمی خۆی بەدەسبێنێت.ڕەوتی یەکەم بە(تێکەڵکردن)و ڕەوتی دوەمیان بە (دابەشبون) ناوزەدکراوە.

کاتێك هەندێك وڵات لەڕوی دواکەوتویی ئابوری یان لاوازی سەربازییەوە خۆبەخشانە ڕازی دەبن یەکبگرن ئەوا یەکێتیەکی فییدراڵی دەئافرێنن. یەکێتیەکی لەوبابەتە بەپەیمانێك یان ڕێکەوتننامەیەك دروست دەبێت. دەوڵەتێکی نوێ پێکدێت و لایەنە هاوپەیمانەکان حوکمڕانێتی خۆیانی پێدەبەخشن. هەندێکجاریش دەوڵەتانی بەهێز فیدراسیۆن پێکدێنن. ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا نمونەی ئەوجۆرە فیدراسیۆنەیەو وڵاتانی دیکەی وەك ئەڵمانیای فیدراڵ، کەنەدا، ئوستراليا و هیندستان لەوجۆرەن. ئەگەر ڕەوتی یەکێتی ئەوروپا بەردەوام بێت ئەگەری هەیە لەئایندەدا ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەوروپا پێکبێت. لەحکومەتی فیدراڵیدا حکومەتی سەنتەر سەبارەت بە پرسە گشتیەکان وابەستەی بەرژەوەندی گشتی یان هاوبەشە، وەك پرسەکانی سوپاو ئاسایش، ئابوری و دارایی و پرسە دراویەکان، سمبولە نیشتمانیەکان و سیاسەتی دەرەکی. یەکە لۆکاڵیەکان یان پێکهێنەرانی فیدراسیۆن سەرپەرشتی ئەوکاروبارانە دەکات لەڕوی لۆکاڵییەوە گرنگن. پەیماننامەی پێکهێنانی فیدراسیۆن یان دەستوری فیدراڵی دابەشکردنی پشکەکان لەنێوان سەنتەرو یەکەکاندا دیاری دەکات.لەمجۆرە فیدراسیۆنەدا جیابونەوە تەنها لەڕێگەی پڕۆسەیەکی یاسایی و فەرمی بڕیار لێدراو لەدەستورەوە مەیسەر دەبێت.

هەروەك وترا، فیدراسیۆن لەڕێگەی پڕۆسەی (جیابونەوە)شەوە دێتەئاراوە. کاتێك دەوڵەتێکی تاك بونیادی خاوەن خاکێکی بەرفراوان بیەوێت لەڕیگەی جۆراوجۆرەوە یەکێتی سەرتاسەری بپارێزێت یان کاتێك بەشەکانی (هەرێمەکانی) خولیای ئۆتۆنۆمیان هەبێت فیدراسیۆن دێتە ئاراوە. حکومەتی سەنتەر پرسەکانی هاوبەندی پرسە گشتیەکانە بۆخۆی گلدەداتەوەو لەهەمان کاتدا پشکەکانی دی بەیەکە ئۆتۆنۆمیەکان دەدات. ئەو دۆخە بەهۆی دەستورەوە دێتەئاراوەو تەنها لەڕێگەی ئاسایی ڕیفۆرمسازی لە دەستوردا مایەی گۆڕانکارییە. (کەنەدا)ی فیدراڵ نمونەی ئەو جۆرە فیدراسیۆنەیە.

فیدراسیۆن هەرجۆرە فۆرمێك لەخۆبگرێت لەتێکەڵبون یان جیابونەوە سیستمی فیدراڵی دوو جۆرە حکومەتی هەیە: حکومەتی سەنتراڵی، حکومەتە لۆکاڵیەکان. لەفیدراسیۆنەکاندا بەرمەبنای

یاسای بنەڕەتی پشکەکان لەنێوان سەنتەرو هەرێمەکاندا دابەشکراوەو ناتوانرێت ئەم دابەشکردنە یەك لایەنە بگۆڕێت.

(مۆنتسکیۆ) بەمجۆرە پێناسەی فیدراسیۆنی کردوە: (پەیمانێکە، کەبەپێی ڕێکەوتن چەند دەوڵەتێکی بچوك ڕەزامەندی دەردەبڕن ببنە ئەندامی دەوڵەتیکی گەورەتر، کەخۆیان دەیانەوێت دروستی بکەن).

بەبڕوای (گارنەر) حوکمەتی فیدراڵی حکومەتێکە،کە (حوکمڕانێتی یان دەسەلاتی سیاسی تیایدا بەجۆرێك لەنێوان حکومەتی سەنتەرو حکومەتە لۆکاڵیەکاندا دابەشکراوە، کەهەریەکەیان لەچوارچێوەی خۆیدا سەربەخۆیە لەوی دیکە[7]).

بەرلەوەی درێژە بەلێکۆڵینەوەی حکومەتی فیدراڵ بدەین پێویستە بەچەند خاڵێك ئاماژە بەجیاوازی نێوان فیدراسیۆن و کۆنفدراسیۆن بدرێت. فیدراسیۆنی سویسرا ناونیشانە فەرمیەکەی (کۆنفدراسیۆنی سویسرا)یە. لەوڕووەوە لەوانەیە ببێتە هۆی شڵەژانی هزری، بەلام ئەو دوانە، واتە فیدراسیۆن و کۆنفدراسیۆن، ناکرێت و نابێت لەجیاتی یەکدی بەرکاربخرێن. هەندێك لەتوێژەرەوانی وەك (داسیی) جیاوازی نێوان ئەو دوانەیان لەبەرچاو نەگرتوە.

فیدراسیۆن و کۆنفدراسیۆن لەسێ ڕووەوە لەیەکتری دەچن:

- هەردوکیان لەیەك ڕیشەی (*foedus*) وە هاتون،
- هەردوکیان یەکگرتنی نێوان دەوڵەتانی سەربەخۆ حوکمڕانن،
- هەردوکیان یەك سەنتەری هاوبەش پێکدێنن.

بەلام هاوشێوەی نێوان ئەم دوانە لەوێدا کۆتاییان دێت و جیاوازی گرنگیش لەنێوانیاندا هەیە:

- کۆنفدراسیۆن یەکێتی دەوڵەتانی سەربەخۆو حوکمڕانە، کەبۆ هەندێك مەبەستی هاوبەش یەکدەگرن. لەدیدی یاساییەوە هەریەکە لەودەوڵەتانە هەرکاتێك بیانەوێت مافی جیابونەوەیان هەیە. بەواتایەکی دی کۆنفدراسیۆن هەمیشەیی نییەو مایەی هەڵوەشاندنەوەیە، بەلام فیدراسیۆن یەك دەوڵەتە، یەکەکانی پێکی دەهێنن تەنانەت ئەگەر پێش پێکهێنانی فیدراسیۆنەکەش سەربەخۆو حوکمڕان بوبن لەوەودوا حوکمڕان و سەربەخۆ نابن. یەکێتیەکەی لەڕوی یاساییەوە مایەی هەڵوەشاندنەوە نییە.
- لەفیدراسیۆندا حوکمڕانیەکی نوێ سەرهەڵدەدات. کاتێك دەوڵەتەکان دەست لەحوکمڕانێتی تاکێتی خۆیان هەڵدەگرن و فیدراسیۆنێك پێکدێنن حوکمڕانیەکی نوێ سەرهەڵدەدات. لەکۆنفدراسیۆندا بەوجۆرە نییە، چونکە یەکەکانی پێکیان نەهێناوەو حکومڕانێتی تاکانەی خۆیان دەپارێزن، لەبەرئەوەیە کۆنفدراسیۆن بەیەکگرتنی دەوڵەتانی سەربەخۆو حوکمڕان ناوزەد دەکرێت.
- لەکۆنفدراسیۆندا یاساکانی هەر دەوڵەتێك هەرچۆنێك بێت وەك خۆی دەمێنێتەوە، بەلام لەفیدراسیۆندا یاسای نوێ دادەنرێت.بەوتەی (لیکاك): (لەکۆنفدراسیۆندا یاسای کۆنفدراڵی بونی نییە. هەموو جۆرە بڕیارێکی گشتی و هاوبەش لەلایەن لیژنەیەکی سەنترالی کۆنفدراسیۆنەوە دادەڕێژرێت و پیادەکردنی لەلایەن هاولاتیانی هەموو دەوڵەتەکانەوە ناچارییە. لەوڕووەوە ناچارییە چونکە

هاولاَتيــانى نــاو دەولَــەتى ئەنــدام وەك ياســا پەسەنديان كردوە[8]).

- لەكۆنفدراســـيۆندا هــــاولاَتى تـــاك هەيە، چونكە هەموو تاكێك وەك هاولاَتى ولاَتەكەى خۆى دەمێنێتەوە، بەلاَم لە فيدراسيۆندا هاولاَتى دەبلّ دروست دەبێت. لەگەلّ ئەوەى تاك هاولاَتى يەكەى پێكهێنەرى فيدراسيۆنە هاولاَتى دەولَەتى فيــدرالّى تــازە پێكهێنراويشـــەو خۆبــەخۆ لەهەمان كاتدا ئەرك و مافى نوێى لەناو دەولَەتى نوێدا دەبێت. لەبەرامبەردا تاك لە كۆنفدراسيۆندا هــيچ مــافێكى نابێــت و چــاوەڕوانى ئەركيشــى لێناكرێت.

- لەفيدراسيۆندا دەولَەتى نوێ دروست دەبێت. كەواتە هەموو ئەو دەولَەتانەى ئەو فيدراسيۆنە پێكدەهێنن ئيدى سەربەخۆنابن و حكومەتێكى هاوبەش سەرهەلّدەدات. دەسەلاَتى ياسادانان و دەسەلاَتى ڕاپەڕاندنى هاوبەش دروست دەبێت. بەلاَم كۆنفدراسيۆن بەتەواوى گردبونەوەى دەولَەتەكانەو دەسەلاَتى ياسادانان و ڕاپەڕاندنى هاوبەش پێكناهێنن. ويست و خواستى كۆنفدراسيۆن لەلايەن ليژنەيەكى هاوشێوەى ياسادانانەوە لەچوارچێوەى ڕێسايەكدا ناخرێتە ڕوو، بەلّكو ئەو ويستە لەلايەن ليژنەيەكى ديپلۆماسى، كۆنفرانسێكى ديپلۆماسى، بالّوێزان يان نوێنەرى ئەو دەولَەتانەى كۆنفدراسيۆنەكەيان پێكهێناوە لەفەرمانێك يان ڕێكەوتننامەكاندا دەخرێتە ڕوو. گروپى نوێنەران بەپێى دەستورى داڕێژراوى حكومەتەكانيان دەنگدەدەن. ڕێكەوتنە دەنگ بۆدراوەكان پێويست و ناچارى نييەو ئەو گوتارانەى بۆ ئۆرگانەكانى دەولَەتانى ناو كۆنفدراسيۆنەكە دەرچون بەشێوەيەكى ئاسايى تائەودەمەى هەريەك لەدەولَەتە ئەندامەكان بەپێى ڕێچكەى ياسايى دەنگى بۆ نەدەن نابنە مايەى پيادەكردن.

لەمێژودا گەلێك نمونەى كۆنفدراسيۆنى هەبوە. بەگشتى دەولَەتە هاوسێكان ( بۆئامانجى بەرگرى و بەرەوپێشبردنى بەرژەوەندى هاوبەش ) ئارەزويان لەيەكگرتن كردوە. لەيۆنانى كۆندا گەلێك كۆنفدراسيۆن هەبوە، بۆنمونە كۆنفدراسيۆنى دلۆس، كۆمەلّگەى ئێژە و كۆنفدراسيۆنى ليسيا.

لەسەدەكانى ناوەڕاستدا هانسياتيك ناسراو بوە. لە (1576) پێنج ويلايەتى هۆلّەندا كۆنفدراسيۆنێكيان دژ بە ئيسپانيا پێكهێنا. كۆنفدراسيۆنى (1815- 1867)ى ئەلّمانيا، (1781- 1789) لە ئەمريكا، كۆنفدراسيۆنى سويسرا لە (1815- 1840) لەنمونە زەقەكانى كۆنفدراسيۆنن.

لەگەلّ ئەم ڕونكردنەوە كورتە دەربارەى كۆنفدراسيۆن و لەدرێژەى ئەوباسەدا دەكرێت بوترێت، كەفۆرمى فيدراسيۆنى حكومەت لەولاَتە گەورەكانى وەك ويلايەتە يەكگرتوەكانى ئەمريكادا سەركەوتنى بەرچاوى بەدەسهێناوە.لەمجۆرە ولاَتانەدا هەمەجۆرى كەلتورو زمانەكان، خواستە سياسيەكان و ئامانجە نەگونجاوەكانى خەلّكى لەپالّ يەكيتى نيشتمانيدا ئۆتۆنۆمى ناوچەييشى كردۆتە كارێكى پێويست. لەوەش زياتر فيدراسيۆن سەرچاوەى پەروەردەكردنى سياسيانەى خەلّكەو وايان لێدەكات ئاوڕ لەپرسەكانى خۆيان بدەنەوە. تازيارە ئابوريەكانى فيدراسيۆن مايەى جەخت لەسەركردن و ئاوڕلێدانەوەيە. متمانەى نێودەولَەتى ولاَتە گەورەكانى وەك ئەمريكاو كەنەدا بەهۆى يەكێتى فيدرالّە گەورەكەيانەوە پارێزراوە.

زۆربەى نيگەرانيەكانى ڕەخنەگرانى فيدراسيۆن بێبنەما بوە. هيچ گۆڕانێك بەسەر

سیاسەتی دەرەکی ئەمریکادا نەهاتوەو هیچ شڵەژان و ناهەموارییەکی ناوخۆیی لەماوەی ئەو ساڵانەی دامەزراوەی فیدراڵی تێدا دروستکراوە نەبینراوە. لەئەمریکا ویلایەتەکانی باشور هەوڵیان بۆ جیابونەوە یان دابڕان داوە، بەڵام بێهودە بوەو چاوی ویلایەتەکانی دی کردۆتەوە. لەبەرئەوە ترس لەدابەشبون خەیاڵیەو دەکرێت بەو دەرئەنجامە بگەین، کەفۆرمی فیدراڵی حکومەت نەك تەنها بۆ ئەو دەوڵەتانەی ئەو فۆرمەیان هەڵبژاردوە سودبەخشبوە، بەڵکو بۆ ئەو جیهانە ناڕێکخراوەش، کە وەك بروسکەی هیوا ئەگەر هەیە دواجار بەبەخشینی ئۆتۆنۆمی بەدەوڵەتە سەربەخۆو حوکمڕانەکان بیرۆکەی حوکمڕانێتی جیهانیی پەسەند بکات[9].

## پەراوێزەکان

1- *Finer,op,cit.p.244*

2- *willoughby,op,cit.p.305*

3- *strong,op,cit.p.63*

4- *Garner, Introdction to…,op,cit.p.378*

5- *Lasky,Agrammar of…,op,cit.p.101*

6- *Garner, Introdction to…,op,cit.p.382*

7- *Ibid.p.244*

8- *Leacock, op.cit.p184*

9- بۆ زیاتر لێکۆڵینەوە دەربارەی حکومەتی تاك بونیاد و فیدراڵ بڕوانە: قاضی، پێشوو، ل2410191

1. *Dillon,op.cit.p.115*
2. *lbid.p116*
3. منتسکیۆ، پێشوو، ل160
4. *Finer, op.cit.p.161*
5. *Sabine, op.cit.p.152*
6. *Kapurm op.cit.p.416*

7-بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر دەربارەی سیستمە پەڕلەمان و سەرۆکایەتیەکان بڕوانە: قاضي، پێشوو ل 378-384 ابوالحد، مبانی سیاست، پێشوو ل 196-210و هەروەها *Ballm op.cit.p.41-44. Kapurm op.cit.p.378. Agrawal, op.cit.p.326-338*

## سەرچاوە

بنیادهای علم سیاست، عبدالرحمن عالم.

# پۆپەر لە زانستەوە بۆ پۆلەتیك

**بریان ماگی**

**لە سویدییەوە: عوسمان حەمە رەشید**

لە دوای نیوتنەوە، بۆ ماوەی نزیکەی دووسەد ساڵیش، بەلای زۆربەی ڕوناکبیرانی ڕۆژئاواوە، زانستی نوێ، زانستێکی سەقامگیرو راست و رەوان و کامڵ و بە تەواو جێی متمانە بوو. هەر کە فاکتەرێك یا یاسایەکی زانستی نوێ دەدۆزرایەوە، ئیتر بە نەگۆڕ و چەسپاو لە قەڵەم دەدرا. ئەمە بوو بە نیشانەی جیاوازکەرەوەی زانست. زانیارییە زانستییەکان لە هەموو زانیارییەکانی تر زیاتر جێی باوەڕی مرۆڤن و وەك حەقیقەتی بێ هەڵە تەماشا دەکرێن بەرەو پێشەوەچوونی زانست، بەلای خەڵکەوە، بریتی بووە لەوەی کە بە دۆزینەوەی یاسا زانستیە نوێیەکان زیاتر زانست بەرەو پێشەوە دەچێ و گەشە دەکات و لە هەمان کاتیشدا دەبێت بە پاڵپشت و کۆڵەکە بۆ ئەو یاسا زانستیانەی جێی خۆیان گرتووە. زانیارییە زانستیەکان وەك گەنجینەیەکی پڕ لە گەوهەرە کە هەمیشە لە زیاد بوندایە، چەند لێی وەربگری هی نوێ دێتە شوێنی. ئەوانەش کە ئاشنا بوون بە بیری لوك و هیوم، دەیانزانی کە یاسا زانستیەکان بە تەواوی ئیسپات نەکراون، بەلأم ڕەچاوکردنی ئەو زنجیرە پێشکەوتنە نەپساوەیەی زانست و بەکارهێنانیان بۆ ئەو ماوە درێژە، ئەمانیش دەبوایە وەك هێزێکی لەبننەهاتوو حسابیان بۆ بکەن. یان بەلایانەوە ئەم جیاوازیە لە پراکتیکدا هیچ مانایەکی نەبێت.

## زانیاری ڕاست و دروست

لە دەوروبەری سەرەتای سەدەی بیستەمدا، لە بواری زانستدا، عەبقەرییەك پەیدا بوو، کە شانی لە شانی نیوتن دەدا. جولەکەیەکی ئەڵمانی بەناوی ئەلبیرت ئینشتاین (1869–1955) جۆرە تیۆرییەکی دانا کە لەگەڵ ئەوانەی نیوتندا ناکۆك بوون. هەروەك نیوتن، ئەمیش خاوەنی گەلێك بیروبۆچوونبوو سەبارەت بە بیرە بنەماییەکان. ئەم زیاتر ناوبانگی بەهۆی تیوری ڕێژەییەوە بلأوبۆوە. یەکەم جار تیوری ڕێژەیی تایبەت لە ساڵی 1905دا بلأوبۆوە. دواتریش لە ساڵی 1915دا تیوری ڕێژەیی گشتی. گومان لەوەدا نیە کە لە سەرەتادا، ناکۆکی و ناڕەزایی زۆر لەسەر ئەم تیوریانە هەبوون، بەلأم ئەوانەش کە ناکۆك و ناڕازی بوون. بەوپەڕی بایەخپێدانەوە تەماشایان دەکردن. کە

خۆی لە خۆیدا ئەنجامی دژواری هەبوو چونکە، ئەگەر ئینشتاین لەسەر حەق بێ، ئەوا نیوتن بە هەڵەداچووە. کەواتە ئەو هەموو کاتە ئێمە (زانیاری)مان نەبووە. چونکە بە پێوەرەکانی نیوتن حسابمان بۆ کردون. ئەنجامەکەشی هەروا بوو. جۆرەها تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندن ئەنجامدراو بیری لێکرایەوە بۆ حوکمدان لە نێوان ئەم دوو جۆرە تیوریەدا. بە تاقیکردنەوە شارەزاییەکان پەرەیانسەندو بوون بە پاڵپشت بۆ تیوریەکەی ئینشتاین. لە بواری فەلسەفەدا ئەم سەرئەنجامە وەك بومەلەرزە وابوو. لە دوای دیکارتەوە کرۆکی فەلسەفەی رۆژئاوایی گەڕانبوو بە دوای ڕاستی و دروستی یان دڵنیاییدا. بە پشتبەستن بە زانستە نیوتنیەکان، ڕۆژئاواییەکان لەو باوەڕەدا بوون کە ئەمان خاوەنی زانیارییەکی زۆری جێی متمانەو باوەڕن سەبارەت بە جیهان و گەردون. زانیاری وا کە رەگی پتەوی هەبێ و لە پراکتیکیشدا سوودی تەواوی هەبێ. لە هەمووی خراپتر یا ناخۆشتر ئەوەبوو: ئەو میتۆدانەی کە بەهۆیانەوە ئەو هەموو زانیاریانەی تا ئەو سەردەمە کۆکرابونەوە و وەك یاسا و تیوری ڕێکخرابوون و بووبوون بە گەرەنتی بۆ ڕاستی و دروستی زانیاریەکانمان، دەرکەوت هەڵەن و لە (زانست)ەوە دوورن. ئەی ئەگەر تا ئێستا ئەوانە زانست نەبوون، چی بوون؟ کە بەکارهێنانیان بووبووە مایەی پێشکەوتنی گەورە، لە چۆنیەتی تێگەیشتنمان بۆ جیهان و لە بوارە پراکتیکیەکانی تەکنۆلۆژیایدا قۆناغێکی نوێی مێژوویی هێنایە ئاراوە. بەتایبەتی سەردەمی شارستانیەتی پێشەسازی. بەڵام ئاشکرابوو کە ئەو میتۆد و پێوانانە راست و دروست نەبوون و ئەمەش ئێمەی مرۆڤی دوچاری گێژاوکرد. چونکە نەك تەنیا (زانیاری) هەڵەمان هەبووە، بەڵکو دڵنیاش نەبوین کە (زانیاری) خۆی، چیە.

## ژیانێکی هەمە ڕەهەند

بینیومانە چۆن (لوك) باسی لە کاریگەریەکانی شۆڕشی نیوتنی، بۆسەر فەلسەفە، کردوەو چۆن بیرەکانی ئەم کاریگەری گرنگیان هەبووە لە بواری بەڕێوەبردنی دەوڵەت و کۆمەڵگادا. لە بەرامبەر ئەمەدا، بۆ شۆڕشی ئینشتاینی، کارل پۆپەر (1902–1994) بە هەمان شێوە بووە. پۆپەر ساڵی 1902 لە ڤیەنا لە دایك بووە. باوکی پارێزەرێکی بەناوبانگ بووە. دایك و باوکی وازیان لە ئاینی جولەکە هێناوەو بوون بە مەسیحی. ئەم لەسەر رێبازی لۆسەر پەروەردە کراوە. لە هەرزەکاریدا مارکسیست بووە، بەڵام دواتر ڤێزی لە سیاسەتی کۆمۆنیستەکان بۆتەوە. چونکە ئەوان ئامادەبوون بۆ کوشتنی ئەو مرۆڤە ئاساییانەی کە بە رێکەوت لەگەڵ ڕەوت و تاکێکی کۆمۆنیستەکاندا نەدەگونجان. هەر بۆیە ئەم روی کردە پەیڕەوکردنی سیاسەتی سۆشیال دیموکرات.

پۆپەر لە ژیانی خۆیدا پراکتیزەی سیاسەتی سۆشیالی دەکرد. وەك کرێکارێك جلی لە بەردەکرد و لەگەڵ بێکاراندا دەژیا و لەگەڵ کەمئەندامدا کاری دەکرد. منالانی کەمئەندام بونە هۆی دروست بوونی پەیوەندی لە نێوان ئەم و زانا و شیکەرەوەی دەرونی ئەلفرێد ئەدلەر. هەروەها چالاك بوو لەو گروپەی مۆسیقادا کە شوێنبێرگ (*Schonberg*) پێشەوایی دەکرد و بووە بە هاوڕێی (*Webern*)ی ئاوازدانەر. لە پشوەکانیشدا شاخەوانێکی کارامە بوو. لەگەڵ کچە خوێندکارێکی جوان و هاوتەمەنیدا، زەماوەند دەکات. بە تێکڕا ژیانی لە ڤیەنا ژیانێکی ئارام و چڕ و دەوڵەمەند و هەمەلایەن بووە. پڕبووە لە جموجۆڵی جوان و کاری خۆش. بەڵام ساڵی 1937 نازیەکان هاتن. ساڵێك پێش ئەوەی هیتلەر بە زۆر نەمسا داگیر بکات. پۆپەر زەمالەی خوێندنی زانکۆ وەردەگرێ، لە یەکێ لە

زانكۆكانی نیوزلەند. هەموو ساڵانی جەنگ لەوێ ماییەوە. كە ساڵی1945 جەنگ تەواو بوو، ئەم رویكردە ئینگلتەرەو هەموو پاشماوەی ژیانی خزمەتگوزاری لە *London School of Economics* بەسەر برد. لەوێ بوو بە پرۆفیسۆری لۆژیك و میتۆدی زانستی. ژیانی لە ئینگلتەرە، تەواو جیاواز بوو لەوەی سەردەمی گەنجی لە ڤیەنا. لێرە بە ئەنقەست خۆی گۆشەگیر كرد. بۆ ئەوەی كاری نوسین بكات. ئەو نوسینانەی كە پانتاییەكی زۆری بابەتی جۆراوجۆر لە خۆدەگرن، تا تەمەن 92 ساڵیش. واتە ئەو ساڵەی تیا مردوە بەردەوام بیری پڕ بایەخ و نوێی بڵاودەكردەوە.

## لە زانستدا هیچ حیكمەتێك نییە.

بە بۆچوونی پۆپەر، گەر ئەو هەموو متمانەیەی كە بە زانستە نیوتنیەكان، بە درێژایی سەدان ساڵ هەبوو، دەركەوت لە جێی خۆیدا نیە و ڕاست نین. ئەوا ئیتر هیچ كاتێك ناكرێ ڕاستی و دروستی هیچ تیوریەكی زانستی ئیسپات بكرێ. ئەو شتانەی بە یاسا زانستیەكان ناو دەبرێن، تەنیا تیوریین و بەرهەمی وەعی مرۆڤن، ناتوانن ببن بە راستەقینەی تەواو باوەڕپێكراو دەربارەی جیهان. ئەگەر ئەوانە لە پراكتیكدا باشبن، ئەوا دیارە نزیكن لە ڕاستییەوە. بەڵام هەمیشە دەلوێ، تەنانەت گەر دوای سەدان ساڵیش بەرەو پێشەوەچونی پراگماتی. كە یەكێكی تر تیوریەكی باشتر دابنێ كە لەوەی پێشوو نزیكتر بێ لە راستییەوە.

پۆپەر گەشەی بەم بۆچوونەی خۆیدا، تا كردی بە تیوریەكی تەواوی سەربەخۆی تیوری زانست. بەلای ئەمەوە بوونی جیهانی فیزیكی پابەندی وەعی مرۆڤایەتی نیە و بەشێوەیەكی ڕادیكاڵ لە چەشن و جۆرە بونێكی ترە وەك لەوەی مرۆڤ لێی شارەزایە. لەبەرئەو جیاوازیە هەرگیز توانای تێگەیشتنی یەكجاری نیە. ئێمە تیوری ئیحتمالی دادەنێین بۆ شیكردنەوەیان. ئەگەر ئەو تیوریانە لە پراكتیكدا ئەنجامی بەسوود، یا سەركەوتویان هەبوو، ئەوا لە بەكارهێنانیاندا، بەردەوام دەبین. بەڵام وەك هەموو جارێك، درەنگ یا زوو، لە كۆتایدا، ئەوانە دوچاری تەنگژەمان دەكەن، چونكە ناتەواویەكانیان، لە یەكێ لە لایەنەكاندا دەردەكەوێت. ئیتر ئێمە هەوڵدەدەین بۆ دۆزینەوە یان بۆ دانانی تیوری باشتر، كە زیاتر هەمە لایەنی بێ و توانای ڕاڤەكردنی هەموو ئەو شتانەی هەبێ كە تیوریەكەی پێشوو كردویێتی. ئەو بەربەست و سنورانەش ببەزێنێ كە ئەوەی پێشوو دوچاری بووە. ئەم ڕێبازە تەنیا لە زانستدا بەكارنایەت. بەڵكو لە هەموو بوارەكانی كاركردندا. بە بواری كاری ژیانی رۆژانەشەوە. ئەمە نیشانەی ئەوەیە كە هەڵسوكەوتی ئێمە لەگەڵ شتەكاندا بە پلەی سەرەكی حەلكردنی كێشەكانە. هەروەها پێشكەوتنەكانمان لەوەدا نیە كە كارە زانستیە ڕاست و دروستەكانمان، بەكاری زانستی نوێ بەرەوپێش بەرین، بەڵكو بەردەوام لە گۆڕینی ئەو تیوریانەدایین كە هەمانە بەهی چاكتر. ئەو گەڕانەی بەدوای سەقامگیریدا، كە پاڵپێوەنەری فەیلەسوفە بەناوبانگەكانی رۆژئاوا بووە، هەر لە دیكارتەوە تا روسل. لێرەوە دەبێت وازی لێبهێنرێت. چونكە سەقامگیری، شتێك نیە چنگ بكەوێ.

ناكرێ بۆ یەكجاری و بە تەواوی ڕاستی تیوریەكی زانستی بسەلمێنرێ. هەروەها ناشێ بناغەیەكی تەواو پتەو بۆ سەرانسەری زانست یان بۆ سەرتاپا ماتماتیك دابمەزرێنرێت. كە پۆپەر ناوی دەبرد بە (*justifikationism*) پێشبینی كردنی ئەوەی كە دەكرێ ڕاستی تیوریەك بسەلمێنرێ، بیركردنەوەیەكی سادە و نەگونجاوە ئەگەر مرۆڤ بیەوێ لەناو زۆنگاوێكدا، خانویەك، لەسەر كۆڵەكە دروست بكات. دیارە پێویستە كۆڵەكەكان، یان

پایەکان ئەوەندە بچەقێنرێن کە بەرگەی قورسایی خانوەکە بگرن. گەر دوای ئەوەش نهۆمی تری لەسەر بکرێ ئەوا دەبێ زیاتر بناغەکە قایمتر بکرێ. بۆ ئەم پرۆسەیەش، بە زەرورەت، هیچ سنورێکی دیاریکراو نیە. هیچ ئاستێکی بڕیار لەسەر دراو نیە بۆ ڕاگرتنی ئەم خانووە یان هەر شتێکی تر. جا چ ئاستەکە سروشتی بێ یان مرۆڤ داینابێ، بۆ ئەم خانووە یان هەر خانوویەکی تر.

بەڵام کە هیچ تیوریەکی گشتی، ناتوانرێ بسەلمێنرێ. ئەوا دەتوانرێ، دژە سەلماندن هەبێ. کەواتە بواری تاقیکردنەوە هەیە. وەك ئاشکرایە بینینی ژمارەیەکی زۆری قازی سپی، هەرگیز ناتوانێ بیسەلمێنێ کە هەموو قازێك سپی رەنگە. بەڵام بینینی تەنیا یەك قازی ڕەش، دەتوانرێ ببێ بە دژە سەلماندن. واتە بیسەلمێنێ کە هەموو قازێك رەنگیان سپی نیە. بە هەمان شێوە، دەتوانرێ باوەڕە گشتیەکان تاقیبکرێنەوە، واتە بەگەڕان بە دوای دژە سەلماندندا. لەبەرئەوە، رەخنە گرنگترین یارمەتیدەرە بۆ پێشکەوتنی راستەقینە. بۆچونێك، یان باوەڕێك، کە هیچ چاودێرێك نەتوانێ، بە درۆی بخاتەوە. ناکرێ تاقیبکرێنەوە. لەبەرئەوە بە زانستی لە قەڵەم نادرێ. چونکە بەهەر جۆرێك بیری لێبکرێتەوە، هەر دروستی ئەو شتە پیشاندەدا و هیچ شتێکیش وەك بەڵگە، ئەم ڕاستییە ناسەلمێنێ. نموونەیەکی باش ئەم بۆچوونەیە: خوا هەیە، ئەمە ڕستەیەکی مانادارە و دەشێ ڕاست بێ. بەڵام هیچ ڕۆشنبیرێکی جیددی ناتوانێ بە زانیاریەکی زانستی دابنێ.

### کۆمەڵگەی کراوە

ئەو کتێبە، بیروروژێنەرەی، پۆپەر ئەم بیروڕایانەی تیادا بڵاوکردەوە، ناوی *Logic of Scientific Discovery* بوو، کە 1934 بە ئەڵمانی و 1959 بە ئینگلیزی چاپکراوە. یەکەمجار، ئەم بەهۆی پەیوەندیەکانیەوە بە زانایانی سروشتەوە گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە دەکرێ بیر و بۆچوونەکانی بۆ زانستە کۆمەڵایەتیەکانیش بە تەواوی بەکاربهێنرێت. لەبەرئەوە کتێبێکی لە دوو بەرگدا نووسی، بە ناوی: (*The open Society and its Enemies*) کە 1945 چاپیکرد. لێرەدا، بۆچونەکانی بەسەر تیوریە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکاندا جێبەجێ کردووە. دڵنیایی، بەلای ئەمەوە، بەهەمان شێوەی ناو زانستە سروشتیەکان لە سیاسەتیشدا کەم و بەدەگمەن چنگ دەکەوێت. هەر لەبەرئەوە هەرگیز ناشێ یەك جۆرە بۆچوون پەیڕەو بکرێ.

خراپترین و نەگونجاوترین فۆرمی کۆمەڵگەی مۆدێرن، کە ناتوانرێ داکۆکی لێبکرێ، ئەو کۆمەڵگەیەیە کە بە نەخشەکێشانی لەسەنتەرەوە مرۆڤەکان، بە جۆرە شێوازێکی ژیان ناچار دەکات و رێگای بیروبۆچونی جیاواز نادات. بە پلەی یەکەم لە رێگای رەخنەگرتنەوە دەکرێ دەرئەنجامەکانی پۆلەتیکی سۆسیال، پێش جێبەجێ کردنیان لە رێگای دەستنیشانکردنی ئەنجامە ناحەزەکانیانەوە، دەکرێ، کاریگەرێتی خراپیان کەمبکرێتەوە و هەوڵبدرێ بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارانەی کە دراون هەڵبوەشێنرێتەوە. ئەو کۆمەڵگەیەی ڕێگا دەدات بە رەخنە و گفتوگۆ و لایەنی ئۆپۆزیسیۆن، ئەتوانێ بە دڵنیاییەکی زۆرەوە، کێشە پراکتیکیەکانی پۆلەتیك چاکتر چارەسەر بکات، وەك لەو کۆمەڵگایانەی رێگە نادەن بە رەخنە. پێشکەوتن خێراتر و ئاسانتر دەبێ، ئەمەش پەیوەندی بە قەناعەتە مۆراڵیەکانەوە نیە.

هەروەك لە بواری زانستدا، وایە. لە بواری پۆلەتیکیشدا بەردەوام، بیرە گشتیەکان، لە ئاڵوگۆڕدان بەرامبەر ئەو بیرانەی کە بەو هیوایەین بیری باشترین. هەروەها کۆمەڵگەش بەردەوام لە گۆڕاندایە و پلەی گۆڕانکاریش لە

زیادبوندایە. هێنانە کایەی کۆمەڵگەیەکی ئیدیایی و هەوڵدان بۆ پاراستنی ئەو جۆرە کۆمەڵگەیە، بۆ ئێمە ئەڵتەرنەتیف نیە. ئێمە دەبێ تەعامول لەگەڵ پرۆسەی گۆڕانکاری بێ کۆتاییدا بکەین. دەبێ هەمیشە سەرقاڵی چارەسەرکردنی کێشەکان بین. پێویستە هەموو کاتێك، لە گەڕاندابین بە دوای دۆزینەوەی کێشە سۆسیالیەکان و هەوڵبدەین بۆ چارەسەرکردنیان. وەك هەژاری، بێ دەسەلاتی، هەڕەشەکردن لە ئاشتی، خراپی باری خوێندەواری، خراپی باری تەندروستی و نەخۆشخانەکان و.. هتد. لەبەرئەوەی کامڵ بوون و دڵنیایی تەواو زەحمەتە بە دەست بێت. دەبێ کەمتر خەریکی ئەوە بین خوێندنگای زەبەلاح یا نەخۆشخانەی زەبەلاح دروستبکەین. بەڵکو هەوڵبدەین بۆ نەهێشتنی بارە هەرە نالەبارەکان و یارمەتیدانی ئەوانەی دوچاریان بوون. ئێمە نازانین چۆن مرۆڤەکان بەختەوەر بکەین، بەلام دەتوانین ئازار و پەککەوتەیی نا پێویست نەهێڵین.

## گۆڕهەڵکەنی مارکسیزم

لەو کاتانەدا کە پۆپەر، سەرگەرمی بەڵگەهێنانەوە بوو بۆ ئیسپاتکردنی ئەم بیروڕایانەی خۆی. توند و تیژترین هێرشی دەکردە سەر هەرە بەناوبانگترین و بەهێزترین نوێنەرانی کۆمەڵگەی ئیدیا، بە تایبەتی بۆ سەر پلاتۆن و مارکس.ڕەخنەکانی ئەم بۆ مارکسیزم، بەشێوەیەکی گشتی، بە توندو تیژترین و کاریگەرترین ڕەخنە لە قەڵەم دران. هەر ئەم ڕەخنە گرتنەش بووە هۆی ئەوەی ناوبانگی پۆپەر، لەسەر ئاستی جیهاندا بلاوبێتەوە. دوای بلاوکردنەوەی کتێبی کۆمەڵگەی کراوە.. (*The open Society*) کە قۆناغێك بوو، یەك لەسەر سێی دانیشتوانی جیهان، لەو ولاتانەدا دەژیان کە خۆیان بە مارکسی دەناساند. هەر ئەمەش بووە هۆی بایەخ پێدانێکی جیهانی بە بیرۆکەکانی ناو ئەو کتێبە.

### سەرچاوە

***Bryan Magee – Filosofi – Albert Bonniers Forlag.***

### 1-کارل پۆپەر

کارل پۆپەر، فەیلەسوفی زانست، خەڵکی نەمسا، لە ڤیەنا لەدایکبووە و هەر لەوێش خوێندویەتی. ساڵی 1945 بووە بە هاولاتی لە ئینگلتەرەو دواتر بووە بە پرۆفیسۆری لۆژیك و میتۆدی زانستی لە ***London School of Economics***.

### 2-دەوڵەتی پۆلیسی

پۆپەر گەیشتە ئەو بڕوایەی کە خراپترین فۆرمی کۆمەڵگە ئەو جۆرەیە کە لەسەنتەرەوە بەڕێوە دەبرێت و ڕێگا بە جیاوازی بیروباوەڕ نادات. ئەم جۆرە حاڵەتە لە ڕۆمانەکەی ***George Orwells*** دا کە ناوی (1984)ەو لە (1949)دا نوسراوە باسی لێوە کراوە ئۆرویل بەڕای خۆی باس لەو جۆرە کۆمەڵگایە دەکات، کە ئیحتمالە دروست ببێ، گەر ڕێگا بدرێ سیاسیەکان ڕژێمێکی تۆتالیتێر دابمەزرێنن.

### 3-ڕێپێوانی ناڕەزایی دەربڕین

پۆپەر، پێی وابوو کە ڕەخنەگرتن و ئۆپۆزیسیۆن کە لە کۆمەڵگەی کراوەدا ڕێگای پێ دراوە. باشترین و کاریگەرترین شێوازە بۆ بەرەوپێشبردنی سیاسەتی سۆسیال. ئەو کۆمەڵگەیەی کە بیری جیاواز تیایدا قەدەغەیە، کۆمەڵگەیەکی زیانبەخشە.

# کورتەیەك لە ژیانی ڤیتگنشتاین

لە فارسییەوە: سامان کۆنەپۆشی

لۆدۆیگ یووزێف ڤیتگنشتاین (1951-1889) لە شاری ڤییەن لەدایك بوو، هەشتەمین و دواهەمین منداڵی بنەماڵە بوو. باوە گەورەی باوکی لۆدۆیگ کە لە دینی جووەوە باوەڕی بە ئاینی پرۆتستانت هێنابوو، پێش لە کۆچکردن بۆ ڤییەن لە ساکسۆنی بازرگانی پەشم بوو. باوکی لۆدۆیگ، کارل ڤیتگنشتاین، کوڕێکی بەورە بوو دژ پەروەردە سوننەتییەکان راوەستاو لە هەڤدە ساڵەییدا بەرەو ئەمریکا هەڵات. پاش دوو ساڵ گەڕایەوە بۆ ڤییەن و خولێکی کورت خایەنی لە رشتەی ئەندازیاری تێپەڕاند. وەك نەخشەکێش (طراح) دەستی دایە کاری خۆی و نەخشەی شەریکەیەکی توانەوەی پۆڵای کێشاو زۆرتری قۆناغەکانی دروستکردنی ڕێنمایی کرد، بوو بە کارگێڕی و ماوەی دەساڵ بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی گەورەی پۆڵا بوو، دوابەدوای ئەوە یەکەمین یەکێتی کۆمپانیاکانی پیشەی پۆڵای ئوتریشی ڕێکخست. دایکی لۆدۆیگ کچی بانقدارێکی ڤییەنی بوو. دایکی کاسولیك بوو لۆدۆیگیان لە کلێسای کاسۆلیك "غسل تعمید"دا. لۆدۆیگ سێ براو دوو خوشکی بوو، هەموو منداڵەکان لە توانایەکی هونەری و زەینی (ذهنی) بەهرەمەندبوون. دایکیان زۆرتر خۆی بەکاری مۆسیقاوە خەریك دەکرد و ماڵەکەیان ناوەندی بەزم و ڕەزمی مۆسیقا بوو. یوهانس برامس زۆر هاتووچۆی ماڵیانی دەکرد و دۆستی نزیکی بنەماڵەکەیان بوو. یەکێك لە براکانی لۆدۆیگ، "پاوۆل" بوو بە پیانۆژەنێکی بەناوبانگ.

لۆدۆیگ تا چواردە ساڵەیی لە ماڵەوە پەروەردە کرا. قوتابییەکی تایبەت بوو و گوایە زۆرترین ئینتیمای بۆ کەرەستە میکانیکییەکان بوو، مەکینەیەکی بەرگدرووی کەدروست کرد، پشتگیرییەکی زۆری لێکرا. دایك و باوکی بڕیاریاندا بینێرن بۆ قوتابخانەیەك لە لینتز لە ئوتریشی گەورە (علیا)، کە لەوێدا بەجێی پەروەردەی باو، بیرکاری و فیزیای سەرەتایی دەوترایەوە. پاش سێ ساڵ خوێندن لە لینتز، ڤیتگنشتاین لە قوتابخانەی باڵای فەقێ لە شاری لۆتنبۆرگی بێرلین بۆ ماوەی دوو ساڵ ئەندازیاری میکانیکی خوێند. ئەم قوتابخانەیەی بە مەبەستی چوون بۆ بریتانیا لە بەهاری ساڵی 1908دا بەجێهێشت. لە هاوینی

ساڵی 1908 لە شوێنی "کایت سواری" دێربی شاییر دەستی بە تاقیکردنەوە (ازمایش) لەسەر "کایت" کرد. هەر لە پاییزی ئەو ساڵەدا وەك لێکۆڵەری ڕشتەی ئەندازیاری لە زانکۆی مەنچەستەر ناونووسی کرد و بە درێژایی سێ ساڵ لە بواری فڕینی ئاسمانی (هوانوردی) لێکۆڵینەوەی کرد و دیناموویەکی جێت و "مەلەخ"ێکی هەوا پەیمایی داڕشت.

خولیاکانی ڤیتگنشتاین وردە وردە گۆڕدرا بۆ بیرکاری ڕووت و پاشانیش بونیادی فەلسەفەی بیرکاری. بە ڕێکەوت کتێبی "بنەماکانی بیرکاری" بێرتراند راسێلی دەستکەوت کە زۆر پێی سەرسام بوو. بڕیاری دا ئەندازیاری بەجێ بێڵێت و لای راسێل، لە کیمبریج دەست بە لێکۆڵینەوە بکات. لە سەرەتای ساڵی 1912دا لە کۆلیجی ترینیتی وەرگیراو سێ ترمی ساڵی 1912 و دووترمی ساڵی 1913ەی لەوێ تێپەڕاند. لە ژێر چاودێری راسیل دا بە تەواوەتی دەستی بە خوێندنەوەی لۆجیکی کرد و گەشەیەکی جێی سەرنجی کرد. دوای ماوەیەکی کەم دەستی بە لێکۆڵینەوەیەك کرد کە لە ئاکامدا بە بیری لۆجیکی "تراکتاتوس" کۆتایی هات.

نزیکترین دۆستی ڤیتگنشتاین لە درێژەی یەکەمین ساڵەکانی نیشتەجێبوونی لە کیمریج، خوێندکارێکی هاو پۆلی خۆی بەناوی دیێویدپین سێنت بوو کە دواتر تراکتاتوسی پێشکەش بەو کرد. کاتێك لە بەهاری ساڵی 1912دا یەکدیان ناسی، ڤیتگنشتاین جیا لە خوێندنی لۆجیك، تاقیکردنەوە گەلێکی لە بواری ڕیتمی مۆسیقا لە تاقیگەی دەروونناسی ئەنجام دەدا. تامەزرۆیی زۆر بە مۆسیقا ئەو و پین سێنتی لەیەك نزیکترکردەوە، ئەوان کۆکراوەیەکیان لە چل ئاوازی شوبێرت بوو کە ڤیتگنشتاین بە فلوت میلۆدییەکانی لێ دەداو پین سێنتیش بە پیانۆ هاریکاری دەکرد. ڤیتگنشتاین ئەیتوانی کلارنێت لێ بدات (بنوازد)، هەروەها زاکرەیەکی بەهێز و توانایەکی سەرسوڕهێنەری لە بەڕێوەبردنی دەست بەجێی مۆسیقادا هەبوو. ڤیتگنشتاین خولیای زۆر بە مۆسیقای لە هەموو ژیانیدا پاراست، لە نووسینە فەلسەفییەکانیدا هێماگەلێکی زۆر بەچییەتی تێگەیشتنی مۆسیقایی بوونی هەیە.

لە ساڵی 1912دا، ڤیتگنشتاین خەریکی یەکەمین خوێندنەوەی بەربلاوی خۆی لە بواری فەلسەفەدا بووە بە پێی وتەی پین سێنت، دڵپاکانە سەرسوڕمانی خۆی لەوە ڕادەگەیاند کە ئەو فەیلەسوفانەی "لە نەزانیدا پێیدا هەڵدەگوتن". بەم حاڵەش، "ئەحمەق و خلەتێنەربوون و تووشی هەڵەگەلێکی ڕق هەڵسێن هاتوون!" ئەو و پین سێنت لە کاتی پشووداچوون بۆ ئایسلەند و نەرویج و ڤیتگنشتاین هەموو خەرجییەکەی لە ئەستۆ گرت. پین سێنت ژیانی لەگەڵ ڤیتگنشتایندا سەخت ئەبینی: ئەو زوو نارەحەت دەبوو، تووڕە و زۆربەی کات خەمۆك بوو. بەڵام کاتێك کەیف ساز بوایە یەکجار زەرە شیرین دەبوو، بڕێکات ئەو بڕوایەی کە مردنی زۆر نزیکە و کاتی ئەوەی نابێت بیرە نوێکانی لە لۆجیکدا بە ئاکام بگەیەنیت و و بڕێکات ئەم بیرۆکەیەی کە لەوانەیە کارەکەی لە بواری لۆجیکدا بەهای راستەقینەی نەبێت، بێ تاقەتی ئەکرد. بەڵام باری سایکۆلۆژی لە چاو ئەو کاتەی کە هێشتا نەهاتبوو بۆ کیمبریج، کەمتر لە نەخۆش دەچوو. ئەو بە پین سێنتی وتبوو کە لە درێژەی چەندین ساڵی ڕابردوودا کەمتر ڕۆژێك بووە بیری لە خۆکوشتن "وەکو ئەگەرێك" نەکردبێتەوە. خوێندنی فەلسەفە لەلای راسێل بووە بە هۆی "ڕزگار"بوونی.

ڤیتگنشتاین بە باوەڕ و بێ پسانەوە لەسەر هزرە لۆجیکییەکانی خۆیدا کاری کرد. لە بەهاری ساڵی 1913 بەو هیوایەی لە حاڵەتی "خلسە"دا بتوانێت وەڵامگەلێکی ڕوون بۆ پرسیارە سەختە لۆجکییەکان بدۆزێتەوە، لە خەوی دەستکرد کەڵکی وەرگرت. ئەم بەرنامەیەی لە مێشکدا بوو کە چەند ساڵێك لە نەرویج بە گۆشەگیری بمێنێتەوە و خەریکی کێشە لۆجیکییەکان بێت. هۆکارەکانی بۆ ئەم کارە، بەپێی بۆچوونەکانی ئەو بۆ پین سێنت، ئەوە بوو کە لە نەبوونی هەموو هۆکارەکانی پرشوبڵاوی مێشکدا باشتر ئەتوانێت کارکات، بەڵام هەروەها وتبووی "ماڤ ژیانی لە جیهانێکدا نییە" کە هەردەم ڕق لەوانی دی هەڵدەگرێت و بە تووڕەبوونەکەی دەیانڕەنجێنێ. ڤیتگنشتاین بەرنامەکەی خۆی جێبەجێ کرد و لە ئاخرەکانی ساڵی 1913ەوە تا دەستپێکردنی شەڕی جیهانی یەکەم لە نەرویج نیشتەجێبوو. ئەو لە مەزرایەك هەڵکەوتوو لە ئێسکیوڵدن نیشتەجێ بوو و دواتر ژوورێکی (کوخێك) دروست کرد و لەو دا ژیانێکی پەراوێزنشینی دەستپێکرد.

ڤیتگنشتاین لەم قۆناغەدا ئاڵ و گۆڕی نامەی لەگەڵ ڕاسێڵدا هەبوو. نامەکانی یەکجار پڕ لە سۆز بوون و بەهۆی پەیداکردنەکانی (کشفیات) لە بواری لۆجیکدا پڕ بوو لە گڕوتین. بەڵام ئەو ئەم باوەڕەی نەدەشاردەوە کە ئاوات (امال)ەکانی ئەو و ڕاسێل ئەوەندە لێك جیاوازن کە چیدیکە بە کەڵکی دۆستایەتییەکی ڕاستەقینە نایەن. ئەو دەیگوت دوو نەفەر تەنیا کاتێك ئەتوانن پێکەوە دۆست بن کە هەردووکیان "بێ غەش" (خالص)بن و بێ ئەوەی بن بە هۆی ئازاری یەکدی بتوانن پێکەبێ پەردەبن. پەیوەندییەك کە لەسەر بناغەی فرتوفێڵ بێت، ناتوانێت جێگەی ڕەزا مەندی بێت. ئەو و ڕاسێل دەبێ بە تەواوەتی پەیوەندییەکانیان بپچڕێنن، یاوەکوو بەکارە لۆجیکییەکان سنورداری بکەن. هەردووکیان کەم و کورتیان هەیە، بە تایبەتی خۆی: "ژیانی من پڕە لە ناشیرینترین و دزێوترین بیرۆکە و کردەوەکان (لەم وتەیەدا زێدە ڕۆییەك نییە).

لەوانەیە بڵێن کوشتنی کاتە کە لە بارەی خۆمەوە بیربکەمەوە، بەڵام چۆن دەتوانم لۆجیکزانێك بم، ئەگەر هێشتا مرۆڤ نەبم! پێش لەهەر کارێکی تر دەبێ خۆم خاوێن کەمەوە.

کاتێك شەڕ دەستی پێکرد، ڤیتگنشتاین بەویستی خۆی چووە ناو ئەرتەشی ئوتریشەوە. سەرەتا لە "رستە"ی تۆپخانەی گەشتیەك لە چۆنی ڤیستۆلاولە "یگان"ی تۆپخانە لە کراکف، خزمەتی کرد. ڤیتگنشتاین نێردرابۆ قوتابخانەیەکی پەروەردەی ئەفسەر و بە دوای ئەودا لە سەنگەری ڕۆژهەڵات و پاشان لە تۆپخانەی کویستانی تیرول لە باشوور خزمەتی کرد. لە ماوەی ئەم ساڵانەدا، کاری بەسەر کتێبەکەیەوە درێژە پێداو هزرە فەلسەفییەکانی لە "دەفتەرچە" گەلێکدا کە لە کۆڵە پشتییەکەیدابووی، دەنووسییەوە. لە ئووتی ساڵی 1918دا کتێبەکەی دوایی هێنا کاتێك کە هێزەکانی ئیتالیا لە نۆڤامبێردا بە دیل گرتیان، ڕەشنووسی کتێبەکەی پێ بوو. ئەو لە دیلخانەکەیەوە کە لە نزیك مونتەکاسینۆ بوو، نامەیەکی بۆ ڕاسێل نووسی و بەدوای ئەودا بە هۆی "پیك"ێکی سیاسی و بەنێونجی تێکۆشانی دۆستێکی هاوبەش بەناوی جێی. ئێم. کینز دەسنووسەکانی پێگەیاند.

لە کاتی خزمەت لە سەنگەری ڕۆژهەڵاتدا، ڤیتگنشتاین لە کتێب فرۆشییەك لە گالیسیا بەرگی یەکێك لە بەرهەمەکانی تولستوی لە بواری ئەناجیلەوە کڕی، وا دیارە کاریگەرییەکی قووڵی

لەسەری دانا. لە دیلخانەکەی لە ئیتالیا و لەوانەیە بۆ یەکەمین جار بەرگێکی رەسمی ئەناجیلی خوێندەوە، و دەگێڕنەوە کە زۆریك لە بابەتەکانی سەریان لێ شێواند و گومانی لە راستبوونیان کرد، ڕەنگە بەهۆی جیاوازیگەلێکەوە کە لەگەڵ روانگەکانی تولستویدا هەیبوو.

ڤیتگنشتاین مایل بوو کە کتێبەکەی، "پەیامی لۆجیکی – فەلسەفی"، بەخێرایی لە چاپ بدرێت، کەمێك دوای ئازادبوونی لە دیلخانەو گەڕانەوەی بۆ ڤییەن لە ئووتی ساڵی 1919دا، کتێبەکەی دا بە ناشرێك، ئەو لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە کتێبەکەی لە ئاکامدا ئەو بابەتانەی کە ئەو و ڕاسێل لەسەریان مشتومڕیان کردبوو چارەسەر کردووە. بەلاّم لە نامەکەی راسێل بۆی دەرکەوت کە راسێل لە بیرۆکە بنچینەییەکانی تێنەگەیشتووە و، لەوە دەترسا کە هیچ کەس لێیان تێنەگات. بۆ باسکردن لەسەر کتێبەکە ئەو و ڕاسێل لە دیسامبری ساڵی 1919، لە هولەند یەکتریان بینی. راسێل قەبووڵی کرد کە پێشەکییەك بۆ کتێبەکە بنووسێت، بەلاّم لە مانگی مەیدا ڤیتگنشتاین نامەیەکی بۆ راسێل نووسی و پێیوت، کە پێشەکییەکە تێگەیشتنی نادروست (کج فهمی) زۆری تێدایە و ناتوانێت مۆڵەتی پێ بدات کە لەگەڵ کتێبەکەیدا لە چاپ بدرێت، بە دوای ئەودا، ناشرێك کە دانووستانی لەگەڵدا کردبوو، کتێبەکەی ڕەت کردەوە لە ژوویەی ساڵی 1920دا. ڤیتگنشتاین بۆ راسێلی نووسی کە هیچ هەنگاوێکی دیکە بۆ لە چاپدانی کتێبەکە هەڵناگرێت و ڕاسێل دەتوانێت هەر کارێك کە دەیەوێت لەگەڵ کتێبەکەدا ئەنجامی بدات. دەقی ئاڵمانی کتێبەکە لە ***Annalen der Naturphilosophie*** (ساڵنامەی فەلسەفەی سروشتی) ویلهێلم ئیستواڵد لە ساڵی 1921دا بلاّوکرایەوە. ساڵی دواتر دەقەکە لەگەڵ وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەیدا، بەناوی "پەیامی لۆجیکی فەلسەفی" لە لەندەن چاپ و بلاّوکرایەوە. وەرگێڕانێکی ئینگلیزی نوێتر و باشتر لە کتێبەکە لە ساڵی 1961دا بلاّوکرایەوە.

بەڕاسپاردەی ڤیتگنشتاین، زۆربەی ئەو دەفتەرچە یادداشتانەی کە لە نووسینی (نگارش)تراکتاتوسدا کەڵکیان لێ وەرگیرابوو، لەناوبران، بەلاّم بە ڕێکەوت سێ دانە لە دەفتەرچەکان کەهی ساڵەکانی 16–1914 بوون، مانەوە و لە ساڵی 1961دا لەگەڵ وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەیدا چاپ و بلاّوبوونەوە. ئەم یادداشتانە وێنایەکی (تصویر) رووناك لە رادەی مشتومڕی ڤیتگنشتاین لەگەڵ کێشەکانی تراکتاتوس دانیشان دەدەن، وبڕێ کات لە نیشاندانی ئەوەدا کە کێشەکان چ بوون، بە کەڵکن.

ڤیتگنشتاین کەمێك پاش ئەوەی گەڕایەوە بۆ ژیانی ئاسایی (غیر نیزامی) بڕیاری دابێت بە مامۆستای قوتابخانە، بۆ وەدەستهێنانی مۆڵەت، لە خولێکی پەروەردەی مامۆستادا بەشداری کرد و لە پاییزی ساڵی 1920دا لە گوندێك بەناوی تراتن باخ هەڵکەوتوو لە ئوتریشی خواروودا (سفلی) دەستی کرد بەوانە وتنەوە بۆ منداڵانی 9 و 10 ساڵانە.

مامۆستایەکی سەختگیر بوو. لەگەڵ هاوکارەکانیدا نەدەهاتەوە و زۆرتری کاتەکان، بێ تاقەت بوو. کاتێك گوێزرایەوە بۆ گوندێکی تر بڕێك شادمانتربوو، چونکە یەکێك لە مامۆستاکان، بەناوی رودێلف کودێر، پیانۆژەنێکی بەتوانابوو. ئەم دوانە زۆربەی دوانیوەڕۆکان خەریکی مۆسیقا دەبوون و ڤیتگنشتاین کلارنێت یان فلووتی لێ دەدا. تا ساڵی 1926 مامۆستا بوو. لە ساڵی 1924دا فەرهەنگێك پێکهاتوو لە شەش تا حەوت هەزار وشەی بۆ کەڵك لێ وەرگرتنی قوتابییەکانی

قوتابخانە سەرەتاییەکانی گوندەکانی ئوتریش ئامادە کرد، ئەم کتێبە بچوکە لە ساڵی 1926دا چاپ کرا.

ڤیتگنشتاین بە مردنی باوکی لە ساڵی 1913دا، سامانێکی یەکجار زۆری پێ گەیشت. هاوینی ساڵی دواتر نامەیەکی نووسی بۆ لۆدۆیگ فون فیکێر، سەرنووسەری گۆڤاری ئەدەبی ***Der Brenner*** و پێشنیاری کرد پارەیە (مبلغ)کی شایانی سەرنج بنێرێت تا لە نێوان هونەرمەند و شاعیرە نەدارو پێویستیدارەکانی ئوتریشدا دابەش بکرێت.. "راینێرماریاریلکە" و "گیۆرگ تراکێل"ی شاعیر مەبلەغێکی جێی سەرنجیان لەم سەرچاوە نەناسراوە وەرگرت. ڤیتگنشتاین دوای کۆتایی هاتنی شەڕو گەڕانەوە بۆ ژیانی ئاسایی (غەیر نیزامی) سامانەکەی خۆی بەخشی بە دوو خوشکەکەی. هۆیەکی ئەم کارە ئەوە بوو کە نەیدەویست پارەکەی ببێت بە هۆی دۆستایەتییەکانی. بەڵام بێگومان هۆکاری سەرەکی ئەم کارە، حەز و مەیلی ڤیتگنشتاین بوو بۆ ژیانێکی سادە و هاوکات بە قایل بوون (قەناعەت).

لە خولەکانی مامۆستاییدا، تا کاتێك کە فرانك ڕەمزی لە ساڵی 1923دا چاوی پێکەوت، پێدەچێت ڤیتگنشتاین سەرنجی (گرنگی) بە فەلسەفە نەدابێت. "ڕەمزی"، بیرکاری زان و فەیلەسوفی لاو و دیاری کیمبریج بوو و تازە ڕەخنەیەکی لەسەر تراکتاتوس بە ئاکام گەیاندبوو و دەیەویست لە بارەی کتێبەکەوە لەگەڵ نووسەرەکەیدا باس بکات. ئەو ڤیتگنشتاینی لە ژیانێکی یەکجار سادە لە گوندێکی بچووکدا دۆزییەوە. ڤیتگنشتاین زۆر پێی شادمان بوو، ماوەی دوو هەوتوویان زۆرتر، ڕۆژانە چەندین کاتژمێر (سەعات) خەریکی ڕوونکردنەوەی بابەتەکانی کتێبەکەی دەبوو. بەڵام ئەو بەڕەمزی گوت کە چیدیکە کارێك لە فەلسەفەدا ناکات، چونکە مێشکی "چیدیکە انعطاف پڕیرنییە". ڤیتگنشتاین باوەڕی وابوو کە هیچ کەسێك ناتوانێت تەنیا بە خوێندنەوەی تراکتاتوس، لێی تێبگات، بەڵکو کەسێك لێ تێدەگات، کە ڕۆژێك سەربەخۆیانە بیری لەم هزرانە کردبێتەوە و لە دۆزینەوەی بەیانی دەقیقیان لە کتێبێکدا چێژ وەرگرێت.

پاش وازهێنان لە پیشەی مامۆستایی لە ساڵی 1926دا، ڤیتگنشتاین لە دەیر (کلیسا)یەکدا لە ئەگەری دەستپێکردنی ژیانی قەشەیی کۆڵییەوە، بەڵام باوکی رۆحانی گەورە (ارشد)ی دەیدە کە ڕێگەی ئەم کارەی لێگرت. هەر هاوینی ئەو ساڵە لە هۆتلدۆرف لە نزیکی ڤییەن، وەك یاریدەدەری باخەوان، لای قەشەکان سەرقاڵی کارکردن بوو. لەم نێوانەدا، یەکێك لە خوشکەکانی ڤیتگنشتاین ڕایسپارد لە پۆل ئینگلهانی بیناساز (معمار) کە لە ڤییەن خانوویەکی بۆ دروست بکات. هینگلمان کە لەگەڵ ڤیتگنشتایندا دۆست بوون، پێشنیاری کرد، پێکەوە خانووەکە دروست بکەن. ڤیتگنشتاین قەبووڵی کرد و لە راستیدا بوو بە مێشکی بیرکەرەوەی پرۆژەکە و ماوەی دوو ساڵ سەرقاڵی بوو. جی ئێچ فون. رایت، بیناکەی بە "نیشاندەری دروستکەرەکەی" وەسپ کردوە. بیناکە بێبەریی لە هەر چەشنە دیکۆراسیۆنێکە و خاڵی جیاکەرەوەی بیناکە وردبینی زۆر لە قەبارە و گونجاویدایە. جوانی بیناکە هەر لە جۆری سادە و قایمی ڕستەکانی تراکتاتوسە. هەر لەم قۆناغەدا، ڤیتگنشتاین لە پەیکەرسازیشدا کارێکی ئەنجامدا.

تراکتاتوس کاریگەرییەکی زۆری لەسەر موریتز شلیك، مامۆستای زانکۆ لە ڤییەن، دانابوو. ئەو توانی پەیوەندی بە ڤیتگنشتاینەوە بگرێت و قایلی بکات کە لە یەك یان دوو کۆبوونەوەی

گرووپێك كه خۆی بنیاتی نابوو و به بازنەی ڤییەن ناسرابوو، بەشداری بكات. بەدوای ئەودا موریتز شلیك و فریدریش وایزمان، چاوپێكەوتنگەلێكیان لەگەڵ ڤیتگنشتایندا سازكردو، لەواندا ڤیتگنشتاین دەستی كرد بە توێكاری بیرۆكە گەلێك، كە گوێزرایەوە بۆ ئەندامانی دیكەی بازنەكەش.

ڤیتگنشتاین، لە ژانوییەی ساڵی 1929دا گەڕایەوە بۆ كیمبریج و سەر لەنوێ خۆی خەریكی فەلسەفە كردەوە. هۆی ئەم تازەكردنەوەی خولیایە دیار نییە، بەڵام دەڵێن كە لە ژێر كاریگەری وتاربێژی ئێل. ئێی. جێی براور لە بواری بونیادەكانی بیركاری، لە ڤییەن، لە ساڵی 1928دابووە. ڤیتگنشتاین زانی كە ئەگەر پەیماننامەیەك ڕوو بكات، شایانی وەرگرتنی پلەی دوكتۆرا دەبێت، هەر بۆیە تراكتاتوسی ڕووكرد. ڕاسێل وجی. ئێی. مور، دیاریكران بۆ ئەوەی تێستی شەخایی لێبگرن و لە ژووەنی ساڵی 1929دا تێستەكەیان لێگرت. موور، ئەم دۆخەی "هەم دڵچەسپ و هەم پێكەنیناوی" دەبینی كولیجی ترینیتی بۆرسەیەكی لێكۆڵینەوەیی دابە ڤیتگنشتاین. لەم كاتەدا وتارێكی كورتی بەناوی، "تێبینی گەلێك لەمەڕ شێوەی لۆجیكی" چاپ و بلاّوكردەوە و زۆر زوو بەم ئاكامە گەیشت كە وتارێكی لاواز و شێواو (اشفته)ە. ئەم وتارە و تراكتاتوس تەنیا نووسراوە گەلێكی فەلسەفی بوون كە لە كاتی ژیانیدا، بلاّوكرانەوە.

ئەو لە ژانوییەی ساڵی 1930دا وانە وتنەوەی دەستپێكرد. تا هاوینی ساڵی 1936 لە كیمبریج مایەوە و پاشان بۆ ماوەی ساڵێك چوو بۆ كۆخەكەی لە نەرویج و دەستی كرد بە نووسینی "توێژینەوە فەلسەفییەكان"، لە ساڵی 1937دا گەڕایەوە بۆ كیمبریج و دوو ساڵ دواتر وەك خاوەنی كورسی فەلسەفە، بوو بە جێنشینی "مور"

وانەكانی ڤیتگنشتاین كاریگەرییەكی زۆری بەسەر گوێگرەكانیەوە دادەنا. وانەكان بەبێ یاداشت یان خۆ ئامادەكردنی لە پێشتر دەوترانەوە. هەر دانیشتنێكی دەرسی بەرهەمێكی فەلسەفی نوێ بوو. هزرەكانی بە ئاسانی نەدەهاتنە مێشكییەوە. ئەو لەگەڵ هزرەكانی مشتومڕێكی زۆری دەكرد. هەندێكات بێدەنگیگەلێكی درێژخایەن بەسەر جەوەكەدا زاڵ دەبوو. لەو حاڵەتەدا چاوی دەبڕییە جێگایەك، دەم و چاوی گەلێك سەرزینوو (شاداب) نیشانی دەدا. حاڵەتێكی بەڕاستی (جدی) هەبوو و دەستەكانی جوڵەگەلێكی جێی سەرنجیان دەكرد. بیسەرەكانی دەیانزانی كە ئامادەی جدییەت، ڕاكێشەری (جذبە) و هێزی نائاسایی هزر بوون. كاتێك دەستی بە قسەكردن دەكرد، وشەكان "روان" نەدەوتران، بەڵام بە توانا و دڵنیاییەوە بوون. كاتێك قسەی دەكرد، دەموچاوی یەكجار گۆڕاو بە هەست بوو، چاوەكانی زۆر جار تووڕەیی پێوەدیار بوو بەگشتی كەسایەتییەكی فەرماندەرانەی هەبوو. وانەكانی بابەتگەلێكی بەربلاّوی لەخۆ دەگرت و پڕ بوون لە روونكردنەوە و پێوانە و بەراورد. ڤیتگنشتاین بە هێزێكی تەواوەوە و تەنانەت بەتین (شەوق) و بزوان (هیجان)ەوە ڕووبەڕووی بابەتە فەلسەفییەكان دەبووەوە. بە پێچەوانەی زۆرێك لە فەیلەسوفەكانی تر كە لە ڕاستیدا دەیانهەوێت بەجێی شیكاری حلكردنی پرسیارەكان، پۆستەیان بكەن. هیوای ڤیتگنشتاین ئەوە بوو كە ئەم مەسەلانە ڕوون كاتەوە و لە دەستیان دەربازببێت. ئەو بە دەنگی بەرز بە دۆستێكی گوتبوو: "باوكی من بازرگان بوو منیش هەروەها بازرگانم!" ئەو دەیەویست كارە فەلسەفییەكەی وەك بازرگانی و

کاریگەر بێت: تا مەسەلەکان چارەو شیکار (حل و فصل) بکات.

ڤیتگنشتاین، کاتێك سەرقاڵی فەلسەفە نەبوو، بڕێکات لەگەڵ دۆستێکدا، بە جوانی حاڵەتی بە ڕاستبوونێکی دروستکراوی بەخۆیەوە دەگرت و لە نیهایەتی "وقار"دا شتگەلێکی بیٚ واتای دەوت. بەڵام ئەمە کاتە شادەکانم بوون. زۆرتری کاتەکان بیرۆکەکانی ڕەش و هیوابڕ (یأس آلور) بوون. ریاکاری، خۆبەزل زانین و ساردی دڵی ئینسانەکان زۆریان دەترساند. زۆربەی کات لە سنووری بیٚ هیواییدا نیگەرانی ژیانی خۆی بوو. سۆز و پێوەندی مرۆڤەکان، بەڕای ئەو، ئاوەڵناوگەلێکی گرینگتر لە هێزی عەقلانی و لێهاتوویی بۆ تاکەکەس بوون. پێویستیەکی زۆری بە دۆستایەتی هەبوو لە بەرامبەر دۆستدا یەکجار دەست و دڵ بازبوو. هاوکات، پاراستنی پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵیدا، ئەوەندە ئاسان نەبوو، چونکە بە ئاسانی تووڕەدەبوو و بواری ئەوەی تێدا بوو کە کەم و کوڕی گیر، بێبڕواو پڕداواکاری بێت.

لە شەڕی جیهانی دووەمدا، ڤیتگنشتاین سەیرکردنی شیاو نەدەبینی. پیشەی پاسەوانی لە خەستەخانەی "گای" لە لەندەنی گرتە ئەستۆ و، لە نۆڤامبری ساڵی 1941ەوە تا ئاڤریلی ساڵی 1943 لەویٚ کاری کرد. پاشان گواستیانەوە بۆ خەستەخانەی سەلتەنەتی ڤیکتۆریا لە نیوکاسێل وەك یاریدەدەری تاقیگەی لێکۆڵینەوەی "بالینی"، تا ساڵی 1944، خزمەتی کرد. ئەو بە تێفکرینی درێژ و قورس لە بواری کێشە پزیشکییەکانەوە، ئەو پزیشکانەی کە کاری بۆیان دەکرد، دەخستە ژێر کاریگەرییەوە. ئەم بیرکردنەوانە زۆرتری کاتەکان، تیٚ ڕامانێکی (نگرش) نویٚ بۆ ئەو کێشانەی لێدەکەوتەوە. ڤیتگنشتاین لە نیوکاسێلدا شێوەیەکی سادەی بۆ مەزەندەی قەبارەی برینە شەڕییەکان داهێنا، کە لە دیاریکردنی دەرمانی بریندارەکاندا بە کەڵك دەهات.

لە ساڵی 1944دا وانە وتنەوەی لە کیمبریج دەست پێکردەوە. بەڵام یەکجار زۆر لە پیشەی مامۆستایی ناڕازی بوو. لەوە دەترسا کاریگەری دانانەکەی بە توندی زیانبار بێت. بینینی تێگەیشتنی ناتەواوی هزرەکانی، ئازاری دەدا. دەیگوت: "لەوانەیە تەنیا دانەیەك کە دایدەچێنم، زمانێکی یاجوج ماجوج بێت". ئەو زۆر ڕقی لە ژیانی زانکۆیی و ئەکادمیك دەبووەوە. هەستی بە پێویستییەکی زۆر بە ژیان لە تەنیاییدا کە لەودا ڕەنگە بە ڕێکەوت دۆستێك بدۆزێتەوە و ئەو توانایەی کەماویە (ئەو بە درێژایی چەند ساڵ نەخۆشحاڵ بوو) لە تەواوکردنی کتێبی "توێژینەوەکان"دا کەڵکی لیٚ وەرگرێت، دەکرد.

ڤیتگنشتاین سەرەنجام کورسی مامۆستایی لە ساڵی 1947دا بەجێهێشت ژیانی پەراوێزنشینی، سەرەتا لە ناحیە گوندنشینەکانی ئیرلەند نیزیك دوبلین و پاشان، لە کوخێکی دوورخراوە هەڵکەوتوو لە قەراخەکانی ڕۆژئاوایی ئیرلەند، دەست پێکرد. تا ئەو جێگای باری تەندروستی مەجالی پیٚ دەدا کاری دەکرد. لە هاوینی ساڵی 1949دا چوو بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان و سیٚ مانگی لەویٚ لای دۆستێکیدا تێپەڕاند. پاش ئەوەی کە لە پاییزدا گەڕایەوە بۆ بریتانیا، دەرکەوت کە سەرەتانی هەیە. بەشێك لە ساڵی 1950ی بە چاوپێکەوتنی بنەماڵەکەی بەسەربرد. بە دوای ئەودا، چوو بۆ ئاکسفۆرد تا لای دۆستێکیدا بمێنێتەوە و پاشان گەشتێکی کرد بۆ نەرویج لە ساڵی 1951دا جێی گواستەوە بۆ ماڵی پزیشکی دەرمانکەری لە کیمبریج ڤیتگنشتاین پێی خۆش

نەبوو ئاخرین ڕۆژەکانی ژیانی لە خەستەخانەدا بەسەر بەرێت، پزیشکەکەی بانگهێشتی کرد بۆ ماڵەکەی خۆی، تا لەوێ ماڵاوایی لە ژیان بکات و ئەویش زۆر سوپاسی ئەم بانگهێشتەی دکتۆرەکەی کرد. بەو حاڵەی کە دەیزانی مردنی نزیکە، بە تەواوەتی کاری دەکرد. ئەو هزرە فەلسەفیانەی کە لەم ماوەیەدا لە دەفتەرچە یادداشتێکدا دەینووسی، لە بەرزترین ئاستی خۆیدا بوو.

لە 27ی ئاڤریلدا نەخۆشییەکەی تەشەنەی سەند. کاتێك پزیشکەکەی پێی وت کە کاتی مردنی گەیشتووە، گوتی: "چ باش!"، ئاخرین وشەگەلێك پێش لەوەی هۆش و هەستی لە دەست بدات، ئەوها بوو: "بەوان بڵێ کە ژیانێکی زۆر باشم بوو". ڤیتگنشتاین لە 29ی ئاڤریلی ساڵی 1951 گیانی لە دەستدا.

## سەرچاوە

کتێبی ویتگنشتاین و تشبیە نفس بە چشم
بەشی شرح احوال و ارای ویتگشتاین،
لا پەڕەی 1-11.

# ڕێچکەی تاکگەرایی بەریتانی و دەستەجەمعی فەرەنسی

د. معین خەلیل ئەلعومەر
لە عەرەبییەوە: عومەر عەلی

**یەکەم ) ڕێچکەی تاکگەرایی بەریتانی:**

پاڵپشتیکردنی ئەم ڕێبازە فیکرییە لەلایەن ئاینزای پرۆتستانتی مەسیحییەوە بووە، کە لە کۆمەڵگای بەریتانیدا بووە. ئەم ڕێچکە فیکرییە پێیوایە بەرژەوەندییەکانی تاك، لە سەروو هەموو ڕەچاوکردنێکەوەیە (اعتبار) و سەرجەم بەهاو ماف و ئەرکەکان لە تاکەکانەوە سەرچاوەی گرتووە. بەرژەوەندییەکانی تاك نابێت ملکەچبکات بۆ حکومەتو کۆمەڵگاو سانسۆری لەسەر دابنرێت.

بەشێوەیەکی بنەڕەتی ئەم ڕێچکەیە پشتدەبەستێت بە قوتابخانەی پراگماتی سنوربەند (المدرسة المنفعە الحدية)، کە بڕوای بە پرەنسیپەکانی چێژ و ئازار (اللذة و الالم) هەیە، یا پرەنسیپی چێژ (مبدأ المتعە) (*Hedonism*) کە فەیلەسوفی ئینگلیزی (جیرمی بنتام) بنەمای بیروبۆچونەکانی داڕشت. سودەکانی ئەم ڕێچکەیە بریتییە لەوەی کە تاك هەمیشە هەوڵدەدات بۆ بەدەستهێنانی بەشێکی گەورە لە چێژ (*pleasure*)، بەرابەر کەمترین بەش لە قوربانیدان یا ئازار چەشتن (*Pain*). کەواتە ئەمە پرەنسیپێکی دەرونییە، هەروەها تاك هەمیشە بە گوێرەی ئەم پرەنسیپە دەرونییە هەڵسوکەوت دەکات. بۆ نمونە ئەگەر تاکێك کرێکار بوو ئەوا هەوڵدەدات بۆ بەدەستهێنانی کرێیەك لە بەرابەر کەمترین هەوڵدان و هیلاك بوون، بەڵام ئەگەر تاك خاوەن کاربوو هەوڵی بە دەستهێنانی گەورەترین قازانج دەدات لە بەرابەر کەمترین بڕ لە خەرجی و تێچوون لە بەرهەمهێناندا، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر تاك بەکاربەربوو هەوڵدەدات بە کەمترین نرخ پێکهاتەیەکی تایبەت لە شمەك بەدەستبهێنێت یا گەورەترین تێربوون لە پێداویستیەکانیدا بەدەستبهێنێت.

"جێرمی بنتام"، بڕوای وایە کە هۆکارێکی تایبەت هەیە بەرپرسیارە لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری

تاك لەناو كۆمەڵگادا، ئەم هۆكارانە یا ئەو هێزەی دەستەلاَتی كێشاوە بەسەر هەموو تاكێكدا و پاڵی پێوە دەنێت بۆ كار و جوڵە بریتییە لە هێزی چێژ و ئازار، بە تایبەتی دەڵێت (سروشت مرۆڤی نەژێر كۆنترۆڵ و حوكمی دوو سەرداردا داناوە: چێژ و ئازار.

ئەم دوو سەرداره ئەوەمان بۆ دیاری دەكەن كە چی پێویستە بكرێت و چی پێویستە بیكەین، چی پێویستە دوایخەین و دواتر بیكەین. ئەمانە حوكمان دەكەن و ئاراستەمان دەكەن بە هەموو ئەوانەی دەیلێین و بەهەموو ئەوانەی بیری لێدەكەینەوە و هەموو ئەوانەی دەیكەن. هەموو هەوڵێك پێیهەڵدەستین بۆ دەستبەرداربونمان لێیان، هیچ نییە جگە لەوەی ئامرازێكە بۆ چەسپاندنی كۆنترۆڵییان بەسەرماندا.

خۆشەویستی مرۆڤ بۆ چێژ و ڕكلێبوونەوەی بۆ ئازار ئەو تەنها هۆكارانەن كە پاڵدەنێت بە مرۆڤەوە بۆ هەستان بە ڕەفتاری جیاجیا كە ناچارە پێیان و مرۆڤیش بەپێی مەزندەی خۆی ماف هەریەكەیان دەدات و دەكەوێتە پێوانەی بڕی هەریەكەیان و پاشان بە یەكیان بەراوردەكات بەمجۆرە یەكێكیان دەستنیشان دەكات، كە بگەڕێتەوە بۆ ئەوی تر پاشان دوای ئەوە بڕیار ئەدات چی پێویستە بیكات وە چۆن ڕەفتار بكات. دوای ئەو بەراوردەی مرۆڤ لە نێوان هەریەك لە چێژ و ئازاردا دەیكات، هەڵسوكەوتی سەركەوتوو دەبێت.

"جێرمی بنسام" ئەوەش زیاد دەكات و دەڵێت كۆمەڵگا هەمیشە پێكدێت لە ژمارەیەكی گەورە لە تاكەكان كە ڕەفتار دەكەن، بەلاَم پێویستە ڕەفتارەكانیان پابەند بێت بە بەراوردكردنی چێژ و ئازار بۆ كۆمەڵێك لە تاكەكانی كە پێكهاتووە لەوان.

ئەتوانین فەلسەفەكەی "بنسام" دەربارەی پڕەنسیپەكانی چێژ و ئازار كورت بكەینەوە لەم سێ خاڵەی خوارەوەدا:

1-هەموو ئەو شتانەی كە تاك گەرەكیەتی لەم ژیانەدا، بریتییە لە بەدەستهێنانی گەورەترین بەش لە بەختەوەری و كەمترین بەش لە ئازار بە گوێرەی توانا.

2-ئامانجی ڕەفتاری نموونەیی زیادكردنی چێژو كەمكردنەوەی ئازارە، پێویستە ئەم پڕەنسیپە جڵەوی تاك بكات لە بڕیاردان و هەڵبژاردن و هەڵسوكەوتیدا.

3-پێویستە دروستبوون و پێكهاتنی دامەزراوەكانمان و ئەنستیۆتە كۆمەلاَیەتی و ئابوریەكانمان و یاساكانمان و پەیوەندییەكانی نێوان تاكەكانی كۆمەڵگا، هەموویان ڕێكخراو بنیاتنراوبن لەسەر بنەڕەتی بەرژەوەندییە ئاڵوگۆڕەكانی نێوان تاكەكانی بەو شێوەیەی گەورەترین بڕ لە بەختەوەری بۆ گەورەترین ژمارە لە تاكەكانی كۆمەڵگا دەستەبەر كرابێت.

لە كاتێكدا تاك بە دوای بەرژەوەندییە تایبەتییەكانیدا دەگەڕێت و كاری بۆ دەكات، هەر دەبێت بەراوردێك بكات لە نێوان ئەو چێژەی كەلێوەی دەستی دەكەوێت و ئەو ئازار و قوربانییەی كە ڕووبەڕووی دەبێتەوە، دوای بەراوردكردن لە نێوان ئەمانەدا تاك ئەتوانێت بڕیاری خۆی بدات لەسەر بنەمای بەرژەوەندی تایبەتی، یان بەلانی كەمەوە ئەو قوربانیەیی كە دەیدات یەكسان بێت لەگەڵ ئەو چێژەی لێوەی دەستیدەكەوێت.

پێشەنگی دووەمی ڕێچكەی پراگماتی (المذهب المتفعة) "دیڤد ریكاردۆ" (1772-1835)یە، كە بیرۆكەی پراگماتی لە ڕێگەی ئەو

وتەیەیدا دەردەکەوێت (کۆمەڵگا دابەشدەبێت بەسەر سێ چین و توێژی سەرەکیدا، ئەوانەی کەلەسەر شانۆی ئابووری کاردەکەن بریتین لە سەرمایەدارەکان و کرێکارەکان و خاوەن زەوییەکان).

سەرمایەدارەکان – ئەوانەن کە بەرهەمهێنانی شمەك و خزمەتگوزاریەکان بەڕێوەدەبەن و ڕۆڵێکی سەرەکییان هەیە لە ئابوریدا، زەوی لە خاوەن زەوییەکان بەکرێ دەگرن و کرێکاری بە دەزگای وەبەرهێنانەوە بۆ ئامادەدەکەن و خواردن و جلوبەرگ و شمەکەکانی تریان بۆ دابیندەکەن، کرێی تایبەتیان بۆ دابیندەکەن لە بەرابەری ئەو کارەی دەیکەن لە بەرهەمهێنانداا.

"ریکاردۆ" پێیوایە (سەرمایەدارەکان هەڵدەستن بە دوو ئەرکی گرنگ ئەوانیش: بەهۆی گەڕانی بەردەوامییان بەدوای هەلێکدا بۆ ئەوەی سەرمایەکانیان بخەنە گەڕ بۆ بەدەستهێنانی قازانج، دەکەونە ژێر کاریگەری کێبڕکێ، بۆ ئەوەی هاوسەنگییەك ڕابگرن لە نێوان دەرئەنجامی قازانجی سەرمایەکانیان کە لە بەرهەمهێنانی پیشەسازی و بەرهەمهێنانی کشتوکاڵیدا دەستیان دەکەوێت و دەبێتە هۆی ئەوەی لە کاتێکی دیاریکراودا داهاتێکی زۆر کۆبکەنەوە، لە تەواوی کارکردنیان لەماوەیەکی دیاریکراودا پاشان ئەرکی دووەم لە گرنگترە لە یەکەم سەرمایەدارەکان ئەوانەن لە پرۆسەی گەشەسەندنی ئابوریدا دەست پێشخەرن و داهاتێکی تازەیان دەبێت ئەمەش دەبێتە هۆی زیادکردنی سەرمایە).

پێشەنگی سێیەمی ئەم ڕێچکەیە (جۆن ستیوارت میل)، (1806–1873)ە، ڕیسای بەرژەوەندی تایبەت و ڕێسای کێبڕکێی ئازادی دیاریکرد.

## دووەم/ ڕێچکەی دەستەجەمعی فەڕەنسی:

ئەم ڕێچکە فیکرییە لەلایەن ئاینزای کاسۆلیکی مەسیحییەوە پشتیوانیکرا کە لە کۆمەڵگای فەڕەنسیدا بلاوە ئەم ڕێچکەیە بڕوای وایە دەبێ دەوڵەت و کۆمەڵگا کۆنترۆڵی تەواوەتی سەرجەم ئامڕازەکانی بەرهەمهێنانی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان بکەن.

ئەم ڕێچکەیە پشتدەبەستێت بە فیکری پۆزەتیڤستی (لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا)، بزاوتی پۆزەتیڤستی خۆی لە خۆیدا بزوتنەوەیەکە بۆ پشتگیریکردنی زانست و نەیاری میتافیزیکای تەقلیدیە و پشتگیری ژێربێژی ئەزمونگەری (المنطق التجربي) دەکات، بۆ گەیشتن بە یاسایەك کە واقع و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان ملی بۆ کەچکەن و ئەمەش تەنها کۆکردنەوەی زانیاری نییە دەربارەی دیاردە، بەڵکو نکوڵی لە بونی دوا مەعریفە (هەر مەعریفەیەك ئەزموون تێپەڕێنێت) دەکات، بێجگە لەوەی پەیوەستە بە کۆتاییەوە. پۆزەتیڤزم لەمانا فراوانەکەیدا بریتییە لە جەختکردنەوە لەسەر واقیعێکی زانستی و دژی تێڕامانی تیۆری میتافیزیکییە.

بزاوتی پۆزەتیڤیستی بانگەشەی ئەوە دەکات عەقڵ حوکمی جیهان بکات، لێکۆڵینەوە لە گەشەسەندنی عەقڵی پێ بەس بوو، هەوڵیئەدا بۆ گەیشتن بە یەکێتی فیکر و بۆ چەسپاندنی تەندروستی نموونەی باڵا، لە واقیعدا بزاوتی پۆزەتیڤستی دەیویست دەرچێت لە واقیعێك کە پڕە لە جیاوازی و دژەکان، لە پێناوی گەیشتن بە داڕشتنەوەی یاساکان، ئەمەش بەو مانایەی کە بڕۆیت بۆ گەڕان بە دوای واقیعێکی کۆمەڵایەتی کە مرۆۃ سودمەندبێت لێی، بۆ ئەوەی کاربکات بۆ

چاککردنی ڕەوشە کۆمەڵایەتییەکانی بە ئامانجی گەیشتن بە ڕێسایەکی چەسپیوو. کەواتە ئەم بزاوتە نەیاری حەقیقەتە ڕێژەیەکان و بڕیاردانە بەهاییەکانە لەسەر وابەستەبونە تاکیەکان و تێڕوانینە دیاریکراوەکان وەستاوە و دەیەوێت ژیانی تاك و چارەنوسی کۆمەڵگا بەگوێرەی ئەو یاسایانە بێت کە بەویستی خۆیان دایدەڕێژن.

ئەگەر بمانەوێت لە چۆنیەتی سەرهەڵدانی پۆزەتیڤستی کۆمەڵایەتی لە گۆڕەپانی فیکری فەرەنسیدا تێبگەین، ئەم بیرۆکەیە لە دوای شۆڕشی فەرەنسی لە ساڵی 1789 لە دەرئەنجامی ڕەوشی کۆمەڵایەتی سەریهەڵدا:

1-ململانێیەکی توند لە نێوان چینی ئۆرستوکرات و چینی ناوەراستدا.

2-نەبوونی تێڕوانینێکی تازە لەلایەن هەریەك لەم دوو چینە بۆ ڕونکردنەوەی چۆنیەتی جێگیربوون و چەسپاندنی کۆمەڵگای فەرەنسی.

3-هەریەك لەو دوو چینە خوازیاری گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی بوون بۆ کۆمەڵگای فەرەنسی و ئەلتەرناتیڤێك بۆ نەخشەی کۆمەڵایەتی.

4-بەکارهێنانی تاجی فەرەنسی و نەریتە ئاینیەکان لەلایەن چینی ئۆرستۆکراتەوە وەك سەرچاوەیەك بۆ پاڵپشتیکردنی و شەرعیەت دان بە دەستەڵاتیان.

5-دەرکەوتنی تەوژمی زانستی و تێکۆشانی بۆ بەدەستهێنانی شوێنێکی پرشنگدار لە کۆمەڵگای فەرەنسیدا.

6-دەرکەوتنی تیۆرەی پراگماتی لە ئابوری و ڕامیاریدا لە بەریتانیا و بانگەشەکردنی بۆ تێرکردنی پێداویستیە تایبەتیەکانی تاك و هاندانیان بۆ کێبڕکێی ئازاد لە نێوان تاکەکاندا.

سەرجەم ئەم ڕەوشە کۆمەڵایەتیانە بوونە هۆی دەرکەوتنی بزوتنەوەیەکی فیکری تازە (پۆزەتیڤیزم)، بۆ پێشکەشکردنی فیکرێکی تازە بۆ خزمەتکردنی پێداویستیەکانی ئەو قۆناغە نوێیەی کە فەرەنسا تیایدا دەژیاو بە تایبەتی چینی ناوەڕاست بۆ بەرەنگاری لە ئاست ململانێی کۆمەڵایەتی و فیکریەکاندا.

### سەرچاوە

ثنائيات علم الاجتماع، د. معن خليل العمر، عمان: دار الشروق، 2001، ص 127-130.

# چیرۆکەکانی تەلەفزیۆن
# چۆنیەتی و راستی وتن

جۆن مێغم

لە ئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف

لەم ڕۆژانەدا مشتومڕێك لە بریتانیا لە ئارادایە دەربارەی داهاتووی پەخشی تەلەفزیۆنی ئەم مشتومڕە کێشەکانی سیاسەتی پەخشکردن و ئەو پێشنیازە نوێیانەی کە بۆ ڕێکخستنی دانرابوون و مەسەلەکانی دارایی هەڵیگیرساند. زۆر کەس ئەم پێشنیازانەی بە هەڕەشە لە جۆر و ئاستی بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان دادەنا. ئەم پێشنیازانە زەمینەی خۆشکرد بۆ بیرۆکەی هەڵسەنگاندنی چۆنیەتی و رەخنەگرانی حکوومەت، لە ژێر دروشمی بەرگریکردن لە تەلەفزیۆنی جۆری باش کۆبوونەوە، بەڵام بەسەرسامی و شەرمەزارییەوە بۆیان دەرکەوت کە هیچیان پێنەبوو بیڵێن و ئەگەر بەرەو روو ببنەوە نەیاندەزانی بەرگری لەچی بکەن، چونکە کاتێك کە پرسیار کرا: "باشە چۆنیەتی *Quality* چییە و چۆن پێناسە دەکرێت و چۆن دەخەملێنرێت بۆیان دەرکەوت کە وەڵامدانەوەی ئەم پرسە زۆر ستەمە، ئەگەر مرۆۋ نەزانێت خۆی چی دەگەیەنێت، ئەوا زۆر ستەمە پێشنیازی جێگر بۆ ڕێکخستنی تەلەفزیون و بڕیاردان لەسەر سیاسەتی دارایی بۆ زیادکردن، یان زیادکردن یان مانەوەی بوودجەی تەرخانکراو وەکو خۆی بۆ تەلەفزیۆنی جۆری باش.

لەوە دەچێت، ئەمەش کارێکی نائاساییە، کە فەلسەفە بتوانێت شتێکی بەسوود لەم بارەیەوە بڵێت، لە ڕێگەی رامان و شیکردنەوەی چەمکی چۆنیەتی. بەڵام لەوە ناچێت کە فەلسەفە لێرەدا زۆر بەسوود بێت چونکە شیکردنەوەکانی یەکسەر بەرەو کێشەمان ببات، یان تەنانەت بەرەو پشتگیریکردنی پێشنیازەکانی حکوومەت.

بەکورتی، مشتومڕەکان بەم شێوەیەن، زۆر فەیلەسووف، بە خۆشمەوە، لەو باوەڕەدان کە چۆنیەتی ئەگەرێکی پێشبینینەکراوە *Contingent*. ئێمە ناتوانین بە هیوای ئەوەبین کە دەستنیشانی چۆنیەتی بەزاراوەی بەهاکانی راستییەکی گەردوونی، هەتا هەتایی، گەوهەری بکەین،

چۆنیەتی سیفەتێکی بابەتی نییە، بەڵکو شتێکە پابەندە بە بەهاو مەبەستە گۆڕاوەکان بە گشتی وەڵامی پرسیاری ئەوەی ئایا چۆنیەتی بەرنامەیەکی تەلەفزیۆن، یان کتێبێك، یان یارییەکی دووگۆڵی بەرزە یان نزمە کاتێك دەدرێتەوە کە باسی مەبەستیان لە ژیانی خەڵکیدا بکەین. چۆنیەتی بەرنامەکان لە ئاسمانەوە نابارێن بەسەر ئەوانەی کە لە ژێرەوەین، بەڵکو لە بەهاو مەبەستەکانی ئەوانەوە گەشە دەکات، وەکو چۆن چۆنیەتی چەقۆیەك پابەندە بەو مەبەستەی کە بۆی دانراوە: ئایا وەکو دیکۆرێك دادەنرێت، یان بۆ نەشتەرگەری بەکاردێت، یان بۆ بڕینی نان، یان بۆ سەربڕینی بزنێك بە نەریتێکی ئایینی. بەهەمان شێوە چۆنیەتی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن پابەندە بەو بەهاو مەبەستانەی کە خزمەتی دەکەن. ئەم سوود و بەهایانە هەمە جۆرن. بەهاکان لەلایەن تاکەکانەوە بڕیاریان لەسەر دەدرێت، بەڵام بۆ سوودەکان، بەڕاستی تەلەفزیۆن مەبەستی زۆری هەیە — لەوانە: بۆ بەخشینی خۆشی و رابواردن بە کۆمەڵانی خەڵك، بۆ رێکخستنی ڕیزەکانی گەل، بۆ چەواشەکردنی هاووڵاتیان، بۆ خواپەرستی، بۆ ڕاکێشانی خەڵك بۆ ئاگاداری و ریکلام.

بەداخەوە، لە کردەوەدا، راستیی ئەوەی کە چۆنیەتی ئەگەرێکی لەپڕ و چاوەڕواننەکراوە کاریگەرییەکی خراپی هەیە بەسەر ئەوانەوە کە پشتگیریی تەلەفزیۆنی جۆری باش دەکەن، چونکە هەستدەکەن کە کەوتوونەتە داوی کێشەیەکی ئازاربەخشەوە و لە بەرامبەریدا بێدەسەڵاتن لەوە دەچێت کە ناچارکرابن لە نێو دوو بیرۆکەدا یەکێکیان هەڵبژێرن و هیچیان بەدڵ نەبێت.

لەلایەکەوە، وەکو دەڵێن، ئەگەر چۆنیەتی پشت بە بەهاو مەبەستەکان ببەستێت، کە بنەمایەکی بابەتییانەی نییە، ئەوسا هەڕەمەکی و دەستەبژێرانە و باوکسالارانە دەبێت و دەبێتە هەوڵێك بۆ سەپاندنی بیرۆکەیەکی تایبەتی چۆنیەتی بەسەر بینەرانی تەلەفزیۆندا، ئەمەش جۆرێکە لە سەپاندنی حەزو چێژی کەسیی هەندێك لە رۆشنبیرانی چینی ناوەڕاست، کە هیچ گرنگتر نییە لە چێژ و حەزی هیچ کەسێکی تر.

لەم حاڵەتەدا، مرۆڤ دەچێتە سەر ڕای (رۆبەت مێردۆك) کە لە لێدوانەکەی ساڵی 1989دا لە (ئەدنبرە) دەڵێت: "ئەوەی لای کەسێك جۆرێکی پەسەندە، لای یەکێکی تر هیچ و پووچ و خاشاکە". ئەمە وتەیەکی ئابووری زۆر ڕێژەییە. چۆنیەتی ئەو شتەیە کە خەڵك ئامادەن پارەی پێ بدەن، هیچ پێوەرێکی دیکە بێجگە لە پێوەری بازار نییە. بێجگە لە بەهای قازانج و زیان، هیچ بەهایەکی چێژوەرگرتن لە ئارادا نییە. چۆنیەتی دیموکراتییانە بەڕێوە دەچێت، ئەگەر ئەنجامەکەشی ئەوەبوو ئەو بەرنامانە باوبن کە چێژی رۆشنبیران و دامەزراوەکان دەڕووشێنێت، ئەوە باشتر، چونکە ئەو کەسانە خۆیان زۆر بە گرنگ دادەنێن.

لەلایەکی دیکەوە، ئەگەر ئەو بەرنامانەی کە بۆ بازاریکردن ئامادە دەکرێن قێزەوندبن، ئەوسا دەبێت واز لە مەسەلەی ئەگەری چۆنیەتی بهێنین و لەبری ئەوە پشت ببەستین بە راپرسی لە رۆشنبیران سەبارەت بەوەی کە چۆنیەتی بەچی دەزانن. ئەوانەی زۆر رۆشنبیرن بەڵام ناتوانن بە باشی پێناسەی چۆنیەتی بکەن و سیفەتەکانی بژمێرن لەوانە لە کاتی بینینیدا بتوانن دەستنیشانی بکەن — ئەوان دەڵێن کە جۆری دراما و ئۆپێراو شانۆگەرییەکانی شەکسپیر کە ***BBC*** بلاٌویاندەکاتەوە بەو فەرهەنگی بەرز ***High culture***، دادەنرێن.

ئەم چۆنیەتییە *quality* دەبێت لەلایەن لێزانەکانەوە بسەپێنرێت. ئەمە بیرۆکەی باستانی (تەقلیدی) دەزگا گشتییەکانی بلاوکردنەوەیە لە بریتانیاداو هەمیشە پەیوەندیی هەیە بە ناوی (لۆرد رەیس *Lord Reith*)ەوە. لەم بۆچوونەدا چۆنیەتی دەبەسترێتەوە بە مەبەستی فێرکردن، پەروەردەکردن و خۆشرابواردنەوە لە چوارچێوەی ئەو بەهایانەی کە لە کۆنەوە بە فەرهەنگی پەسەندکراو دادەنرێن و لە پێش هاتنەکایەی تەلەفزیۆنەوە، لە هونەرو گفتوگۆکاندا بە "فەرهەنگی بەرز" دادەنرێن. ئامانجیش پاراستنی بەهاو واتاکانی چینی رۆشنبیری دەستەبژێرە کە خۆی بە بەرپرسیار دادەنێت لە پێگەیاندنی بەشەکانی دیکەی کۆمەڵگا لە رێگەی بلاوکردنەوەوە.

گفتوگۆ لە بارەی چۆنیەتییەوە لەسەر دوو بیرۆکە — بیرۆکەی میللی و بیرۆکەی خانەدانەکان— گەیشتە بنبەست، وەك ئەوەی ئەم بیرۆکانە *concepts* یان لێکدانیان تەنها ئەلتەرنەتیڤ بن. لە راستیدا پێشنیازەکانی حکوومەت تێکەڵکردنی ئەم دوو بۆچوونەبوو. ئەمەش وایکرد کە بەرهەمەکانی تەلەفزیۆن، کە بە پێی بازاڕ بەرهەمدەهێنرێن، پابەندی پێوەری چۆنیەتی نەبن بەڵکو هی سوود، کەچی لەلایەکی دیکەوە داوایان لە کۆمپانیەکانی تەلەفزیۆن دەکرد کە رەچاوی هەندێك "بەرنامەی ماقووڵ" بۆ پەیرەوکردنی پێوەری چۆنیەتی لە بەرهەمەکانیاندا. با بەرهەمەکان بەپێی داخوازی بازار دانراون هیچ و پووچ بن (بێجگە لە مەسەلەی سێکس و توندوتیژی کە بە جیا لێیان دەکۆڵینەوە)، ئەمە گرنگ نییە بە مەرجێك لەناو شاردا ناوچەیەکی رووناکی فەرهەنگی بەرز وەکو مۆزەخانەیەك پارێزراو بێت و لەناو ئەم خاشاك و نەهامەتییەوە ئیلهامبەخشانە بدرەوشێتەوە و کاتێك کە باس دێتە سەر بەرهەمی جۆری بەرز ئەم فەرهەنگە بپارێزرێت و پێمان دەوترێت کە پێویست ناکات پێناسە یان راڤەی بکەین.

تەنها پێویستمان بە چاودێرێکی شارستانی هەیە، چونکە ئەو بەشێوەیەکی سروشتی نیشانە ناسراوەکانی بەرهەمی باش دەناسێتەوە کاتێك کە سەیری دەکات. چۆنیەتی وەکو شتێك سەیر دەکرێت کە لە فەرهەنگی باستانی (تەقلیدی)یەوە هاتبێت، وەکو کۆمەڵە کارێکی پەسەندکراو کە شێوەی جوانناسی و مانای فەرهەنگی هەبێت، جۆرێك کە، بەپێی (ماسیو ئارنۆڵد): (باشترین جۆر کە ناسراوبێت و بیری لێکرابێتەوە)، دەتوانین لەوەش دڵنیابین کە (بەرپرسە گەورەکان *Mandarins*) بۆمانی دەناسنەوە. بەلاّم لە کردەوەدا، ئەو نموونەیەی کە مەبەستە هەر ئەو "تەلەفزیۆنە چرکراوە" بێت کە بەهۆی چەند برگەیەکی بایەخدارەوە رێگەی لێدەگیردرێت (بەلاّم هەتا ئەو رادەیە نا کە بە تەواوی هەڕەشە لە دەستکەوتەکانی بکات) وەکو ئوپیرای بۆنەکان یان شانۆگەری *Brideshead Revisited* و ئەو رۆژنامە بچووکە چرکراوانەی کە لاپەڕەیەکیان تەرخانکراوە بۆ ئەو شتەی کە پێی دەڵێن "کەلەپووری نەتەوەییمان".

بەمجۆرە دەکەوینە ناو کێشەیەکەوە — یان دەبێت تەلەفزیۆنە چرکراوەکەی (مردۆك و رەیس) هەڵبژێرین، یان یاسای باوکانەی "فەرهەنگی بەرز"، یان تێکەلاّوکردنی هەردوکیان. بۆ ئەوەی خۆمان لەم کێشەیە لابدەین دەبێت ئەوەمان لە بیربێت کە ئەگەرچی مەسەلەی چۆنیەتی ئەگەرێکی پێشبینینەکراوە، بەلاّم هەرەمەکی و مەسەلەی چێژ نییە.

چەمکی چۆنیەتی لە تەلەفزیۆندا هەمیشە بەستراوەتەوە بەپرۆژەرامیاریو کۆمەلاّیەتیەکانەوە.

بە واتایەکی تر، مەسەلەی پێشبینینەکراوی چۆنیەتی دوا هێڵ نییە کە لە دوای ئەوەوە هەموو مشتومڕێکی عەقڵانی دەوەستێت، بەڵکو خاڵی سەرەتایە بۆ بەرەنگاربوونەوە یان بەرگریکردن لە چەمکێکی تایبەتی چۆنیەتی بە پشتبەستن بەو پرۆژە کۆمەڵایەتییانە و بەهاو ئامانجە فەرهەنگییانەی کە تەلەفزیۆن دەتوانێت تیایاندا خزمەت بکات.

ئێمە ناتوانین زاراوەی بەهاو پێوەرەکانی گەردوونیی دەرەوەی کات پێناسەی چۆنیەتی بکەین، بەڵام هەڵکەوتێکی دیارینەکراویش نییە.

ئەزموونی تەلەفزیۆنی چاك بە هەوەسی تاکە کەسی پاکانەی بۆ ناکرێت، بەڵکو بە زاراوەی ئەوەی تەلەفزیۆن بۆ چییە و ئامانجە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی چین و ئەو بەهایانە چین کە دەبێت خزمەتیان بگات، دەبێت بەپێی ئەوەش بپێوین. چەمکەکانی چۆنیەتی کاتێك بە کردەوە دەبووژێتەوە کە بخرێتە ناو ئامانج و مەبەستی فراوانترەوە. لە ئەنجامدا، هەڵبژاردنی ئەم چەمکە یان ئەوە لەبەر ئەوە دەبێت کە خزمەتی ئەو بەهاو ئامانجە بکات کە دەبێت بەڕێوەببات، بۆچوون لە بابەت ئەوەی کام سیستەمی کۆمەڵایەتی باشترە و بوار دەدات کە تاکەکان ژیانێکی تەندروست بژین و ئامانجەکانی ژیانیان بهێننە دی.

بە کورتی، چەمکی چۆنیەتی لە پەیوەندیدا لەگەڵ بەهاو مەبەستە کۆمەڵایەتی و پرۆژە رامیارییەکاندا چالاکتر دەبێت، چونکە ئەمانە وا دەکەن کەلایەنگرانی هەر چەمکێك لە هەڵسەنگاندنی تەلەفزیۆندا دەگەڕێنەوە بۆ چۆنیەتی بەشداری کردنی تەلەفزیۆن لە ژیانی تاکەکان و کۆمەڵگادا. تەلەفزیۆن لەم مەسەلانەی کە پەیوەستن بە بەهاو مەبەستەوە پێشبینینەکراوە، لەبەرئەوە هەتا هەتایە مشتومڕی لەسەر دەکرێت.

ئەو متمانەیە، تەنانەت ئەفیزەی، کە هەندێك چەمکی پێ پێشنیاز دەکرێت لە توندیی ئەو تاوانبارکردنەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئاراستەی ئەرکی تەلەفزیۆن دەکرێت لە چوارچێوەی پرۆژەیەکی سیاسی تایبەتدا. ئەوەی بناغەی ئەم بۆچوونە لە بارەی چۆنیەتییەوە فەراهەمدەکات روونیی مەبەست و ئەو بڕیارانەیە کە دراون لە بارەی بەشداریی تەلەفزیۆن لەم ئامانجانەدا. بڕوانە، بۆ نموونە، بینینی (مردۆك) (لە وتارەکەی شاری ئەدنبرەدا) لە بارەی ئەو شتەی کە ناوی دەنێت "بریتانیای نوێ"، کە وەکو دەڵێن، بەشێکە لەو شۆڕشە جیهانییەی سەربەستی ئابووری و خۆشگوزەرانی ئابووری دابیندەکات. لەم بریتانیا نوێیەدا، نە سۆشیالیزم و نەدامەزراوە کۆنەکانی بازار سنووردار ناکەن، لەم بینینە رامیارییە راستڕەوەدا، مردۆك پاساو دەهێنێتەوە بۆ هەموو پێشنیازەکانی لە بارەی تەلەفزیۆن و بازاڕی ئازاد و چەمکی چۆنیەتی. بە روونی لەو باوەڕەدایە کە ئەگەر مەسەلە هاتە چۆنیەتی هیچ حیسابێك بۆ چێژ (*taste*) ناکرێت و بە تەنها مەسەلەی قازانج و زیانی بازار لە ئارادایە.

لە راستیدا ئەو پرۆژانەی کە حکوومەت خستبوونیە روو بریتیبوون لە تێکەڵەی شێوانێکی نائارام و شپرزەییەکی دژوار کە تەمومژییەکی زۆری تێدابوو بەهۆی ئەوەی کە هەوڵێك بوو بۆ کۆکردنەوەی کۆمەڵێك بنەمای جیاواز لە پێشنیازێکی کردەییدا کە لە بنەڕەتدا دژبەیەك بوون. لەم پێشنیازانەدا بینەری تاك وەکو سێ شت سەیر دەکرا لە هەمان کاتدا: یەکەم، وەکو بەکارهێنەری تاکی کاڵاکانی رابواردنی بازاڕی

تەلەفزیۆن (کە ئاشکراکردنی مافی بەکارهێنانیش دەگرێتەوە)، دووەم، وەکو کەسێکی خێزاندار کە بەرپرسە لە تەندروستیی دەروونی و سێکسیی ئەو کەسانەی بەخێویان دەکات (ئەمەش پێوەرەکانی کۆمیتەی پێوەرەکانی بریتانیا ***british standards committee*** دەگرێتەوە)، سێیەم، وەکو هاوولاَتییەك کە میراتگری فەرهەنگێکی نەتەوەییە (ئەمەش بەشێك لە مەسەلەی "بابەتی بەرز" دەگرێتەوە.

من خۆم دژی هەردوو بۆچوونەکەم، بۆچوونی باوکانەی خزمەتگوزارییە گشتییەکان و چەمکی چۆنیەتییان و هەم چەمکی بازاڕی ئازاد لە بارەی چۆنیەتییەوە، چونکە من دژی ئەو بۆچوونە رامیاری و کۆمەلاَیەتییانەم کە لەسەری دامەزراون. من دژی دوانەییم، ئێمە ناچارنین کە هەڵبژاردن لە نێوان ئەم دوو چەمکەدا بکەین. بابیانگۆڕین بەشتێکی دیکە کە لە پرۆژەیەکی کۆمەلاَیەتیی جیاواز وەرگیرابێت و لەسەر دەستنیشانکردنی مەبەستی فەرهەنگی جیاواز و ئاکاری جیاواز دامەزرابێت.

لەبەرئەوە، ئەوەی من لەسەری بەردەوام دەبم و پشتگیریی دەکەم چەمکی چۆنیەتییەکی جیاوازە لەوەی کە ئێستا باوە، دەمەوێت ئەم چەمکە سەرکەوتووتر بێت لەوانیتر، ئەمەش لە رێی باسکردنی ئەو بەها ئاکارییانەی کە ئەم چەمکە خزمەتیاندەکات. چەمکی من لە بارەی چۆنیەتییەوە سێ پێکهاتەی هەیە: پرۆژەیەکی کۆمەلاَیەتی، مەبەستێکی فەرهەنگی و چوارچێوەیەکی پێوەری ئاکاری ***normative***.

## پرۆژە کۆمەلاَیەتییەکە

ئەرکە کۆمەلاَیەتی و فەرهەنگییەکانی تەلەفزیۆن دەبێت لەناو کۆمەڵگایەکی فەرهەنگ بلووراڵدا دەستنیشان بکرێت. من پێشنیازی چەمکێکی چۆنیەتی دەکەم لە کۆمەڵگادا کە ئەگەرەکانی فەرهەنگی پلووراليزم بپارێزرێت و بەرەو دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگای ببات. لەبەرئەوە نابێت رێبدرێت بەهیچ چەمکێك لەمەڕ سروشتی مرۆڤ کە لاقی جاویدانی لێدەدات یان پەڵپی ئەوە بگرێت کە راستیی تەواوی مێژووی مرۆڤە.

کێشەی چەمکی کۆنی خزمەتە گشتییەکان (***public services***) لە بارەی چۆنیەتییەوە لە نموونەی نموونەی خزمەتگوزارییەکانیدا نەبوو، بەڵکو لە بیری یەکپارچەیی (***Monolithic***) و نا دیموکراسییەی ئەو فەرهەنگە بوو کە لەسەری دامەزرابوو. سیستەمێکی پەسەندکراوی بلاَوکردنەوە دەبێت پابەندبێت بە یاسای هەمە جۆری ***rule of diversity***، دەبێت چالاکانە بەهای جیاواز و لێکدانەوەی جیاوازی کۆمەڵگای نوێ پێشکەشبکات. بەلاَم، ئەم هەمە جۆرییە، ئەگەرچی بەهایەکی پۆزەتیڤە، دەبێت لە لێکۆڵینەوەی ئەرکەکانی تەلەفزیۆندا دەوڵەمەند بکرێت و تێڕامانی دیکە هاوسەنگ بکرێت.

## مەبەستی فەرهەنگی

تەلەفزیۆن دەتوانێت ئەرکی جیاوازی هەبێت لە پرۆژەیەکی کۆمەلاَیەتیدا کە لە بنەڕەتدا دیموکراسی بێت. دەمەوێت تیشك بخەمە سەر مەبەستێکی تایبەتی تەلەفزیۆن کە بریتییە لە پێشکەشکردنی چیرۆکی بەسوودە، پێشنیازیشم هەیە لە بارەی گرنگیی مێژوویی ئەم مەبەستە فەرهەنگییە تایبەتە و گونجاویی تەلەفزیۆن وەکو هۆیەك بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە.

## چوارچێوەی پێوەری ئاکاری

پێشنیازی پەیڕەوکردنی ئاکاری وتنی ڕاستی لە تەلەفزیۆندا دەکەم لە بری بەهاکانی ئەو ئاکار گشتییەی کە پەیڕەوی دەکرێت، ئەمەش بکرێتە بناغە بۆ تەلەفزیۆنی باش. تەلەفزیۆنی جۆری بەرز ئەوەیە کە لەسەر بنەمای ڕاستگۆیی پێوانە بکرێت – کە بریتین لە یاسای هەمەجۆری و ئامانجی فەرهەنگی بۆ پێشکەشکردنی چیرۆکی بەسوود و وتنی ڕاستی.

## چیرۆکەکانی تەلەفزیۆن

لە بەشی داهاتووی باسەکەمدا دەمەوێت باسی چۆنیەتی بکەم لە چیرۆکەکانی تەلەفزیۆندا بن نامەوێت باسی هەواڵ و بەڵگەکان و کاروباری ڕۆژانە و بەشەکانی تەلەفزیۆن بکەم (ئەم وتارەم بۆ پەیمانگای فیلمسازی بریتانی نووسیوە، بابەتەکانی دیکە، نووسەری دیکە لێیان دەدوێن).

تەلەفزیۆن بۆ چییە؟ ئامانجە کۆمەڵایەتییەکانی چین؟ گومان لەوەدا نییە کە زۆرن: لێرەدا من جەخت لەسەر یەکێکیان دەکەم، ئەویش چیرۆکی بەسوودە. چیرۆکەکانی تەلەفزیۆن نابێت هەر بۆ ڕابواردن تەرخانبکرێن. ئەم چیرۆکانە گرنگییەکی فەرهەنگیی زۆریان هەیە و ماوە هەیە لەلایەن مەبەست و پێوەری ئاکارییەوە پێناسەی چۆنیەتی بۆ بکرێت.

بابەتەکانی تەلەفزیۆن زۆر جیاوازن و من هیچ هۆیەك بۆ سنووردارکردنیان نابینم لە چوارچێوەی مەبەست و ئەو یاسا ئاکارییانەی کە جۆرە شکۆیەکیان هەیە. چیرۆکەکان زنجیرەیەك لە گۆرانی و کلیپە ڤیدیوییەکان و دراما و شانۆگەرییە تەلەفزیونیەکان دەگرێتەوە. هەریەك لەم شێوانە چیرۆکێکی دروستکراو پێشکەشی بینەر دەکات و بەجۆری جیاواز سوود دەگەیەنن بەو شێوانەی کە باسیاندەکەم و بۆ هەڵسەنگاندنی هەر یەکێکیان پێشنیازی جیاواز لە بارەی سوود و ڕاستگۆییانەوە دەکەم. دیاریکردنی مەبەستە ماوە دراوەکانی تەلەفزیۆن لە ڕێگەی پەخشکردنی بابەتی کرچ و کاڵ و موتربەکردنیان بە "هەندێك" بابەتی "جۆری بەرز"ی چینی ناوەڕاست بەس نییە. ئەی بۆچی داوای بابەتی نایاب نەکەین لە هەموو چیرۆکەکانی تەلەفزیۆندا؟ داواکردنی بابەتی باش لە هەموو چیرۆکەکانی تەلەفزیۆندا زۆر سوودی کەسی و فەرهەنگیی هەیە کە هەوڵدەدەم دەستنیشانیان بکەم.

یەکێکیان ئەوەیە کە سوود دەگەیەنێت بە گەشەکردنی کەسایەتی تاك، هەروەها تێگەیشتنی کۆمەڵایەتی لە خود. بەگشتی، دەتوانم بڵێم کە چیرۆك شێوەیەکی لێکۆڵینەوەیە کە تیایدا مرۆڤ هەوڵدەدات وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە کە لە ماوەی ژیانیدا سەرهەڵدەدەن، پرسیاری وەکو: چیم بۆ دەشێت؟ دەتوانم ببم بە چی؟ چی ژیانم پێکدەهێنێت؟ چۆن دەتوانم شتەکان دەستەبەر بکەم؟ ئەگەر کەسێکی دیکە بم چۆن دەبم؟ خەڵکانی دیکە بۆچی بەم جۆرەن؟ دەتوانین هەوڵی بێکۆتایی بدەین بۆ وەڵامدانەوەی ئەم جۆرە پرسیارانە بۆ جیاکردنەوەی ڕاستی لە خەیاڵ، بۆ ئەوەی پەروەردەی ئارەزووەکانمان بکەین، بۆ ئەوەی جیاوازیی نێوان کەسەکان بەشێوەیەکی ڕاست بزانین و جیاوازییە گرنگەکانی نێوان حاڵەتەکان بزانین، هەروەها بۆ ئەوەی هەست و ئارەزووەکانمان دەرببڕین. ئەم پرسیارانە و ئەم توانا و بەهرانە بنەمایەکی گرنگن بۆ ناسینی خود و پێناسەکردنی بۆ هەڵسوکەوتکردنی گونجاو لەگەڵ خەڵکانی

**دیکەدا لەناو سیستەمێکی کۆمەڵایەتیدا. بە واتایەکی تر، بنەمایەکی بۆ ژیانێکی کۆمەڵایەتیی ئاسایی. مەبەستم لە چیرۆکی بەسوود ئەو چیرۆکانەن کە دەتوانین لە نەستماندا، نەك لە هەستماندا، سوودیان لێوەربگرین.**

**بێگومان، چیرۆك سوودی دیکەیشی هەیە — لەوانەیە بۆ کات بەسەربردن و خۆشی بێت، یان بۆ لادانی ئاگاییمان لە بارەی ژیانی راستەقینە، بۆ رەوانەوەی خەمەکانمان بەهاندانمان بۆ باوەڕکردن بە فەنتازیا و خەیاڵەکانمان، یان بۆ کۆکردنەوەی خەڵك لە دەوری بیرێکی سیاسی، یان ئەوەی بمانداتە دەست ئەوانەی ئاگاداری و ریکلام دروستدەکەن. بێگومان ئەم سوودانە مەرج نییە گاڵتەیان پێبکرێت و ئابڕووبەربن. هیچ بیرکردنەوەیەك لە بارەی چۆنیەتییەوە کە بەشێوەیەکی شاراوە یان بە ئاشکرا باسی هەندێك سوود یان مەبەست نەکات.**

**بەڵام، ئەو سوودانەی کە من جەخت لەسەریان دەکەم گرنگترن و لە پێشترن چونکە کار دەکەنە سەر هەندێك پرۆسەی گرنگ لە ژیانی تاکەکان و کۆمەڵگادا — ئەویش دانانی بناغەی ئاکاری و پێناسەی کەسی و هاووڵاتیبوون. چی لەمە گرنگترە؟ جەختکردنم لەسەر ئەم گرنگییە وەڵامێکە بۆ ئەو کەسانەی کە بەدگومانن یان بڕوایان ڕێژەیەتی هەیە و دەڵێن بەهاوچۆنیەتی هەڕەمەکین لەبەرئەوە ناتوانین بڕیاربدەین کامیان لە کامیان گرنگترە، ژیانی ئاکاری یان رابواردن، پێناسەی کەسایەتی یان سوود وەرگرتن، هاوڵاتیبوون یان سوودی تاکە کەسی، وەڵامە بۆ ئەوانەی کە لەو باوەڕەدان جەختکردن لەسەر پێشینەیی یەکەمیان بەسەر دووەمیاندا جۆرێکە لە باوکسالاری و دەستەبژێریێتی.**

**زۆر گرنگە سەرنج بۆ ئەوە رابکێشین کە هەرچەند رابواردن و خۆشی مەبەستی یاسایین بەڵام دەشێت ململانێ بکەن لەگەڵ مەبەستی دیکەدا، وەکو چیرۆکی بەسوود و وتنی راستییەکان. ئەگەر سیستەمێکی رێکخستن بۆ تەلەفزیون هەڵبژێرین بە کردەوە ئەوە هەڵدەبژێرین کام مەبەست دەبێت لە پێشەوە بێت. ئەگەر پێشینە بدرێتە رابواردن، کە بە باوەڕی من لەسەر نمونەی بازار دەبێت، ئەوسا مەبەستەکانی دیکە نەك هەر دەخرێنە دواوە بەڵکو نزمدەکرێنەوە بۆ ناوچەیەکی تایبەتکراو و ئینجا بنکۆڵ دەکرێن.**

**لاوازیی چەمکی چۆنیەتی لە بازاری ئازاددا بەهۆی دانپێدانەنانی ناحەزانەوەیە بەو ململانێیەی کە لە نێوان بەخشینی رابواردنێکی سوودبەخش و مەبەستەکانی دیکەدایە کە بینەری تەلەفزیون دەریدەبڕێت ئەگەر ماوەی بدرێتێ. ئەوەی پێشنیازیدەکەم ئەوەیە کە هەموومان بەردەوام لە هەوڵی ئەوەداین کەسایەتییەکی یەکگرتوو *integrated* دروستبێت بۆ ئەوەی بەشێوەیەك ژیانمان رێکبخەین کە لە چیرۆکەکانمان تێبگەین، بۆ ئەوەی هاوکاریی یەکتر بکەین لە گۆڕین و دروستکردنی کۆمەڵگایەکی یەکگرتوودا، چیرۆکیش لەم پرۆسەیەدا رۆڵێکی کاریگەر دەبینێت.**

**بێگومان، خۆشبەختانە، تەلەفزیۆن تەنها سەرچاوەمان نییە بۆ چیرۆك. چیرۆك لە زۆر شوێندا بڵاودەبێتەوە: لەناو خێزاندا و لە قوتابخانەکاندا چونکە سەرگزوشتە *anecdote* شێوەیەکە لە فێرکردنی فەرمی لە کتێب و گۆڤار و رۆژنامەو کەنیسە و رێکخراوە پیشەییەکاندا، بە گشتی لە هەموو دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا. ئابووریی گێڕانەوە لە کۆمەڵگادا ئێجگار ئاڵۆزە. لەوانەیە هەندێك بڵێن ئەوەی کە لە تەلەفزیۆن لەم**

بارەیەوە دەیكات زۆر گرنگ نییە، چونكە زۆر سەرچاوەی كاریگەری دیكە لە بەرامبەریدا هەن، لەبەرئەوە تەلەفزیۆنی جۆری نزم، یان ئەو تەلەفزیۆنە كە تەرخانكراوە بۆ چەمكێكی دیكەی چۆنیەتی بێزاركردنێكە دەشێت پشتگوێ بخرێت. بەڵام شتێك هەیە كە باوەو پشتگوێ ناخرێت، ئەویش ئەو كاتە زۆرەیە كە خەڵك لە بەردەم تەلەفزیۆندا دەیبەنە سەر. ئەمە وای لێدەكات كە بەهێزترین سەرچاوەی چیرۆك بێت. تەلەفزیۆن لەوانەیە كاریگەرترین مەڵبەندی رەنگدانەوەی كۆمەڵایەتی بێت، لەبەر ئەوە دەتوانێت خزمەتی ئەو مەبەستە كۆمەڵایەتییانە بكات كە دەمانەوێن، یان نامانەوێن، لەبەرئەوە سوود و زیانی دەشێت زۆرتر یان كەمتر بێت. هەر چەمكێك ئەم راستییە پشتگوێ بخات، چاوپۆشی لەو سوودانە دەكات كە لە تەلەفزیۆن بۆیان دانراوە.

چەمكی سوودبەخشینی چیرۆك بەشێوەی جیاواز و بەپێی ئەو شتە جیاوازانەی كە جەختی لەسەر دەكرێن پەرەیپێدەدرێت. نامەوێت راپۆرتێكی بێزاركەر لە بارەی سوودەكانی چیرۆكە پێشكەشبكەم بەڵكو چەند وێنەیەك پێشكەشدەكەم. دەمەوێت ئەوە بڵێم كە ئێمە، لەلایەنی مێژووییەوە، لە بارێكدابن كە چیرۆك، بەتایبەتی چیرۆكە ئەندێشەییەكانی تەلەفزیۆن، دابینكەری پێویستییەكانن. بە گەڕانەوە بۆ بنەما مادی و ناوەرۆكە مێژوویانەی ئەم پێویستییانە وامان لێدەكات باشتر لە چەمكی چیرۆكی بەسوود بگەین و باشتر دەستنیشانی بكەین.

یەكەم، راستییەكی بنچینەیی هەیە ئەویش ئەوەیە كە كۆمەڵگای مۆدێرن كۆمەڵگایەكی پلووراله و لە زۆر نەتەوەو ئایین و بۆچوونی سیاسی پێكهاتووە. یەك راستی و یەك كتێب و یەك گێڕانەوە ناتوانێت ببێتە چوارچێوەیەك بۆ گونجاندنی چیرۆكە بچووكەكانی كەسە تاكەكان. ئەوانەی ژیانیان تەرخانكردووە بۆ یەك كتێب و یەك گێڕانەوە لە كۆمەڵگایەكدا دەژین كە زۆربەی كەسانی دیكە لە خزمەت راستییەكی تردان، یان، لە زۆربەی حاڵەتەكاندا، هیچ راستییەكی مەزنیان لا نییە. بۆ ئەوەی بەرنامەیەك بۆ ژیانی خۆمان دابنێین و لە ژیانی كەسانی دیكە بگەین، كە زۆر جیاوازە لە هی ئێمە، دەبێت بە باشی لە سیستەمی گێڕانەوە بگەین. لەبەرئەوەی گێڕانەوەی مەزن جۆرە دەسەڵاتێكی هەیە دەتوانین هەر جۆرە گێڕانەوەیەكی بچووك (*Little narratives*) كە بەدەستمان دەگات بەكاربهێنین.

مەسەلە هەر ئەوە نییە كە بایەخ بە چیرۆكی خەڵكانی دیكە بدەین و رێزی لێبگرین، هەرچەند كە ئەمە زۆر گرنگە. هەر ئەوە نییە كە لەناو فەرهەنگێكدا دەق وەربگرین و لێبوردەییمان هەبێت بەرامبەر یەكتری. ئەوەی زۆر شپرزەماندەكات ئەوەیە كە خودی بوونمان (*becoming*) بریتییە لە زنجیرەیەك بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ ئەو پرسانەی كە هێشتا نەبڕاونەتەوە و چارەسەر نەكراون كە ئێستا لە دەمەكانی پێشووی مێژوو زیاتر، كاریگەرییان هەیە لەسەر هەموو رەهەندەكانی ژیانمان. دەتوانم بڵێم كە ژیانی زۆر كەس لە جیهانی پێشكەوتوودا پێشینە بۆی نەنووسراوەتەوە و دەقی وەرنەگرتووە لەبەرئەوە كراوەیە لەبەردەم شتی سەرپێی. ئێمە ژیانمان بە درێژەپێدانی دروستی دەكەین. هەندێك لایەنی تایبەتی ژیانمان، نەك هەمووی، دەشێت بنووسرێنەوە، ئەگەرچی تازە روویاندابێت. بۆ زۆر كەس پرسیاری "چیم بۆ دەشێت؟" زنجیرەیەك وەڵام هەڵدەگرێت و ئەگەرەكانی زیاد دەكەن. ژیان تەرخان نەكراوە بۆ یەك لادێ، یەك كار یان یەك

ئاستی خوێندەواری و سامان. خەڵك هەڵبژاردنی زیاتری لەبەردەمدایە: هەڵبژاردنی سێكس، پەیوەندی ژن و مێردی، پەروەردە، كار، شوێن، ئایین، فەرهەنگ و سیاسەت. ئەو گۆڕانكارییە قووڵانەی كە لە ژیانی خەڵكدا روویانداوەو ئێستا لە بیرمدا ئامادەن ئەوانەن كە لە دوای (1918)ەوە روویانداوەو روودەدەن، كە بریتییە لەگەشەكردنی زۆری پەروەردە لە قۆناغی ئامادەیی و زانكۆدا كە فێربوونی زمانە نووسراوەكان و پسپۆڕی تیایاندا مسۆگەر بوو و دەرگای كردەوە بۆ فەرهەنگ و كاری جیاواز بۆ رێژەیەكی زۆری خەڵك. بۆ نموونە، گۆڕان لە فەرهەنگ و سامان و تیكنولوجیا و.. هتد بووە هۆی ئەوەی كە ژنان كەمتر خۆیان بۆ كاروباری ناو ماڵ تەرخان بكەن لەوەی كە سەد ساڵ لەمەوپێش لە ئارادا بوو.

ئەو ئازادییانە و هەڵبژاردنانەی كە من باسیاندەكەم بە تەنها هەڵبژاردنی بە كارهێنەرێك نییە لەناو رەفەكانی سووپەرماركێتی ژیاندا. هەڵبژاردنی بوونمان (*becoming*) وەكو تاكێك كە پلان بۆ ژیانێك لەگەڵ كەسانی دیكەدا دادەنێت بەو جۆرە نییە، هەڵبژاردن و سەیركردنی چیرۆكەكانی تەلەفزیۆنیش بەو جۆرە نییە. چیرۆك هەر بۆ ئەوە نییە كە چێژی لێ وەربگرین، وەكو هەڵبژاردنی جۆری گەنمەشامی. خەڵك سەیری چیرۆك دەكەن بۆ ئەوەی زانیاریی لێ وەربگرن لە رێی بەدراماكردنی كێشەكان و چارەسەرییەكانیان و هەلو مەترسییەكانیان و چاكە و خراپەكانیان بۆ ئەوەی ئەو مەتەڵە بێكۆتاییانەی كە بەشێكی زۆری ژیانمان پێكدەهێنن بۆیان روونبێتەوە. ئاشكرایە كەم ئەم جۆرە ئازادییە بۆ هەموو كەسێك لە كۆمەڵگادا وەكو یەك دابەش نەبووە. هەندێك كەس كەمتری بەردەكەوێت و لەم ساڵانەی دواییەدا ئازادییەكە تەسكتر بۆتەوە. بێكاری و بێدەرەتانی كەمكەرەوەی گەورەن بۆ ملیۆنەها كەس. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر فراوانتر سەیری مێژووی سەردەم بكەین، دەتوانین لە كۆمەڵگای پیشەسازی و "پاش پیشەسازییەكاندا گۆڕانێكی گەورە بەدیبكەین لە دووركەوتنەوەی خەڵكانێكی زۆر لە سنووردارکردنی هەڵبژاردنەكان.

لەم پانۆرامایەوە ئەگەر بگەڕێینەوە سەر مەسەلەی ئامانجی كۆمەڵایەتی تەلەفزیۆن دەبینین كە بەهۆی پێشكەوتنی كۆمەڵگای مۆدێرن لەم روانەوە دەشێت بێتە شوێنێكی گونجاو بۆ تەلەفزیۆنی جۆری بەرز، تەلەفزیۆنێك كە زۆر باش بێت لە پێشكەشكردنی چیرۆكی بەسوودا چونكە بەم كارە پێویستییەك دابین دەكات كە لە مێژوودا كەم وێنەیە.

ئەگەر ئامانجی تەلەفزیۆن دابینكردنی ئەم پێویستییانە بێت، ئایا تیشكی زیاتر دەخاتە سەر كێشەی چۆنیەتی؟ كام تەلەفزیۆن ئەم پێویستییە كۆمەڵایەتییانە دابین دەكات؟ كامیان نایانكات و دەیانشێوێنێت؟ زۆر پێوەر و ئەزموون دەخرێنە روو، بەڵام بە گشتی و بەكردەوە وەڵامی ئەم پرسیارانە قورسە. پرسیار ئەوەیە "چیرۆكی تەلەفزیۆن چۆن بەسوود دەبێت؟ بۆ چ مەبەستێك؟ چیرۆكی جیدی یان گاڵتە؟ لێكۆڵینەوەی كۆمەڵایەتی بێت یان بۆ لەبیربردنی كێشە كۆمەڵایەتییەكان؟ مرۆڤ چۆن دەتوانێت جیاوازی لە نێوان فەنتازیایەكی ترسناك بكات كە ئارەزوویەكی گرنگی كپكراو دەردەبڕێت، لە چیرۆكێك كە هەمان رووداو دەگێڕێتەوە بەڵام بۆ چەواشەكردنی بینەر؟ چۆن باوەڕ بەوە بكەین كە چیرۆكی خەیاڵی زانستی *Science Fiction*، وەكو *Et* و *Alien* و *Blade Runner* بەسوودن و زانستیی خەیاڵیی باشمان دەدەنێ لە

بارەی ئەگەرەکانی مرۆڤ و تەنها بۆ خۆ دزینەوە و کات بەسەربردن نین؟ بەم جۆرە مشتومڕەکە گەرم و توندو تیژتر دەبێت. دەبێت واش بێت. چەمکی چۆنیەتی دەبێت هاندەر بێت بۆ ئەوەی باشتر لە بابەتی چیرۆکەکان بدوێین. ئەمەش ئەوە نییە بڵێین و (هەر چۆنێك بێت قەیناکات)، چونکە مەسەلەکە پەیوەندیی بە چێژەوە هەیە. چەمکی چۆنیەتی پێوەر و مەبەستێك دەداتە ئەم هاندانە، نابێت رەشبین بین لەبەر ئەوەی بڕیاردان لەسەر مەسەلەی چۆنیەتی ئاسان نییە. وەکو پێشتر وتم، ناسینەوەی ئەگەرەکانی چۆنیەتی سنوورێك نییە کە ئیتر لەودیوی ئەوەوە لێکۆڵینەوەی ژیرانە هەڵناگرێت، بەڵکو هێڵی سەرەتایە.

وەڵامی روون و ئاشکرا بۆ ئەم پرسیارانە نییە، بەڵام هەندێك نیشانە بۆ دۆزینەوەیان هەن. بۆ نموونە چیرۆکی جۆری نزم لەسەر پێناسە باوەکان *Received definition* دەڕوات لە بارەی ئەوەی چی دەشێت و چی ناشێت، چی "ئاساییە" و چی "نەخۆش *Pathological*". کاتێك بەبێ بیرکردنەوە بابەتی دووبارەکراو پەخش دەکەن و هەستی بینەر بریندار دەکەن هەست بە ناڕەوایی ئەم پێشێلکارییە ناکەن، کلێشە و بابەتی دووبارەکراو لە بریی وردبینیی بەسوود، ئەوەندە تەمەڵن جیاوازییە ئاکارییە کە نابینن. کەسایەتییەکان لە هەڵوێستی ستۆك و دووبارەکراو پێشکەشدەکەن بەجۆرێك کە کاردانەوەکانیان پێشبینیدەکرێت. بابەتی نزم و بێ سوود، بەهۆی گاڵتەپێکردن، یان ترس، یان ماندووبوونەوە، پەیوەندییان بە مەبەستە کۆمەڵایەتییەکانەوە نامێنێت چونکە دەبنە مایەی گاڵتەپێکردن و بوودەڵەیی و تەمەڵی. چیرۆکی تەلەفزیۆنی بەرز وەکو بابەتێك پێشکەش ناکرێت کە بینەر پێی ئاشنابێت، بەڵکو وەکو گریمانەیەك یان ئەزموونێك بۆ ئەندێشە. لە هەموو ژانرەکاندا چیرۆکی بەرزهەن کە دەتوانن خزمەتی ئەم ئامانجە بکەن: لە گۆرانی و نوکتەو زنجیرە تەلەفزیۆنییەکان و شانۆگەرییە خێزانییەکان (*Soop opera*) و چیرۆکەکانی ئەندێشەی زانستی و فەنتازیا و ریالیزم و چیرۆکی خێوەکان. ئەم چەمکەی مەبەست هیچ گەمەیەك یان شێوەیەکی جوانناسی لەوانی دیکە بە باشتر نازانێت. گۆرانییەکی (بۆب دیلەن) یان چیرۆکی (*The Young One*)ی (گرەینج هل)، یان (*The Blasphemers Banquet*)ی (تۆنی هاریسن) بە هەمان شێوە خزمەتی ئەم ئامانجە دەکەن، باشتر لە زنجیرەی *Smileyls People*. ئەم پێناسەیەی مەبەست، فەرهەنگی چینی ناوەڕاست بە پەسەندتر دانانێت.

مەسەلەکە سەیرکردنی تەلەفزیۆنە وەکو وێنەیەکی کۆمەڵگا، نەك بۆ واتایەك کە پێشتر بۆ هەڵبژێردرابێت، بەڵکو بۆ دەربڕینی مەتەڵ و کێشەکانی، بۆ گەڕان بەدوای ناکۆکییە نارەحەتەکاندا، بۆگەڕان و پێکەنین بەشتە پڕوپووچ و نیوە راستییەکاندا کە بینەر دەیویست باوەڕی پێبکات، بۆ بینینی ئەزموونە نەبینراوەکان، بۆ بیستنی دەنگی خەڵکە پەراوێزکراوەکە. ئەم زاراوە رەخنەییانە هەمووی ئاشکران، من پێشنیازی شتی تازە ناکەم. ئەمە بیرخستنەوەیەکە بۆ ئەو کەسانەی کە دەڵێن چۆنیەتی واتا باو بوون، کە دەڵێن ئامانجی سەرەکیی تەلەفزیۆن بریتییە لە بەخشینی خۆشی سوود وەرگرتن و نابێت رەچاوی هیچ شتێکی دیکە بین. دەمەوێت بەسادەیی و بەروونی ئەوە ئاشکرا بکەم کە چەمکی من بۆ چۆنیەتی ئەوەیە کە دەبێت رەچاوی ئامانجە کۆمەڵایەتییەکان بکات.

## هەمە جۆریی چیرۆك و چاکەکانی

من شێوەکانی چیرۆکی تەلەفزیۆنی چینی ناوەڕاستم لاپەسەندتر نییە، بەڵکو لەو باوەڕەدام کە ئەگەر شێوەیەکی تایبەت هەبێت کە توانایەکی بەهێزی پێببێت بۆ گێڕانەوەی چیرۆکی جۆری بەرزی بەسوود ئەو شێوانەیە کە تەلەفزیۆن هەتا ئێستا پەرەی پێداون و وەکو ئامێرێك گونجاون بۆ دەربڕینی مەبەست و پێداویستییەکان، ئەویش زنجیرە تەلەفزیۆنییەکانە بە هەموو جۆرەکانییەوە.

بەو کەسانەی کە نایانەوێت دان بەوەدا بنێن کە ئەم شێوە باوانە توانای شاراوەی هەیە بۆ زۆر باشبوون، دەڵێم: لە بیرتان دێت چەند ئەستەم بوو بۆ رۆشنبیرانی سپییەکان و کەدان بە هەندێك شێوەی هونەریدا بنێن وەکو جاز و فیلمی سینەمایی. ئەم شێوە جواننناسییانە نەك هەر بە "باو" دانانران و لە ریزی "هونەر"ی بەرزدا ناژمێردران بەڵکو بەهۆیەك بۆ شێواندنی چێژی هونەری لابینەرانی. وایان دادەنا کە (جاز) خەڵك دادەبەزێنێت بۆ ئاستی نەزمێکی خەولێخەری سێکسی لە ژیاندا، سینەماش مرۆڤ دەخاتە تەڵەی ژیانێکی تەنیایی سستەوە. هەمان ترس ئێستا لە شێوەکانی تەلەفزیۆن هەیە، چونکە بچووکن، دابەشدەکرێن، دەگۆردرێن، ناوەڕۆکەکانیان لاوەکییە (*Trivial*)و لە ماڵدا بەکاردێن، لەبەرئەم هۆیانە دەشێت ئاستی بینەر نزم بکاتەوە. هەروەها ماوەکەی کورتە و کاتێکی زۆر دراوە بە ئاگاداری و ریکلام. ئەم بۆچوونانە تەلەفزیۆن وەکو سەرچاوەیەکی زانیاری بۆ دەربڕینی راستی و جوانی لەبەرچاو دەخات.

جیاوازیی نێوان رۆمان و شێوە جیاوازەکانی دراما چییە؟ رۆمان (رۆمانی سایکۆلۆجی بە تایبەتی کە شێوەیەکی زاڵتر لە نەریتی رۆماننوسیدا) دوو شێوەی گوتاری تایبەتی هەیە. رۆمان زیاتر دەچێتە ناو ژیانی ناوەوەی کەسایەتییەکانەوە، بۆ ناو بیر و هەڵوێستەکانیان و بۆ ناو هەست و ئەندێشەکانیان، هتد، بەشێوەیەك کە لە ژیانی ئاساییماندا بەم کارە هەڵناسین، بەشێکی زۆری ژیانی ناوەوەمان بە وشە دادەرێژین کە لە ژیانماندا زۆربەیان نەبینراون و باسیان ناکەین. لە بەرامبەردا، چونکە رووداوەکان لە تەلەفزیۆندا دراماکراون و ناگێڕننەوە و لە دیدێکی ناوەندییەوە" (*Central*) پێشکەش دەکرێن گەیشتن بە ژیانی ناوەوەی کەسایەتییەکان ئاسان نییە. ئەگەر نوێکارییەك لەم بارەیەوە کرابێت ئەوەیە کە ماوە دەدرێت لە رێی گوێگرتن لە گفتوگۆی کەسایەتییەکانەوە (*over hearing*) بگەینە ژیانی ناوەوەی کەسایەتییەکان. شێوەیەکی دیکە گوێگرتنە لە قسەی هەرەمەکی، یان (قسەی پاشملە *gossip*، هەروەها گێڕانەوەی رووداوەکان (*anecdotes*). ئەمانە هەمووی بە وێنەی سیحراوی پشتگیری دەکرێن کە توانایەکی گەورەتری هەیە لە هی سینەما. (لەوانەیە تواناکانی تەلەفزیۆن لەگەڵ پێشکەوتنی توانای وێنەگرتندا بە تەواوی بگۆڕێت).

تایبەتمەندیی تەلەفزیۆن لەوەدایە کە گفتوگۆکان لەناو ماڵدا دەکرێن لەلایەن کەسانێکە کە لە خەڵکی ئاسایی بچووکترن. بۆ نموونە، با باسی شانۆگەرییە خێزانییەکانی تەلەفزیۆن *Soapopera* بکەین. چاکییەکانی ئەم شێوەیەی گێڕانەوە لەوەدایە کە بە سوودە بۆ ئەو مەبەستە کۆمەڵایەتییانەی کە باسم کردن، ئەویش پێشکەشکردنی چیرۆکی بە سوود بۆ ژمارەیەکی زۆری بینەران. لەم شانۆگەرییانەدا زنجیرەیەك

ڕووداو و کاردانەوەی قسە و، کەسایەتی و دوان لە سەر ڕووداوەکان — کە دەتوانین ناویان بنێین ڕاڤەکردن و پێشبینیکردنی دەرەنجامەکان— لە چوارچێوەی چیرۆکدا دەگونجێندرێن. دراما تەلەفزیۆنییەکان جۆرێکە لە ڕێکخستن و گێڕانەوەی ڕووداوە ئاساییەکانی دنیای ڕۆژانە. ئەم کارەش بێکۆتاییە. ئەمەش یەکێکە لە چاکییەکانی شانۆگەرییە تەلەفزیۆنییەکان، چونکە کۆتایی چیرۆکەکان پرۆسەیەکی کراوەو بێ کۆتاییە و هەموو کارەکتەرەکان بەشداریی گفتوگۆکان دەکەن و کەسیان دوا قسەی پێ نییە. بە بەراوورد لەگەڵ ڕۆماندا، چیرۆکی شانۆگەرییەکانی تەلەفزیۆن دەرئەنجامی کۆتایی نییە. چیرۆکەکان داناخرێن و خاڵێك نییە کە تیایدا شتەکان ڕوونبکرێنەوە و ڕووداوەکان لەیەك نموونەدا ڕێکبخرێن. لە شانۆگەرییەکانی تەلەفزیۆندا کاری لێکدانەوە و بڕیاردان بێکۆتاییە. ژیانی خێزان و کۆمەڵگا کۆتایی نایات بەهۆی مردنی یان ژنهێنانی یان شووکردنی کەسێکەوە. ئەم بێکۆتایی بوونە، بە بۆچوونی (جۆن ئێلس) (*Visible Fictions, p.154*) "بەشدارییەکی گرنگی تەلەفزیۆنە لە مێژووی شێوەکانی گێڕانەوەدا و لە چەمکی بینینی بە چیرۆککراوی *narrativised* دنیا".

کارەکە نەك هەر بێکۆتاییە، بەڵکو ئەنجامدانیشی لە دیدێکەوەیە کە زۆر بە خێرایی دەگۆڕێت گێڕانەوەکە ناوەندێکی نییە. هەر چەند هەریەکێك لە ئێمە متمانە بە هەندێك کارەکتەر دەکەین، بەڵام لە شانۆگەرییەکانی تەلەفزیۆندا شایەدێك یان گێڕەرەوەیەك نییە کە بە تەواوی جێی متمانە بێت. هەموو کەسێك تووشی هەڵە دەبێت، یان بە هەڵە لە ڕووداوەکان دەگات، یان بڕیاری هەڵە دەدات، یان تووشی شپرزەیی و کێشە دەبێت. هەموو کەسێك لە قارەمان و کەسی سەرەکییەوە دەگۆڕێت بۆ کەسێکی پەراوێزکراو و ئەگەر بۆماوەیەکی باش چاوەڕوان بین بە تەواوی لەبەرچاو وندەبێت. شانۆگەرییەکانی تەلەفزیۆن فێرمان دەکات کە هەموو کەسێك کەسایەتییەکی ناوەندییەو لە هەمان کاتیشدا دەشێت پەراوێزکراو بێت و دەستبەرداری ببین لەناو شەپۆلی یەك لە دوای یەکی ڕووداوە بچووکەکانی ژیانی خێزانی و کۆمەڵگادا. زۆر بڵێی لە بۆچوونی جیاوازەوە دەسووڕێتەوە و دەبێتە بڕێکی زۆری قسە *Talk* (بڕوانە *Ellis, p. 157*) "تەلەفزیۆن بریتییە لە قسەکردن، گفتوگۆ، بەرەنگاربوونەوە دەربڕینی تێڕوانین، هتد."

چیرۆکەکانی تەلەفزیۆن بەشداریدەکات لەو هەوڵانەی بینەر لە ژیانی ڕۆژانەیدا دەیدات و بەهێزیان دەکات. ئەم چیرۆکانە دەتوانن ڕووبارێك مەتەڵ پێشکەش بکەن کە پەیوەندییان هەبێت بە ڕەوشت و تاکتیکەکانی کاروباری ڕۆژانە و دەتوانن کۆمەڵێك چارەسەریی شیاوی بۆ دابنێن کە بینەر دەتوانێت بیریان لێبکاتەوە، وەریانبگرێت، هەرسیان بکات، یان ڕەتیان بکاتەوە.

ئەم چیرۆکانە هەستی بینەر لە بارەی ئەگەرەکان فراوانتر دەکات، ژمارەی ئەو وشانەی کە دەیانزانێت زیاتر دەکات و دەستپێشخەرییە تیۆرییەکانی بەهێزتر دەکات. چیرۆکەکانی تەلەفزیۆن دەشێت ببنە تاقیگەیەکی گەورەی ژیانی ڕۆژانە. چۆنیەتی بەرز دەبێت وەکو ئەو نموونەیە بێت کە باسمکرد، دەبێت لەگەڵ ناوەڕۆك و بینەردا هەماهەنگ بێت. بۆ بینەری تایبەت، کە ویستی تایبەتی هەیە، چیرۆکەکانی *Casuality, London Burning, East Enders, Brookside* نموونەی نایابن.

هەر ئەم ئاساییبوونەیە، تەنانەت بە ئاشکرا هیچوپووچییەیە، کە سیفەتی چاکی بەم چیرۆکانە دەدات، لە دیدی ئەو ئامانجە کۆمەڵایەتییەوە کە لێیاندەکۆڵمەوە، بۆ گەیاندنی چیرۆکی بەسوود. ئەم چاکییە دەشێت بە کردەوە بەهێزتر بکرێت ئەگەر تێکەڵی جوانناسی و ورووژاندن و گاڵتەوگەپ، هتد. بکرێت بە واتایەکی تر، من هیچ هۆیەك نابینم کە تەلەفزیۆنی جۆری بەرز رابواردنی تێدا نەبێت لەگەڵ بابەتەکانی جوانناسی و رۆشنبیریدا. هەندێك تەلەفزیۆن رابواردن دەخەنە پێش هەموو شتێکەوە، بە جۆرێك کە ناتوانین بزانین مەبەستی دیکەی هەیە یان نا. بۆ نمونە، ناتوانین *Blind Date* بە ئاسانی هەڵبسەنگێنین، چونکە نیوەی خۆشی رابواردنەکە لەو چیرۆکانەدایە کە ئەکتەرەکان بۆ یەکتری هەڵدەبەستن کاتێك کە دوورن لە یەکتر. بەڵام، دەشێت سوودی هەبێت بۆ بینەری گەنج، چونکە زانیاری ئەندێشەیی تێدایە لە بارەی ژواندانان لەگەڵ رەگەزی بەرامبەر و (کوڕان کام کچ بە سەرنجڕاکێش دادەنێن؟ چۆن وا دەکەیت بە گەمژە دانەنرێت؟ کامیان باشترە با بەخت پێبدرێت یان بایەخ بە خەڵك بدەیت؟ هتد). بە واتایەکی تر، ئەم چیرۆکە بە زۆری لە بارەی خۆدەرخستنەوەیە، کە بەشێکی زۆری ژیانی گەنجان داگیر دەکات و سەرچاوەی رادەیەکی زۆری دڵەراوکێیە. ئەمە تاقیگەیەکی سەرەکی نییە بۆ لێکۆڵینەوەی خەیاڵی و لە چەمکەکەی من دەربارەی چۆنیەتیدا نمرەی بەرز وەرناگرێت. بەڵام، ئەمە کاتێك مەحکووم دەکرێت کە دەرکەوت ئەو چیرۆکانەی پێشکەشی دەکات بینەران تۆمەتی شێواندنی دەخەنە پاڵ. ئایا ئەم چیرۆکە شێوەیەکی بیرکردنەوە لە بارەی رووداوەکانەوە پشتگیری دەکات کە بەشێوەیەك لە شێوەکان چەواشەکەر بێت؟ بیرۆکەکەی من وەڵامی ئەم پرسیارە ناداتەوە، بەڵکو تەنها زاراوە و پێوەر بۆ مشتومڕ (*debate*) ئامادە دەکات.

بە کورتی، من چەمکێکی چۆنیەتیم پێشکەشکرد دەربارەی یەك شێوەی چیرۆکی تەلەفزیونی، ئەویش شانۆگەرییە تەلەفزیۆنییەکانە. بەهەرحاڵ، شێوەی جیاواز رەخنەی جیاوازی دەوێت. بۆ هەر یەکێکیان مەسەلەی دۆزینەوەو لێدوان ئەوەیە کە ئایا خزمەتی ئامانجە کۆمەڵایەتییەکەیان دەکات. چۆن لە پرسە کەسی و کۆمەڵایەتییەکاندا بەکاردێن، هەروەها چۆن مەبەستە تایبەتییەکانی خۆی دەپێوێت؟ بە کورتی، ئەو کۆمیدیایەی *Monty python* یان ئەو سەرگروشتەیەی *Hill st. Blues* بۆ چییە؟ لە چەمکی چۆنیەتیدا هەموو شێوەیەك، هەموو نموونەیەك پێویستی بە پێداچوونەوە و پەرەپێدان هەیە و نابێت بە سادەیی و بەبێ بیرکردنەوە ئەنجامبدرێن. ئەم چەمکە، تەنانەت کاتێك باش روونەکرێتەوەو مەرجی ئاکاری راستی – وتن بۆ دادەنرێت بۆ روونکردنەوە، وەکو پێوەرێکی وشك بەکارنایەت. چۆنیەتی ژمێرە (*Mathematic*)ی تێدا نییە و لەلایەن لۆژیکەوە بڕیاری لەسەر نادرێت. ئەمەش یەکێکە لە چاکەکانی. نەك لە لایەن لۆژیکەوە، بەڵکو خەڵك بەهاو لێکدانەوەی خۆیان بەکار دەهێنن بۆ بڕیاردان لەسەر مەسەلەکانی چۆنیەتی لە حاڵەتی تایبەتدا.

لەبەرئەم هۆیانە، دەبێت ئەرکی هەر چەمکێکی چۆنیەتی ئەوە بێت کە هەموو ئەرکەکانی بخاتە ریزبەندییەکی بێوێنەی پلەدا. من لە پرسیاری جۆری ئایا (*Cheers*) وەکو بەرهەمێکی تەلەفزیۆنی بەرزترە لە (*The Rite of Spring*) تێناگەم. لەبری ئەوە، دەشێت بپرسین: مەبەست و چاکییەکانی (*Cheers*) و (*Twin Peaks*) چین و چۆن لەگەڵ پرۆگرامی دیکەدا کە مەبەستی هاوشێوەیان هەیە

بەراوورد دەکرێن و چۆن پلەی ئەم مەبەست و بەهایانە لە دیدی کۆمەڵایەتی گشتی و فەرهەنگی ریزبەند دەکرێن؟ کەواتە، ئەگەر ئەزمونکردنی چۆنیەتی بۆ جۆری جیاوازی چیرۆك جیاواز بێت و ئەگەر شێوازی جیاوازیان هەبێت لە گەیاندنی چیرۆکی بەسووددا، ئایا یاسایەکی گشتی نییە بۆ ئەم مەبەستە؟ پێموایە چوارچێوەیەکی گشتی هەیە کە تیایدا ئەم هەموو ئەزموونە و جیاکردنەوانە جێیاندەبێتەوە، ئەویش ئاکاری یاسای وتنی راستییە.

## راستی – وتن Truth – telling

هەندێجار ئەو باوەڕە دێتە ئاراوە کە بنەمای هەمەجۆری، کە بەو بەهانەیەوە پشتگیریی لێدەکرێت کە نە یەك راستیی بێهاوتای بە دەسەڵات و نە یەك رێگەی راستی خوێندنەوەی جیهان هەیە کە لەگەڵ ئاکاری وتنی راستیدا بگونجێت. لام وایە مەسەلەکە وا نییە. راستیی ئەوەی کە لێکدانەوەیەکی راستی بێهاوتا نییە بۆ رووداوەکان، ئەوە ناگەیەنێت کە هەموو لێکدانەوەکان وەکو یەك باشن. یان هەموو هەڵسەنگاندنێك لە مەسەلەی چێژ زیاتر نییە. ئەم خاڵە بە بیرکردنەوە لە بارەی توێژینەوەی زانستی روونده‌بێتەوە. هیچ متمانەیەك نییە کە هیچ تیۆرێك، هەر چەند بەڵگەکانی زۆر بەربڵاوبن و زۆر بەکاربێت، لە ئەنجامدا، بەشێوەیەك لە شێوەکان، کەموکورییەکانی دەرنەکەوێت، یان سەرکەوتوو نەبێت لەلایەنێکدا و پێویستی بە گۆڕین یان رەتکردنەوە هەبێت. ئەمە بەو واتایە نییە کە هەموو تیۆرەکان وەکو یەك باشن، بەو واتایەش نییە کە لەبەر ئەوەی توێژینەوەی نییە بۆ چۆنیەتی، هەرشتێك هەبێت هەر باشە. ئەنجامدانی ئەم شێواز و ئەزموونانە بە ویژدانەوە و گونجاندنی بەردەوامیان لەگەڵ هەر پێشکەوتنێکی زانستیدا دەبنە یاسایەك بۆ وتنی راستییەکان بەشێوەی توێژینەوەی زانستی. هەر لەبەرئەوەی کە راستی نییە، بنەمایەکی متمانە پێکراو نییە کە ببێتە پێوەرێك بۆ راستی، دڵنیاییەك نییە کە لە تێگەیشتنێکی سەربەخۆ و لە دەرەوەی توێژینەکەمان و ئامرازییەکانییەوە وەرگیرابێت، لەبەرئەمانەیە کە ئاکاری وتنی راستی ئەوەندە پێویستییەکی بنەڕەتییە.

رەوشەکە لە بارەی وتنی راستییەوە لە چیرۆکدا بەهەمان شێوەیە. هەموو چیرۆکەکان وەکو یەك باش نین ئەگەر هەمان مەبەست و بینەریشیان هەبێت، بۆیە یاسای هەمە جۆری خۆی لە خۆیدا بەس نییە، چونکە فرە بەرهەمی لە چیرۆکدا بەبێ سنووردانان خزمەتی ئامانجی کۆمەڵایەتیی پێشکەشکردنی چیرۆکی بەسوود ناکات. ئێمە پەرە بە شێواز و ئەزموونگەلێك دەدەین کە یارمەتیمان بدات لە خەملاندنی چۆنیەتیدا. هەموو ئەنجامدان و تەقلیدێکی چیرۆکی راستبێژ یاسا و رابەری خۆی هەیە، جەختکردن و شێوازی رەخنەیی خۆی هەیە. ئەمانەش خۆیان دەگۆڕێن. خەڵك بیر لە شتی تازە دەکەنەوە بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان، دید و بۆچوونی نوێ دەخەنە پێش لە بارەی داهێنان و هەڵسەنگاندنی چیرۆکی بەسوود. جۆرە بەرزەکانی چیرۆکی تەلەفزیۆنی مانا و ئەگەرەکانی وتنی راستی فراوانتر دەکەن. باشترین نموونە (The singing Detective)ی (دەنیس پۆرتەر)ە، کە (مردۆك) دان بەوەدا دەنێت کە تەلەفزیۆنی بازاری ئازاد هەرگیز نەیدەتوانی ئەنجامی بدات. هەمیشە ماوە هەیە بۆ گفتوگۆ، بۆ تازەگەری، بۆ ململانێکردن. گرنگ ئەوەیە مشتومڕە گەورەکان لە رێی یاسا گشتییەکان و ئەو بەهاو ئامانجانەوە چارەسەر

بکرێن. ئەم بەهاو مەبەستانە بەهەر ژانرێك یان شێوەیەك پێشکەش بکرێت کە گونجاو بێت بۆ بینەری تایبەت، گرنگ نییە، هەروەها گرنگ نییە چ تەکنیکێك بەکاردێن، یا چ لایەنێکی ژیان دەگرێتەوە.

گرنگ ئەوەیە کە تووشی ئەو قۆرت و مەترسییانە نەبن کە زانراون و دوور بکەونەوە لە کاری لاواز و لە درۆ. کەواتە یاسای راستی — وتن رێگەیەکە بۆ جەختکردن لەسەر رێکخستنی ئاسایی چاکە و خراپەی کاری بەرهەمهێنانی چیرۆك لە جیهاندا. هەروەها پێشنیازکردنی زمانێکی رەخنەیی باو زۆر گرنگە بۆ خەملاندنی چۆنیەتی — زمانێك کراوەبێت و ماوەی پێشبڕکێ بدات و هەوڵنەدات هیچ جۆرە پێوەرێکی سادەی هەڵسەنگاندن دانەنێت (کە پێشنیازی یەك راستی نەکات بۆ هەڵسەنگاندنی چیرۆك).

وەکو نموونەیەك بۆ پیشاندانی چۆنیەتی کارکردنی ئاکاری وتنی راستی، دەتوانین بیر لەوە بکەینەوە کە کاتێك زنجیرەیەکی تەلەفزیۆنی کۆن و ماندوو دەبێت و بینەر ماندوو دەکات، پەنا دەباتە بەر چیرۆکی دووبارەکراو و پەیوەندیی بە وتنی راستییەوە دەبچڕێت. زنجیرەی *M*A*S*H* دەشێت نموونەیەك بێت بۆ ئەم بابەتە کاتێك کە لەسەر ورووژاندنی هەستی خەڵك و گاڵتەی ئامادەکراو دەنیشێتەوە لەبری وتنی راستی، وەکو لە فیلمە سەرچاوەکەو لە ئەڵقە سەرەتاییەکاندا هەبوو. مەترسیی ئەوەی کە لەسەر ئەوە جێگیربین کە بە تەنها رابواردن بکەینە ئامانج، هەر چەند کە بێ ئەرك و پڕە لە دڵنیایی.

ئەگەر تەلەفزیۆن بە مەبەستی راستی وتن و زانیاری کۆمەڵایەتی کار بکات، دەبێت ئەو یاسایانە هەڵببژێرین کە دژی بوودەڵەیی و بیرتەسکین. دەبێت هەموو فشارێك رەتبکەینەوە کە داوای کپکردنی هەندێك دەنگ و دوور خستنەوەی هەندێك چیرۆك دەکەن. دەبێت کاردانەوە هەبێت لە دژی میکانیزمی پەراوێزکردنی هەندێك گرووپ یان پیشاندانیان وەکو کەسانی نەخۆش. دەبێت پۆزەتیڤانە هەوڵی تۆمارکردن و توێژینەوەی ئەو لایەنانەی ئەزموونی کۆمەڵایەتی بدرێت کە بە دەگمەن پێشکەشکراون و ئەو گرووپە کۆمەڵایەتییانەی کە فەرامۆش و بێدەنگ کراون. تەلەفزیۆن دەبێت زانستخوازی و لێبوردەیی هانبدات. دەبێت باوکسالاری و شۆڤینزم رەتبکاتەوە. راستیی ئەوەی کە یاسای بازار مەودای بەرهەمەکان تەسکدەکاتەوە و هەندێکیان دوور دەخاتەوە بە روونی لە چیرۆکەکانی تەلەفزیۆنی ئەمریکادا دەردەکەوێت (هەر چەند لەم دواییەدا پێشکەوتن لە هەندێك بەرنامەدا، وەکو بەرنامەی *Roseanne* بەدیدەکرێت) بێجگە لە چەند حاڵەتێك، چینی کرێکار لە بەرهەمەکانی ئەمریکادا دیار نییە. ئەگەر یەکێك لە هەسارەی مەریخەوە بێت و سەردانی ئەمریکا بکات وا دەزانێت کە دانیشتوانی ئەمریکا یان ملیۆنێرن (زنجیرەی *Dallas*) یان پیشەوەری چینی ناوەڕاستن (زنجیرەی *The cosby show* و بە کردەوە هەموو زنجیرە خێزانییەکانی وەکو *Thirty Something*) یان پۆلیس و دزن. یاسای چۆنیەتی بەرز دەبێت کاردانەوەی هەبێت دژی گەندەڵی و دژی فشاری ئەوانەی تەمەڵیی چینی ناوەڕاستیان دەوێت.

وەکو نموونەیەکی بەرچاو، بڕوانە کاردانەوەی زنجیرەی *East Enders* بەرامبەر رەخنەو هاواری: (ئەم شتە پیسە لەبەرچاو لابەرن!) چۆن بوو: لە وتنی راستی دوورکەوتەوەو هەندێك دیمەنی لابردو بەرەبەرە ئاستی دابەزی. لە پاش ساڵی 1990ەوە،

وازیهێنا له باسکردنی هومۆسێکشواڵەکان (له هیچ کاتێکدا وەکو کەسی "ئاسایی" پێشکەش نەکرابوون و هێرشکردن له سەریان هەر بەردەوامە). ئەمە کارێکی خراپ بوو. بەڵام، بەهەمان شێوە خراپە هەوڵێدا هەموو کەسایەتییەکانی زنجیرەکە وەکو کەسانی خاوەندکاری بچووك پیشانبدات. وازیهێنا له باسکردنی ئەوانەی کە بێکارن یان کار بۆ خەڵکی دیکە دەکەن. هەموویان بوون بە خاوەندکار ***businessman***، هەندێکیان بەشێوەیەکی یاسایی و هەندێکیان نا. ئەمە سەرکەوتنی فەرهەنگی کار و پرۆژەکان بوو. (شارۆن) ئیتر بۆ کۆمپانیایەکی گواستنەوە کار ناکات، بەڵکو لەگەڵ (دیسکی)دا مەیخانەیەك بەڕێوەدەبەن. دامەزراندنی کارێکی سەربەخۆ لەلایەن کۆمەڵێك ژنی قژبڕەوە یان بەنناوە کارێکی زەق و باوە. (ئەیان و سیندی) قاوەخانەیەك بەڕێوە دەبەن. هەموو کەسێك بازرگانێکی سەرجادەیە. تەنانەت (دۆت کۆتن)یش بەرزبۆتەوەو کاری بەڕێوەبردن دەکات. تەنها (کارمل) نەبێت کە بە تەنیا، لە ژیانی تایبەتی خۆیدا پیشاندەدرێت)، هەروەها دکتۆر (***legge***)یش، ئیتر بەشەکانی دیکەی کۆمەڵگا لابراون. بە کورتی پرۆلیتاریا و بێکارەکان و بەشە گشتییەکانی ئابووری و هۆمۆسێکشواڵەکان هەموو لەناو براون.

دەمەوێت دوا تێڕامانم بڵێم، کە مەبەستی کۆمەڵایەتیی ئەم چیرۆکانە و تەلەفزیۆن بە گشتی دەردەخات و هێشتا نەمخستۆتە بەر لێکۆڵینەوە. دەبێت هێزی وتنی ڕاستی لە تەلەفزیۆندا، ئایا بەهۆی چیرۆکەوە یان بەرنامەی دیکەوە بێت، توانای وتنی ڕاستی لە بینەردا بەهێز بکات. نووسەری چیکی ***zuener Urbank***، لە ساڵی 1977دا وتی: (ئێوە، لە ڕۆژئاوادا کێشەیەکتان هەیە، ئێوە دڵنیانین کە هەڵدەخەلەتێنرێن و کەی درۆتان لەگەڵدا دەکرێت. ئێمە ئەو کێشەیەمان نییە. ئێمە ئەو توانایەمان هەیە کە ناو دێڕەکان بخوێننەوە.)

ئەم توانایە، کە بەهای ڕاستیی شت زانێت، گومانت هەبێت و چاکە و خراپە لەیەك جیابکاتەوە. ئەم توانایە لە کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا، کە حکومەتەکانیان بایەخی بەراستی نەئەداو وایان دانابوو کە هەموو ڕاستییەکان لای ئەوانە، ڕەگی داکوتابوو.

جیاکردنەوەی ڕاستی و پێچەوانەکەی زۆر ئەستەمە لە کۆمەڵگای ئێمەدا، کۆمەڵگاکانی بریتانیاو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە تیایاندا کەسانێکی زۆر هەن بە پیشە ناپاك و فێڵبازن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە پێشبڕکێدان لەگەڵ یەکتردا و بازاڕێکی هەڵخەلەتێنەری بیر و زانیاری بە خەڵکی دەفرۆشن. تەلەفزیۆن ڕۆڵێکی بەهێزی گێڕا لە پێشخستنی فەرهەنگی (پۆست مۆدێرن)ماندا، بەجۆرێك کە بۆتە هەڕەشەیەکی شاراوە لەسەر توانای جیاکردنەوەی ڕاستی لە ساختە. ئەمە مۆتەکەی دنیای پۆست مۆدێرنە، کە تیایدا لافاوێکی بێکۆتایی وێنەی ساختە ***Simulacra*** بە ڕادەیەك زاڵبووە کە جیاکردنەوەی نێوان ڕاستی و فەنتازیا هیچ کرپارێکی نییە.

بەڵام، تەلەفزیۆن خۆی لە خۆیدا بەکاری بنکۆڵکردنی فەرهەنگی هەڵناسێت. ئەگەر واش بکات ئەوە بەهۆی ئەو سیستەمە ئابووری و یاسایانەوەیە کە ڕێکیدەخەن و دەتوانن تەگەرە بخەنە بەردەم دەرخستنی ڕاستییەکان لەلای بەرهەمهێنەری بەرنامەکان و بینەرانیشدا.

مەرجی پێویست بۆ وتنی ڕاستی چییە و چۆن تەلەفزیۆن دەتوانێت پەرەیپێبدات، یان بەرز ڕایبگرێت؟ کەی خەڵك دەتوانن بڵێن درۆیان لەگەڵدا کراوە؟ کەی دەتوانن (کاغەزی سپی بخوێننەوە و

بزانن هەڵخەڵەتاون؟ خەڵك ئەوەندەی بەس نییە كە چەكدار بێت بە هەڵوێستێكی ئاكاری، كە پابەندبێت بە وتنی راستی و رەتكردنەوەی گاڵتەپێكردن، هەرچەند كە ئەمانە گرنگن. هەروەها پێویستە كۆمەڵێك سەرچاوەی فەرهەنگیمان هەبێت، دەبێت بنەمایەكی مادیی توانا و شارەزایی لەناو كۆمەڵگای مەدەنیدا بڵاو بكرێتەوە. بەبێ ئەم سەرچاوانە وتنی راستی ئابستراكت دەبن و كاریگەر نابن. تەلەفزیۆنی جۆری بەرزبینەرێكی بەرزی دەوێت ( ***High quality television requires a high quality audience***)، هەروەها دروستیشی دەكات. ئەمە یەكێكە لە گرنگترین ئامانجەكانی.

وتنی راستی چالاكییەكە كە پشت بەم هەموو شارەزایی و توانا و سەرچاوەی زەینی و كەسایەتی دەبەستێت بۆ ئەوەی وتنی راستی لە ناوەڕۆكێكی تایبەتدا شیاو بێت، چونكە وتنی راستی پێویستی بەزمانێكی تایبەت و زانیاری و بەهاو خووی تایبەتی مێشك و شارەزایی تەكنیكی و رۆشنبیریو جوانناسی و خەیاڵ و توانای جیاكردنەوەی هەیە. دەبێت ئەزموونكردنی چۆنیەتی كاریگەریی تەلەفزیۆن بەسەر بینەراندا بگرێتەوە، بەجیا یان وەكو فەرهەنگێكی تەلەفزیۆنی، هەروەها توانایان لە وتنی راستیدا. خۆشبەختانە، تەلەفزیۆن زۆر ناوەرۆكی تێدایە كە هەوڵدەدات هاووڵاتییان رابهێنێت لەسەر جیاكردنەوەی چاك و خراپ، ئەوەی باوەڕی پێدەكرێت و ئەوەی جێی باوەڕنییە، ئەوەی راستی دەڵێت و ئەوەی چەواشە دەكات. دەبێت لە لێكۆڵینەوەكانماندا لە بارەی تەلەفزیۆن رادەی بەشداری و تێكەڵبوونی تەلەفزیۆن لەم پرۆسە كۆمەڵایەتییانەدا رەچاو بكرێت. دەبێت بزانین ئایا ئەم توانایانە بەهێز دەكات یان لەناویان دەبات. دەبێت بەهەموو توانایەكمانەوە دژی هەر پرۆژە یان یاسایەك بین كە دەبێتە مایەی بێبەشكردنی یان بێتواناكردنی خەڵك لە وتنی راستیدا، یان هاندەر بێت بۆ فەرهەنگێكی تەلەفزیۆنی، وەكو فەرهەنگی چڕكراوی ***tabloid*** بریتانی كە زۆر بە سووكییەوە سەیری سیستەمی وتنی راستی دەكات. خودی شێوەكانی وتنی راستی لە تەلەفزیۆن زۆر جۆرە ناپاكیی لێ دەوەشێتەوە: چوارچێوە ناو ماڵییەكەی، دەربڕینی درۆی دڵسۆزی، توانای بەكارهێنانی وێنەكان، دوانی راستەوخۆ لەگەڵ بینەراندا، ئەمانە هەمووی فریودەرن بۆ ناپاكی لە وتنی راستیدا. لەم هەموو لێدوانانەدا لەسەر تەلەفزیۆنی داهاتوو، كە ئێستا بەردەوامە، مەسەلەی ئاكاری تەلەفزیۆنی نەهاتە ئاراوە. ئەوەی من دەمویست پیشانیبدەم ئەوەیە كە خودی مەسەلەی چۆنیەتی دوو رەهەندی بنەڕەتی فەرهەنگی و ئاكاریی هەیە و پشتگوێخستنیان كەمتەرخەمییە.

### سەرچاوە

*Joh Mepham,*

*Television Fictions – Quality*

*And Truth – Telling,*

*Radical Philosophy 57*

# ناخۆشترین و خۆشترین ساڵی ژیانم لەگەڵ مایکۆفسکیدا

بیرەوەرییەکانی فێرۆنیکایۆلۆنسکایای ئەکتەر
لە عەرەبییەوە: نوری سەعید قادر

1- ژیانی فلادیمیر مایکۆفسکی

فلادیمیر مایکۆ فسکی (1893-1930) یەکەمین شاعیری سەدەی بیستەم بوو کە گشت بەهرەیەکی مەزنی خۆی بۆ شۆڕشی سۆشیالستی تەرخان بکات و شیعرە شارستانی و بەسۆزە هەژێنەرەکانی دەقاو دەق و هەروەکو خۆی بگەیەنێتە جەماوەری سەر شەقامەکان و بیکاتە (فەرماندەی هێزە مرۆڤایەتییەکان) و ناوی (چارەسەرکەرو خاوەن پەیام و پێشەوا)ش لە خۆی بنێ، کە لە مێشکی ملیونەها کەسدا هەر بەو جۆرە ماوەتەوە.

ئەگەرچی ڕەنگە ئەو وێنەیە بۆ مایکۆفسکی ڕاست بێت، بەڵام هێشتا ناتوانێت بە تەواوی هەموو لایەنەکانی کەسایەتی ئەو مرۆیە بگرێتەوە، چونکە مایکۆفسکی مرۆڤێکی ئاڵۆز و ناتەبا و پابەندی نەرێتە باوەکانبوو. مایکۆفسکی لەلاوێتیدا شەیدای کۆبیزم و فیوچەریزم بوو، پەرۆشی درووشمەکانی نوێکاری و ستاتیکای باوی سەرەتای سەدەی بیست بوو.

هونەری کۆن لەناودەبەین و لە کەشتی سەردەمەکەمانەوە فڕێی دەدەینە دەرێ. بەڵام هەر زوو بەسەر ئەم بیرۆکە گەمژەیەدا زاڵبوو. لە پێناوی سیاسەتدا بە ئەنقەست لیزیکی کپکرد و لە ئەنجامی ئەوەدا تا کۆتایی هەر بە شاعیرێکی تەم و مژاوی مایەوە.

ژیانی کەسایەتی مایکۆفسکی لە کارەکەی کەمتر ئاڵۆز نەبوو. پەیوەندییەکانی لەگەڵ لیلیا و ئۆسیب بریکدا جێگەی هەموو تانە و تەشەر و ناو زڕاندنێك بووە، کە تا ئێستاش هەروا ماوەتەوە، هەروەها ئەفسانەی (تاکە خۆشەویستی شاعیر) لیلیا بریك. لەگەڵ ئەوەشدا ژنانی زۆری تریش لە ژیانیا هەبوون لە نێوانیاندا فیرۆنیکا پۆلۆنسکایا کە لە ساڵی 1908دا لە دایك بووە، و لە ساڵی کارەساتە خۆکوژییەکەی مایکۆفسکیدا یەکەمین هاوڕێی بووە و ئەو بیرەوەریانەی کە لە ساڵی

1938دا نوسیونی و لە گەنجینەی بەڵگەنامەکاندا لە مۆزەخانەی مایکۆفسکیدا پاراستویەتی و بەم نزیکانە سەریان هەڵداوە، لە فدبروسی لیتراتۆریدا (*Voprosy Libratury*) کە گۆڤارێکی بەر تەسکی تایبەت بە رەخنەگران و نووسەرانە بڵاوکراوەتەوە.

**2- بیرەوەرییەکانی (فیرۆنیکا پۆلونسکایا):**

لە 13ی ئایاری 1929داو لە پێشبڕکێیەکی ئەسپ سواریدا لە مۆسکۆ، چاوم بە مایکۆفسکی کەوت، ئۆسیب کە ماوەیەکی کەمبوو یەکترمان ناسیبوو بە هۆی ئەو رۆڵەی لەو فیلمەدا ئەمبینی کە لیلیانی خوشکی دەرهێنەری بوو، لەگەڵ مایکۆفسکیدا بەیەکتری ناساندین.

(خوشکانی بریك لە بواری رۆشنبیریدا کاریاندەکرد).

کاتێك کە مایکۆفسکی لە لامان رۆیشت ئۆسیب گوتی: "سەیری ئەو بیچمە سەیرەی فلۆدیا بکە. پیاوێکی کەتەو دوو قاچی کورت".

لە ڕاستیدا، من مایکۆفسکیم واهاتە بەرچاو کە هەر لە یەکەم نیگاوە پێکەنینت بە پاڵتۆو تەپلە و یاریکردنی بە گۆچانەکەی دەستی، بێت. هەر لە سەرەتاوە دەنگی بەرز و شێوەی قسەکردنی سەری سووڕهێنام چونکە کەس لەولایەنەوە لەوی نەدەکرد. هەستم بە شڵەژان کرد، لەگەڵ ئەم پیاوە کەتەیەدا چۆن رەفتار بکەم؟ پاشان نووسەران (کەتاییف و ئۆلیکا و بیلینیك و یالشین کە ئەکتەری شانۆی هونەریی مۆسکۆ و ئەو کاتە مێردم بوو هاتن، هەموو لە سەر ئەوە ڕێککەوتین ئەو ئێوارەیە بچین بۆ ماڵی کەتاییف).

لەویٚ دەمودەست هەریەکەمان هۆگری ئەویترمان بووین، بەوە ورەم بەرزبووەوە، بێگومان بەشێوەیەکی گشتیی ئێوارەیەکی سەرکەوتوو بوو. مایکۆفسکی لێی پرسیم: چۆن دەتوانیت بەم شێوەیە خۆت بگۆڕیت؟ ئەم بەیانییە لە پێشبڕکێی ئەسپ سوارییەکەدا هەروەکو مراوییەکی ناشیرین وابوویت، بەڵام ئێستاش بەم هەموو جوانییەوە..

لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە بۆ بەیانی بەیەکبگەینەوەو ڕۆشتیین ئەو دەمەی مایکۆفسکی لە نێو نووسەرەکاندا بوو، ئەو مایکۆفسکییە نەبوو کە دوێنیٚ چاوم پێیکەوتبوو، ڕەق دەنگ زل و قۆشمەچی. مایکۆفسکی هەستی بە شڵەژانم کردبوو، ئەوپەڕی نەرم و ژیر و تێگەیشتوو بوو، لە شتە ئاساییەکان بەولاوە باسی هیچی تری نەکرد. لە بارەی شانۆوە پرسیاری لێکردم، سەرنجمی بە لای هاتووچۆکەراندا ڕادەکێشا و لە بارەی بیرۆکەکانی تریشەوە قسەی بۆ دەکردم. تەنانەت ئەم شتە بچووکانە، کە لە شەقامەکەدا دەمانکرد، ئەوەی بۆ دەرخستم کە خاوەنی چاوێکی تیژ و بیر و هۆشێکی لەڕادە بەدەری هونەرمەندێکی مەزنە.

بەهۆی بوونم بە هاوڕێی کەسێکی واوە، لە پڕێکا هەستم بە شادمانییەکی لێوان لێو و بێسنوور کرد و هەستم بە سەر تیاچوونێکی تەواو و شڵەژانێکی زۆریش کرد، (لەگەڵ ئەوەشدا دڵم بەوپەڕی خۆشییەوە لێیدەداو لە کانگای دڵمەوە هەستم کرد کە ئەو ئەتوانیٚ بە ئاسانی بێتە ناو ژیانمەوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ویست و ئارەزووی ئەو). دوای ماوەیەکی کەم و لە کاتێکدا کە پیاسەمان دەکرد بانگهێشتی کردم بۆ ئەپارتمانەکەی من لەوەوپێش دەمزانی کە ئەپارتمانەکەی وا لە چیندریکۆف بیریولوکە، چونکە کاتێك چوو بوو بۆ دەرەوەی وڵات لەویٚ سەردانی لیلیابریکم کردبوو، کاتێك کە زانیم لە شەقامی لۆبیانکا نووسینگەیەکی هەیە و تیایدا سەرقاڵی خوێندنەوەیە سەرم سووڕما، لەو ماڵەیدا کە لە لۆبیانکادا بوو کتێبەکانی نیشاندام و شیعری خۆی بۆ خوێندمەوە.

مایكۆفسكی دەنگێكی زۆر گەورە و زوڵاڵی هەبوو كە بە تەواوی لە كاتی خوێندنەوەی شیعرەكانیا زاڵبوو بەسەریا، شیعرەكەی بە دەنگە بەرزەكەی بۆ خوێندمەوە كە پڕ بوو لە سۆز و هەژاندن، گفتوگۆ كۆمێدییەكانی بەوپەڕی خۆشییەوە خوێندنەوە، لەمانەدا بۆم دەركەوت كە مایكۆفسكی لەگەڵ ئەوەشدا كە شاعیرێكی زۆر مەزنە، هەروەها ئەكتەرێكی زۆر لێهاتووەو خاوەنی بەهرەیەكی بێئەندازەیە.

### سیحر و بەهرەمەندییەكەی سەرسام بگرە وڕو كاسیان كردم.

كاتێك وردبوومەوە بۆم دەركەوت كە لە توانامدا نەبوو بتوانم بەوشە سەرسامبوونی خۆمی بۆ دەرببڕم. بێگومان مایكۆفسكی هەستی بە تێكچوونم كردبوو، زۆر شادمان بوو، سەیری دەوروبەری ژوورەكەیكرد، لە ئاوێنەكەدا سەیری خۆیكرد، لێی پرسیم: فیرۆنیكا شیعرەكەم بەلاتەوە پەسەند بوو؟

كاتێك كە بە ئەریٚ وەڵامم دایەوە، باوەشی پیاكردم، كە نارەزاییم دەربڕی بەلایەوە سەیرو كتوپڕ بوو، هەروەكو منداڵێك ڕووی گرژ كرد، خەمبار بوو، گوتی: زۆر چاكە دڕندایەتی خۆتت نیشاندام لەمەودوا كردەو ڕەوشتم باش دەبێت، تۆ ژنێكی هێجگار هەستداریت.

هەموو ڕۆژێك دەچووم بۆ نووسینگەكەی بۆلۆبیانكا. ئێوارەیەكیان كە لە گۆڕەپانی لۆبیانكاوە دەیگەیاندمەوە بۆماڵەوە، كتوپڕ بە بەرچاوی هاتووچۆكەرانەوە دەستێكردە سەمای مازۆركای پۆلۆنی. لە شەقامەكەداو بە تەنها سەمایدەكرد، كەتەو سست و خاو، بەڵام هەنگاوەكانی لەسەرخۆو هێواش، بە ڕاستیی دیمەنێكی سەیر و سەمەرەی پێشكەشكرد.

مایكۆفسكی زۆر حەزی لە گۆرانی خێرا و زوو بەزوویی بوو، هەرگیز لە بیرم نایات هێمن و لەسەرخۆ بووبێت، هەمیشە لە ژیان پەست و تووڕەو ناڕازیبوو، یان كەسێكی كۆمێدیی بوو، پڕ بوو لە جوانی دەگمەن. لەبەرخۆیەوە چەند بەیتێكی دەچڕی و چامەكانی بە ئاوازە تایبەتییەكانی خۆی دەكردە گۆرانی و دەیگوتن، یان مۆن و پەست و خەمبار بوو، دوور لە خەڵكی بۆ ماوەی چەند كات ژمێرێك پاڵدەكەوت، لە وەرزی پێشكەشكردنی شانۆگەرییەكاندا لەگەڵ تیپێكی گەورەی ئەكتەراندا لە قەفقاس دەگەڕامەوە، ئێمە لە گالیسكەیەكدا بووین كە كورسییەكانی زۆر ڕەق و ناخۆشبوون، كاتێك كە گەیشتینە مۆسكۆ چڵكن و پڵكن و تەپووتۆزاوی و ماندوو بووین پێویستمان بە گەرماو بوو.

من وام دەزانی كە دایكم لە وێستگە چاوەڕوانم دەكات، پاشان و كتوپڕ ئەوانەی لە دەوروبەرم بوون گوتیان: نورا، سەیركە كیٚ هاتووە بۆ پێشوازیكردنت!؟

چوومە دەرەوەو چوومە هۆڵەكە، سەرم سووڕما كە ببینم مایكۆفسكی دوو گوڵی سووری بە دەستەوەیە، جوان و شیكپۆش، لەو دیمەنەی خۆشم شەرمەزار بووم. پاشان دەركەوت مایكۆفسكی بە تەلەفۆن بە دایكمی گوتووە كە دەچێت بۆ پێشوازی لێكردنم و پێی گوتبوو كە بە دڵنیاییەوە ئەو كارە دەكات. ئەوەشی پێگوتبوو كە دەیەوێت چەپكێك گوڵی گەورەم پێشكەش بكات، بەڵام لەوە ترسا كەوەك خوێندكارێكی ئەویندارى خوێندنگە بنوێنیٚ و كەتەیی لەشیشی بە هەند بگیریٚ. لەبەرئەوە بڕیاریدا كە هەر دوو گوڵی بۆ ببات.

ڕۆژێكی سەختی زستانە بە ئۆتومبیلەكەی بردمی بۆ بیترۆفسكۆ.. ڕازمۆفسكۆیە، سەرماكەی زۆر بێئەندازە بوو لەسەرمانا بەستبووینی، لە

ئوتومبیلەكە دابەزین و دەستمانكردە یاریكردن و شەڕە تۆپەڵ و لەسەر بەفرەكە خۆمان دەتلانەوە. مایكۆفسكی لە بارێكی دەروونیی زۆر كامەراندا بوو، چیلكەیەكی هەڵگرت و وێنەی دڵێك و تیرێكی لەسەر سەهۆڵی گۆمەكە كێشا و هەردوو وشەی (نورا – فولودیا)ی لەسەر نووسی.

## لە رێگەی گەڕانەوەماندا جارێك پێی گوتم خۆشی دەوێم

لە سەرەتاوە، لەوەدا دەستەوستان بووم كە لە پەیوەندی نێوان مایكۆفسكی و دوو خوشكەكە بریك تێبگەم، چونكە ئەوان خێزانێكی بێدەنگبوون، تەنانەت لە سەرەتاوە لەوەش دڵنیانەبووم كە كێ مێردی لیلیایە. ڕۆژێكیان هەردوو خوشكەكە چوون بۆ لینینگراد، من لە كەندریكوف بیریولوك لە ئەپارتمانەكەی مایكۆفسكی بووم، هەروەها یالشینیش لە مۆسكۆ بوو، فلادیمیر سوور بوو لەسەر ئەوەی كە ئەو شەوە لەلای بمێنمەوە. لێم پرسی: ئەی ئەگەر سبەینێ بەیانی لیلیا هاتەوە و لێرە بینیمی چی بڵێین؟ –دەڵێین وا دەبینم كە تۆش لەگەڵ نۆرۆژگادا دەژیت؟ چاكە، ئەوە هەڵبژاردنێكی چاكە. كە ئەو قسانەی دەكرد لە دەنگیدا خەفەتێكم بینی كە لیلیا بەو جۆرە بێخەم بێ و گوێی نەداتێ. وە هەستم بەوەش كرد كە تا ئێستاش هەر خۆشی دەوێت، كە ئەوەش دوو چاری ئازارێكی زۆریكردم.

پاشان بۆم دەركەوت كە شتێك ڕوودەدات من نایزانم. مایكۆفسكی بۆلیلیا زۆر باشبوو، بەهەر جۆرێك بێت لیلیا بەلایەوە تاكانە بوو، بەڵام بە بێ ئەوەی شتێك لە نێوانیاندا هەبێت كە پێیبڵێن خۆشەویستی.

مایكۆفسكی لە هەڵسوكەوت كردنیا لەگەڵ لیلیادا گەلێك نەرم و نیان بوو. هەموو ڕێزێكی لێدەنا، كە دەچوو بۆ گەشتێك و دەگەڕایەوە هەمیشە چەپكە گوڵ لە چاوەڕوانیدا بوو. هەمیشە دیاریی زۆری بۆ دەهێنایەوە، تەنانەت جارێكیان لە گەڕانەوەیدا لە گەشتێكدا بۆ دەرەوەی وڵات ئوتومبیلێكی هێنایەوەو بە تەواوی خستییە ژێر دەستییەوە. لیلیاش هەمیشە بە شێوەیەكی جوان و هاوڕێیانە لەگەڵ مایكۆفسكیدا ڕەفتاریدەكرد، بەڵام لە هەمان كاتیشدا داواكانی زۆر و زۆرداریش بوو، زۆر جاریش لەسەر شتی هیچ و پووچ سەرزەنشتی دەكرد و شەڕی پێدەفرۆشت و بەكەمتەرخەم ناوی دەبرد.

مایكۆفسكی پێیگوتم كە لیلیای زۆر خۆش دەوێت. دووجار ویستویەتی كە فیشەك بەخۆیەوە بنێت، تەنانەت جارێكیان پەلە پیتكەی دەمانچەكەیترووكاندووە كە لوولەكەی ئاڕاستەی دڵی خۆی كردووە، بەڵام دەمانچەكە نەتەقیوەتەوە.

بۆم دەركەوت كە لیلیا، پەیوەندییە سۆزدارییەكەی لەگەڵ مایكۆفسكیدا بە سووك دادەنێ، و خۆی لەو بەزلتر دەزانێ. وەكو لەگەڵ منیشدا وابوو، بەڵام ئەوە تەنها هەر لە سەرەتاوە بوو، خۆ ئەگەر یەكێك هەوڵیبدایە كە بچێتە ناخییەوە، ئەوە زۆری تووڕە دەكرد. ئەیویست كە هەر خۆی خۆشەویستی تاك و تەنیای مایكۆفسكی بێت.

دوای گەڕانەوەم لە قەفقاس و پێك گەیشتنمان لەوێستگە، سەرنجمدا كە مایكۆفسكی شێت و شەیدام بووە، ئەمەش زۆر شادمانی كردم. و وامان لێهات كە زۆر جاران بەیەك دەگەیشتین. لەوەش زیاتر هیچ بیرێكی تر بە بیرماندا نەدەهات.

بەڵام دوای ئەوە بەزوویی باری دەروونی مایكۆفسكی بەرەو خراپبوونێكی پڕ مەترسی ڕۆیشت، لەوە دەچوو شتێك بێئارامی كردبێت و هەمیشە و بێ پچڕان بۆ چەند سەعاتێك بە بێدەنگی دەمایەوە. گشت ئەو هەوڵانەی كە دەمدا بۆ ئەوەی هۆكاری بارە دەروونییە خەماوییەكەی بزانم

دەیدایە پاڵ هۆکاری تێکچوونی حەز و ئارەزووی هەرگیز لە کێشەکانیا هاوبەشی نەدەکردم، کاتێك کە تووڕە دەبوو زۆر بە دەگمەن بەریئەدا..

لەسەرەتاوە، مایکۆفسکی لە مێردەکەم بێزارنەبوو، بەڵام ئێستا وا ئێرەییش تەنگی پێهەڵچنیوە، ڕەخنەی زۆری ئاڕاستە دەکرد و بە بینینی دووچاری خەم و خەفەت دەبوو. زۆر هەوڵمدا کە لەو بارە دووری بخەمەوە و ڕزگاریبکەم. بە خێرایی ئەو پەستییە دەڕەوییەوە و ئەو پیاوە کەتەیە دەگەڕایەوە سەرخۆشی و بەزمەکەی جارانیو دەستی دەکردە قیژوهوڕ و هەموو شتێکی دەوروبەری پەرش و بڵاودەکردەوە. بە دەنگە بەرزە زولاڵەکەی هەموو شتێکی داپۆشییبوو.

ئێمە زۆر جار بە ئاشکرا بەیەك دەگەیشتین، چونکە مێردەکەم گومانی لا پەیدا بوو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە لەگەڵ مایکۆفسکیدا زۆر بە باشی هەڵسوکەوتی دەکرد. یانشین زۆری حەز دەکرد کە هاوڕێیەتی مایکۆفسکی و هاوڕێکانی بکات. لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەهێشت کە بە تەنیا لەگەڵیدا بڕۆم. لەبەر ئەوە وام بە باشتر زانی کە پێکگەیشتنەکانمان نهێنی بێت، کە ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە ماوەی پێگەیشتنەکانمان زۆر کورت بێت.

سەرەڕای ئەوەش، مایکۆفسکی ڕۆڵێکی گەورەی لە شانۆگەری (ساڵانی لاوێتیماندا) دامیّ، دەستکەوتنی ڕۆڵێك لە شانۆی پێشکەوتووی مۆسکۆدا بەلای کچە ئەکتەرێکی لاوی وەك منەوە، ڕووداوێکی زۆر گرنگ و مەزنبوو، بەوەش کارکردنم لەگەڵیا ڕاپێچیدام.

لە سەرەتاوە، مایکۆفسکی لەبەرخاتری من گەلێك شادو دڵخۆش بوو، لەسەرئەوە چیرۆکی زۆری دروست دەکرد کە چۆن ئەو بۆ یەکەم شەوی شانۆییەکەم ئامادە دەبێ و دوای هەموو نواندنێك چەپکەگوڵم بۆ دەنێریّ، "لە کەسێکی شەیدای نادیارەوە". بەڵام دوای چەند ڕۆژێکی کەم، کە بینی زۆر سەرقاڵی شانۆگەرییەکەم، خەمبار و تووڕە بوو، ئەو ڕۆڵەی کە هەمبوو خوێندییەوە، گوتی زۆر ترسناکە و شانۆگەرییەکەشی هەروا ناونا، گوتی: ئەو هەرگیز شانۆگەرییەکەی نەخوێندووەتەوەو ناشیەویّ بیخوێنێتەوە، هەروەها گوتیشی بۆ بینینی ناچێت. ئەمانەش هەر بە بێهۆبوون. بە گشتی: پێویست ناکات ببمە کچە ئەکتەر – باشتر وایە کە واز لە شانۆ بێنم..

پەیوەندی نێوانمان تا دەهات بەرەو خراپی دەڕۆیشت، زۆر باش لەوە گەیشتم کە هەرگیز کار بەم جۆرە بەرێوە ناچێت.. ئەمەش ئەو کاتە شیاوەیە کە بڕیار و هەڵبژاردنی خۆمی تیا بدەم، لەوەش زیاتر ناتوانم کە لە درۆکردن و خۆ هەڵخەڵەتاندندا بەردەوام ببم. من تا ئێستاش ناتوانم لەوە تێبگەم، کە بۆچی لەو کاتەدا جیابوونەوەم لە یانشین بەلاوە کارێکی زۆر گران بوو. هۆکەش ئەوەنەبوو من لەوە بترسم کە گوایا مێردەکەمم لە کیس دەچێت، چونکە ئێمە بە تەواوی دوو ژیانی زۆر جیاواز لە یەکتری دەژیان.

ئەو کاتەی بووینە هاوسەری یەکتری تەمەنم حەڤدە ساڵبوو، پەیوەندی هاوڕێیەتی لە نێوانماندا هەبوو، هاوڕێ بووین، لەوە زیاتر هیچ شتێکیتر نەبوو، یانشین وەکو کیژێکی بچکۆلە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردم و گوێی بە ژیانم یا بە کارەکەم نەئەدا، وە هەروەها منیش زۆر بیرم لە ژیانی ئەو یا چی لە مێشکیا هەیە نەدەکردەوە.

بەڵام لەگەڵ مایکۆفسکیدا هەموو شتێك جیاوازبوون. پەیوەندییەکان پەیوەندییەکی ڕاستەقینەی باشبوون، دەمبینی کە لەلایەنێکی مرۆڤایەتییەوە پەرۆشمە و گوێم دەداتیّ و هەوڵدەدات بمکاتە مرۆڤێك کە "شایانی ڕێزلێگرتن بێت" بیّ گوێدانە تەمەنم – ئەو کاتە لە تەمەنی 22 ساڵیدا بووم – زۆر تامەزرۆی ئەوە بووم کە بزانم چی بەلایەوە گرنگە، من زۆرم حەز دەکرد کە

بیرۆکەکانی و کارەکانی و هەرچی دەیکات بیزانم. بەڕاستی من لە کەسایەتییەکەی و بارە دەروونییە نادیارەکانی و هەڵویستە ستەمکارەکانی کە بەرامبەرم هەیبوون دەترسام.

داواکانی مایکۆفسکی کە لە یانشین جیاببمەوە و شوو بەو بکەم و واز لە شانۆ بێنم کتوپڕ سەریان هەڵدا، لەسەرەتاکانی ساڵی 1930دا بوو، بڕیاردانم لەسەرئەوەی کە من هەر دەبمە هاوسەری بەڵام بەم خێراییە نا، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەر دوامدەخست.

لێی پرسیم: بەڵام تۆ بڵێی ئەو ڕۆژە بێت؟ ئەمەویّ دڵنیابم، وا نییە؟ بۆ ئەوەی بتوانم کە پلان بۆ ئەو هەموو کارانە دابنێم کە پێویستە جێبەجیّ بکرێت. وەڵاممدایەوە: هەروایە. پلان و کارکردن!

دەستەواژەی "پلان و کارکردن" لە نێوانماندا بوو بە وشەی نهێنی. هەر کاتێك کە لە شوێنێکی گشتیدا بووینایەو هەستی بە نا ئومێدی بکردایە لێی دەپرسیم "پلان و کارکردن؟" منیش ئەو وەڵامەم ئەدایەوە کە ترسی ئەڕەواندەوە.

"پلان و کارکردن" خۆی لەوەدا دەبینییەوە کە ئەپارتمانێك لە ماڵی نووسەران بەرامبەر شانۆی مۆسکۆی دەوڵەمەندا پەیدا بکەین، بڕیاریدا بوو کە بچینە ئەویّ.

من لەوە دڵنیام پەیوەندی نێوانمان بەرپرسیارنەبووە لە بارە دەروونییە خەماوییەکەیو مردنە پڕ لە ناسۆرەکەی، ئەو دەمە قاڵیّ ساکارانەی ڕوویدەدا شتێکی کەم بوو لەو فشارە دەروونییەی کە لەو کاتەدا بەسەریا دابارییبوو. مەزندە دەکەم کە ئەمساڵی بە نشستییەك لە کارەکەیدا دەستی پێکرد. بەڕاستی، چامە جوانەکەی "بە بەرزترین دەنگم" کە ئەوپەڕی سەرکەوتنی بەدەستهێنا، ئەو کاتە نەناسراو بوو.

مایکۆفسکی بەو نشستییەوە گویّ پێنەدانی ئەو کەسانەی کە لە کارەکانیا ڕێزی لە بیروڕایان دەگرت، دووچاری ئازارێکی زۆر بوو بووەوە دەشیزانی چۆن خۆی لەو هەموو ڕەخنەو جنێوو ڕکوکینەیە بپارێزیّ و چۆن لە کارەکەیدا ڕووبەڕووی نا ئومێدی ببێتەوە — ئەمانە هەمووی لە دەروونیا چالاکی و بووژانەوەیەکی نوێیان بۆ خەباتکردن ڕوواند، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك ئەو کەسانە بە بێدەنگی و گوێپێنەدانەوە ڕووبەڕووی کارەکەی بوونەوە هەستی بە برینێکی پڕ لە سویّ دەکرد، هەروەها باری جەستەییشی بەرەو خراپبوونی زیاتر دەچوو. بۆ ماوەی رۆژێك تا سیّ ڕۆژ لەسەریەك تای لێدەهات، لەوانەیە هۆکاری ئەوەش خۆ زۆر ماندووکردن بووبێت. شتێکی تریش هەیە، دانەری چامەکەی دەربارەی لینین و ئۆکای کە لە دەیەمین ساڵیادی شۆڕشی ئۆکتۆبەردا پێشکەشکرا دوای سیّ ساڵ لەوەدا نشستی نەهێنا کە ببینیّ وڵات بەهێزەوە بە ڕێگەی نوێیدا ئەڕوات و لە پلانی نەخشەدانانی پێنج ساڵەیدا بەرپرسە و سەرکردەو تیمارکەرە لە شۆڕشدا بۆ ئەوەی بۆ گەلەکەی ڕوونبکاتەوە کە لەسەردەمێکی گرانەوە بەرەو رۆژێکی پرشنگدار بەرەو پێشەوە ئەچن.

شتێکی زۆر ئاسانبوو کە کەسێك لەسەر سەکۆی هاندەری سۆڤێتی و پاڵەوانی سۆشیالستی دابەزێتە خوارەوە، بەڵام مایکۆفسکی ئەوەی نەکرد، وەڵامی ئەو هەموو پێشنیارانەی دایەوە کە ڕەخنەگرەکان پێشکەشییان کردبوو بۆ ئەوەی وازبهێنێت، ئەوەش بەم کۆپلەیەی خوارەوە:

لەبری ئەوە حیکایەتی شیعری دابنیّ
خۆشتر و سوودمەند تر بوو
بەڵام من پڕم لە توانا
لەلانکەدا گۆرانییەکەم کپدەکەم

(ئەو گۆرانییانەی کەلای خۆی بۆ خۆی هەڵگرتبوون، بەسەرییەوە بارێکی ئەقڵی زیادەبوون، لە نێو ڕەخنەگراندا شیعرە هاندەرەکانی بوونە قسەی پڕوپووچ)

وا مەزندە دەكەم كە پەیوەندییەكانمان بووە جۆرە چڵە پووشێك كە خۆی پێوەگرتبووەوە. وە لەو كاتەدا ئەو بیرۆكەیە لە نێو كۆنسێرڤاتیڤەكاندا بڵاوبوو كە مایكۆفسكی یەكێكە لە ساختەچییەكان و لەو ئابڕووبەرییانەدا كە لە پەیوەندیی لەگەڵ ژناندا هەیبوو كەمدەست نەبوو. بیرم دێت سەرەتا كە بەیەكدەگەیشتین و یەكتریمان دەبینی زۆر لەوانەی كە دەیانویست چاكەم لەگەڵدا بكەن، هەوڵیاندەداو ئامۆژگارییان دەكردم بۆ ئەوەی لەم بارە ڕزگارم بكەن، دەیانووت كە ئەوە پیاوێكی خراپ و ڕقاوییە، خۆپەرستە و هەر سوودی خۆی دەوێت.. تاد.. ئەمانە بەلامەوە هەر قسەی هیچ و پووچ بوون.هەرگیز كەسێكم نەدیبوو هەڵوێستی بەرامبەر بە ژنان لەگەڵ هەڵوێستی مایكۆفسكیدا چوون یەك بێت.

ئەتوانم بەبێ دوو دڵی بڵێم: مایكۆفسكی پڕ خەیاڵ و ئەندێشەكارانە بیریدەكردەوە، ئەمەش بەو واتایە نا كە خۆی نموونەیەكی باڵای ئافرەتی داهێنابێ و خۆشیویستبێ كە لە خەیاڵی خۆیدا نەخشەی كێشابێ. نەخێر، بەڵكە بەرامبەر هەموو هەڵەیەكی مرۆڤ بە پلارو توندوتیژبوو، حەزی لەو ڕەوشانەی ژنانكردووە كە خۆی بۆی دیاریكردووە و خۆیشی بۆی هەڵبژاردووە. مایكۆفسكی، هەرگیز نەیدەهێشت كە بەجێیبهێڵم تا شتێكی بە بارمتە لێوەرنەگرتمایە، وەكو هەمیشە دەیگوت: ئەموستیلەیەك، دەستەسڕێك، یان جووتێك. دەستكێش.

جارێكیان ملپێچێكی بەدیاری دامێ و كردی بە دوو كەرتەوە: كەرتێكیان بۆ من تا لە ملی بكەم، ئەویتریانی لە لۆبیانكا بە گڵۆپەكەیدا هەڵواسی، ئەیگوت ئەگەر شتێكی منی لەلابێت وا هەست دەكات كە خۆمی لەگەڵدام.

ڕۆژێكیان پێكەوە بۆ خۆشی كاغەزێنمان ئەكردو دۆڕاندم. مایكۆفسكی ناچاری كردم كەسێتێك پەرداخی خواردنەوەی بدەمێ. دوانزە پەرداخم پێشكەشكرد. پاشان دەركەوت كە ئەو پەرداخانە زوو ئەشكێن و شكاندنیان ئاسانە. وایلێهات تەنها دوانی مایەوە. مایكۆفسكی لە بارەی پەرداخەوە زۆر بڕوای بە (ئەفسانە) هەبوو، دەیگوت ئەو دوو پەرداخە نیشانەی پەیوەندییەكانمانە ئەگەر یەكێكیان شكا ئەوە مانای ئەوەیە هەموو شتێك لە نێوانماندا كۆتاییان پێدێت. لەبەرئەوە لەبەكارهێنان و شتنیان و سڕینەوەیاندا زۆر وریایان دەبوو.

ئێوارەیەكیان لە لۆبیانكا گوتی: "خۆت دەزانیت كە تۆ بەلامەوە چەندە مەزنیت و چەندیش گوێت پێدەدەم. ویستم چیی لە دەروونمایە بە شیعر بۆتی دەربڕم، بەڵام لە بارەی خۆشەویستییەوە زۆرم گوتووە بۆیە پێموایە ئەوەی هەبووبێت وتوومە. دەستیكردە خوێندنەوەی شیعرە لیریكیەكانی. لە پڕێكا تەقییەوە "گەمژەن! ئەوە ڕاستیەكەیانە، ئەوان وا دەزانن كە مایكۆفسكی تەواو بووە، و مایكۆفسكی تەنها هەر گێرە شێوێنێكە، هاندەرێكە! بێگومان من دەتوانم لە بارەی مانگ و ژنەوە بنووسم، من دەمەوێ لە بارەی ئەوانەوە بنووسم. بەڵام ئێستا ناتوانم ئەوە بكەم، چونكە تا ئێستا كاتی ئەوە نەهاتووە. گرتنەكان و قەرزەكان تا ئێستا لە پێش هەموو شتێكەوەن. بەڵام هەر زوو بەزوو وا پێویست دەكات كە لە بارەی خۆشەویستییەوە بنووسرێت! پاشان دەستی كردە خوێندنەوەی چامەكەی (بە بەرزترین دەنگم) خۆشت دەوێم؟ یان خۆشت ناوێم؟

دەستەكانم دەگوشم، و هەموو پەنجەكان ڕادەكێشم..

كاتێك كە لە خوێندنەوە بووەوە گوتی: ئەمە لە بارەی تۆوە بوو..

زۆر سەرقاڵی شانۆ بووم، لەبەرئەوە زۆر بە كەمی فلادیمیرم دەبینی. یا بۆ ماوەی زۆر كەم، من

بەدەست ئەو ڕۆڵەوە کە هەمبوو گیرم خواردبوو، چونکە هەموو کاتەکانمی داگیر کردبوو، من تووڕەبووم، نەمدەتوانی لە ئیشەکەم زیاتر بیر لە هیچ شتێکیتر بکەمەوە. فلادیمیر بە هۆی دوورکەوتنمەوە لێی تووشی دڵەڕاوکێ بوبوو، داوای لێکردم کە لە شانۆ دوور بکەومەوەو واز لە یانشین بێنم. ئەمانەش کارەکەمیان گرانتر و دژوارتر کردبوو، دەستمکردە خۆ دوورخستنەوە لێی، جارێکیان پێمگوت پڕۆڤەم هەیە، لە جیاتی ئەو لەگەڵ کەسێکیتردا چووم بۆ سینەما.

فلادیمیر بەوەیزانی. بۆ ڕۆژی دوایی خۆم و مێردەکەمی بانگهێشت کرد بۆ سێرك، ئەو شەوە پڕۆڤەیان لەسەر شانۆگەرییە ئاماژەییەکە دەکرد، کە لە بارەی ساڵی 1905 بوو، مایکۆفسکی تووڕە بوو، میزاجی تێکچوو بوو، لە پڕێکدا هەڵسایە سەر پێ و لەگەڵ یانشیندا دەستیکرد بە قسەکردن، میخائیل میخائیلۆفیچ پێویستە لەگەڵ نورادا قسە بکەم پێت ناخۆش نییە کە بە ئوتومبیلەکە بڕۆین؟ کاتێك یانشین بەرهەڵستی نەکرد زۆر حەپەسام و ئەو هەر سەیری پڕۆڤەکەی دەکرد و ئێمەش چووین بۆ لۆبیانکا و گوتی: توانای بەرگە گرتنی درۆم نەماوەو ئیتر لەوە زیاتر لێم خۆشنابێت و هەموو شتێکی نێوانمان کۆتایی هاتووە.

ئوموستیلەکەو ملپێچەکەی دامەوە و گوتی: پەرداخێکی تری مەی خواردنەوە ئەو بەیانییە شکاوە، ئەوە پێویست بوو کە ببێت، هەروەها گوتی: ئەوەی کەمابووەوە خۆی دابووی بە دیوارەکەدا و شکاندوویەتی. زۆر قسەی ناشرینی تری پێگوتم. و دەستیکرد بە گریان، پاشان فلادیمیر لێم هاتە پێشەوە و بە خۆشی کێشەکەمان یەکلاییکردەوە.

بەلاّم ئەو ئاشتبوونەوەیە زۆری نەخایاند بۆ ڕۆژی دوایی ناکۆکی لە نێوانماندا پەیدا بووەوە. هەریەکەمان ئازاری ئەویترمانی زۆردا، وام هەستکرد کە ناکۆکییەکە گەیشتووەتە ئەوپەڕی. داوام لێکرد بە تەنیا جێمبهێڵێت و لەیەکتر جیابووینەوە. ئەمە لە ڕۆژی 11ی نیساندابوو. لە ڕۆژی 12ی نیساندا ئاهەنگێکی بەیانیم هەبوو، لە پشوودا بانگیان کردمە سەر تەلەفۆن. مایکۆفسکی بە تەواوی هەڵچووبوو، گوتی لە لۆبیانکام و لە بارێکی زۆر خراپدام نەك هەر لەم دەقیقەیەدا بەڵکە بەشێوەیەکی گشتی زۆر خراپە.

هەروەها گوتی کە هەر من بە تەنیا دەتوانم یاریدەی بدەم، دیسانەوە گوتی لە نووسینگەکەی دانیشتووەو مەرەکەبدانەکەی لەبەردەمدایەو گڵۆپەکەی و کتێبەکەشی.. خۆزگەی بەوە خواست کە لەوێ بوومایە.. ئەو شتانە بۆ ئەو پێویستبوو، خۆ ئەگەر لەوێ نەبم هەموو شتێك بێ مانا و بێسوود دەمێنێتەوە. زۆر هەوڵمدا هێوری بکەمەوە و پێمگوت: هەروەها منیش ناتوانم بە بێ ئەو بژیم و پێویستە بەیەکبگەین، من دەمەوێ بیبینم و دوای نواندنەکە دەچم بۆ لای. مایکۆفسکی گوتی: نورا، بەو بۆنەیەوە: لەو نامەیەدا کە بۆ میریم نووسیوە ناوی تۆشم تیا هێناوە و پێمگوتوون کە یەکێکە لە خێزانەکەم. وا بزانم تۆ ئەوەت پێناخۆش نییە؟

ئەو کاتە هیچ تێنەگەیشتم، چونکە هەرگیز و بە هیچ جۆرێك باسی خۆکوژی بۆ نەکردووم. لەسەر ئەوەی کە ناوم لە نێو خێزانەکەیدا دەهێنێ وەلاّمم دایەوە: "ئای خوایە من نازانم لە بارەی چییەوە قسە دەکەیت! لە کوێ دەتەوێ ناوم بێنی، ناوم بێنە.. دوای نواندنەکە لە ئەپارتمانەکەیدا پێك گەیشتین، تکام لێکرد کە خەمی نەبێ من هەر دەبم بە هاوسەری، لەو ساتەدا ئەو بڕیارەمدا، لەگەڵ ئەوەشدا پێمگوت: پێویستە مرۆ بە ژیرییەوە ئەم هەموو شتانە بەیانشین بڵێت.

ئەو کاتە وام لێکرد کە گفتمبداتێ کە دەچێت بۆ لای پزیشك و لە بارەی بارە دەروونییەکەشییەوە

شتێك بكات. هەوڵیشمدا ئەگەر بۆ چەند ڕۆژێکیش بێت پشوو وەربگریت.

بیرم دێتەوە کە لە دەفتەری بیرەوەرییەکەیدا ئەو دوو ڕۆژە 13 و 14ی نیسانی تۆمارکرد. وامزانی کە مایکۆفسکی لەسەر ئەوانە لەگەڵمدا ڕێککەوتووە، بەڵام هیچی نەکرد، نەرمونیان بوو، تەنانەت شادوکامەرانیش بوو. لە ڕۆژی 13ی نیساندا هەتا ئێوارە یەکتریمان نەدی، لە کاتی شێواندا تەلەفۆنی بۆ کردم و بانگیکردم کە 14ی نیسان بچم بۆ پێشبڕکێی ئەسپسواری. پێمگوت: من لەگەڵ یانشین و ئەکتەرەکانی شانۆکەمان ڕێککەوتووین پێکەوە بچین بۆ پێشبڕکێکە و داوام لێکرد کە ڕێزی ڕێککەوتنەکەی نێوانمان بگرێت و نابێ کەسمان ئەویترمان ببینێ و نەشیەت بۆ ئەوێ.

ئەو ئێوارەیە لەگەڵ یانشیندا چووین بۆ لای کەتاییف. مایکۆفسکی لەوێ بوو، خەمۆك و سەرخۆشبوو، لەسەر مێزەکە دانیشتێن و هەوڵمان ئەدا کە بە سەیرکردنی سەیرکێشەکانمان لا بەلا بکەینەوە. ئەو ئێوارەیە جەماوەرێکی زۆر لەوێبوون. یانشین هەموو شتێکی دەزانی و چاوەڕوانی هەڵگیرسانی کارەساتێك بوو..

لە دەفتەری بیرەوەرییەکانی مایکۆفسکیدا هەریەکەمان دەستمان کردبە نووسینی تێبینییەکانمان بۆ ئەویتر. شتی زۆر خراپە و ناشرینمان بۆ یەکتری نووسی. زۆربەیان لە ڕووی نەزانینەوە بوو، کە پێویستی نەدەکرد بنووسرێن. پاشان مایکۆفسکی چووە ژوورێکیتر و لەسەر مێزەکە دانیشت و دەستیکردە خواردنەوەی شەمپانیا. بە دوایدا ڕۆیشتم و لە تەنیشتییەوە دانیشتم و یاریم بە قژی کرد و دەستم پیا هێنا. گوتی "قاچە چارە گرانەکانتم لێ دوور بخەرەوە، بێ چەند و چون وتی: هەر ئێستا لە بارەی پەیوەندییەکانمانەوە هەموو شتێك بەیانشین دەڵێت".

توند و تیژ و نەرم و نیانبوو، بەرامبەر بەو سووکایەتیانەی کە پێیدەکردم، هەستم بە ڕك و کێشە نەدەکرد، چونکە پێموابوو من هەڵسوکەوت لەگەڵ پیاوێکی کلۆڵ و نەخۆشدا دەکەم، کە ئەشێ کاری ناشرینی زۆری لێبوەشێتەوە. هەروەها زانیشم لەوانەیە گۆبەندێك بنێتەوەو ئەوەی بە پلەو پایەی نەشێت بیکات.

ئەوپەڕی توانام خستەگەڕ بۆ ئەوەی هێوری بکەمەوە. من لەگەڵیا زۆر نەرمو نیانبووم، بەڵام ئەوە زیاتر شێتگیری کردو دووچاری جۆرێك لە شێتی کرد و دەمانچەیەکی دەرهێناو گوتی کە خۆی دەکووژێ، هەڕەشەی کوشتنیشی لە من کرد و دەمانچەکەی ئاڕاستە کردم. بۆم دەرکەوت کە مانەوەم لەو شوێنەدا تووڕەییەکەی زیاتر و زیاتر دەکات. لە ڕاڕەوەکەدا و لە پڕێکا سەیرێکی دوور و درێژیکردم و داوای لێکردم کە هەردوو دەستم بخەمە سەر سەری و دەیگوت: "تۆ تا ئێستاش هەر کچێکی زۆر چاکیت.."

لە بەیانیی 14ی نیساندا مایکۆفسکی بە تەکسییەك هات بۆ لام زۆر ترسناك دەردەکەوت. ئەو ڕۆژەی مانگی نیسان کەش خۆرەتاو بوو، لە ڕاستیدا بەهارێکی ڕاستەقینە بوو.

گوتم: چەندە خۆشە، سەیری خۆرەکە بکە، پێم مەڵێ کە تۆ تا ئێستاش پڕیت لە بیرۆکەی هیچ و پووچ، با واز لە هەموو شتێك بهێنین و لە بیر خۆمانی ببەینەوە.. گفتم دەدەیتێ!؟"

وەڵامیدایەوە: من خۆر نابینم، چونکە ئێستا بەلامەوە هیچ نانوێنێ، بەڵام من ئیتر کاری گەمژەیی ناکەم، بۆم ڕوون بووەتەوە کە من ناتوانم ئەو کارانە بکەم ئەوەش لەبەردایکم چونکە دایکم تاکە کەسێکە کە گوێم پێئەدات، چاکە، لەماڵەوە باسی هەموو شتێك دەکەین.

گوتم: لە سەعات دەو نیودا پرۆڤەم هەیە و پێویستە لە کاتی دیاریکراودا لەوێ بم.

چووین بۆ لۆبیانکاو بە شۆفێری تاکسییەکەی گوت کە چاوەڕوان بکات. زۆری پێناخۆش بوو کە کاتەکەم دیاریکراو بێت، تووڕە بوو: شانۆ، دیسانەوە شانۆیە، من ڕقم لێیەتی. شانۆ بچێت بۆ دۆزەخ! من ناتوانم لەمە زیاتر دەستخەڕۆبم! من ناهێڵم بچیت بۆ ئەوێ، هەر ناهێڵم لەم ژوورە بچیتە دەرەوە. دەرگاکەی قفڵداو کلیلەکەی خستە گیرفانییەوە، سەری زۆر لێ شێوابوو، تەنانەت لە بیری چوو بوو شەپقەکەی و پاڵتۆکەی دابکەنێت. من لەسەر کورسیەکە دانیشتبووم، ئەویش لەبەر پێمدا دانیشتبوو دەستیکرد بە گریان. پاڵتۆکەی و شەپقەکەیم داکەند. دەستم هێنا بە قژیا و زۆریش هەوڵمدا هێوری بکەمەوە، بە هەنگاوی گەورە گەورەو خێرا هەروەکو ڕابکات دەهات و دەچوو، پێیگوتم بە بێئەوەی هیچ بەیانشین بڵێم، دەبێ لەو ساتەوە هەر لەو ژوورەدا بمێنمەوە و نەچمە دەرەوە. گوتی هەرگیز نابێ لە بەر ئاپارتمان چاوەڕوان بکەین پێویستیشە هەر لە ئێستاوە دەست لە شانۆ هەڵبگرم. لەو ڕۆژەدا هیچ پرۆڤەیەك نییە، خۆی دەچێ بۆ شانۆ و پێیان دەڵێت: پێویست ناکات چاوەڕوانی هاتنم بکەن. شانۆ دەتوانێت بەبێ من کاری خۆی جێبەجێ بکات. ئەو خۆی قسە لەگەڵ یانشیندا دەکات و ئیتر جارێکیتر چاوم پێیناکەوێتەوە. و هەر ئێستا دەرگاکەم لەسەر دادەخات و هەر خۆشی هەموو کارەکانی شانۆ ڕێکدەخات و ئەوەی پێویستە بۆ ژیانی هەردووکمان دەیکرێت و بە تەواوی هەرچیم پێویستە لە ماڵدا دەمبێت و پێویستە لەوە نەترسم کە واز لە شانۆ بهێنم، ژیانم لە هەموو شتە پێویستییەکانییەوە تا ساکارترین چرچ و لۆچەکانی گۆرەوییەکانم بە بێ هیچ ساردبوونەوەیەك جێگەی گوێ پێدانی دەبێت. پێویستیشە جیاوازی نێوان تەمەنمان هیچ جێگەی مەترسیم نەبێت. دەتوانێ کە لاوێکی ڕووخۆش و زەوقلی بێت منیش ئەوە دەزانم. وا نییە؟ دەشزانم ئەوەی کە دوێنێ ئێوارە ڕوویدا قێزەون بوو، ئەوە جارێکی تر هەرگیز دووبارە نابێتەوە. وەڵامم دایەوە کە من خۆشم دەوێت و هەر لەگەڵیدا دەبم، بەڵام ناتوانم هەر بەمجۆرە بمێنمەوە بەبێئەوەی بەیانشین بڵێم شانازی پێوە دەکەم و من وەکو مرۆڤێك ڕێز لە مێردەکەم دەگرم و ناتوانم ئەو کارەی لەگەڵدا بکەم. وە من واز لە شانۆ ناهێنم و ناتوانم کاری وا بکەم. ئەو چۆن ناتوانێ لەوە تێبگات کە من ئەگەر وازم لە شانۆ هێناو وازم لە کارەکەم هێنا هیچ شتێك ناتوانێ ئەو بۆشاییەم بۆ پڕ بکاتەوە کە لە ژیانما دروستیدەکات. ئەمەش کارەکان ئاڵۆزتر و گرانتر دەکەن بە تایبەتی لە پێش هەموو شتێکدا بەرامبەر بە خۆی. لەبەرئەم هۆکارە ساکارانە پێویستە لەسەرم بچم بۆ پرۆڤەکانم. چونکە ئەمە ئەرکی سەرشانمە و دوای تەواوبوونی پرۆڤەکان دەچمەوە بۆ ماڵەوە. هەموو شتێك بەیانشین دەڵێم و هەر ئەو ئێوارەیە دەگەڕێمەوە بۆ ئەپارتمانەکەی. مایکۆفسکی ئەوەی بەلاوە پەسەند نەبوو، لەسەر ئەوە سوور بوو کە هەموو شتێك دەبێ بە خێرایی و یەکسەریی جێبەجێ بکرێت. جارێکیتریش پێم گوتەوە کە ناتوانم بەو شێوەیە ئەو کارە جێبەجێبکەم.

لێی پرسیم: کەواتە تۆ دەچیت بۆ پرۆڤە کردن، وا نییە؟

گوتم: بەڵێ، من دەڕۆم.

—یانشینیش دەبینی؟

—دەی بینم.

—هەروا؟! کەواتە بڕۆ، هەر ئێستا بڕۆ.

پێمگوت: هێشتا کات زووە. دوای بیست دەقیقەی تر دەڕۆم.

—نەخێر! هەر ئێستا بڕۆ!!.

لێم پرسی: بەڵام ئەمڕۆ دەتبینمەوە، وا نییە؟

—نازانم.

—بەڵام خۆ بەلایەنی کەمەوە لە سەعات پێنجدا تەلەفۆنم بۆ دەکەیت؟

—بەڵێ، تەلەفۆنت بۆ دەکەم.

—دیسانەوە بە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، ڕایکرد بۆ لای کتێبخانەکە، گوێم لە خشەخشی کاغەزەکان بوو، بەڵام لەبەرئەوەی بەرچاوی گرتبووم هیچم نەبینی.

ئێستا بۆم ئاشکرابوو کە ئەو دوو پەڕەیەی ڕۆژنامەکەی دڕاندبوو کە بەرواری 13 و 14ی مانگی پێوە بوو، پاشان چەکمەجەیەکی ڕاکێشا و پاشان دایخستەوە، دەستیکردەوە بە هاتووچۆکردن بە ژوورەکەدا، گوتم: تا دەرگاکە بەرێم ناکەی؟ لێم هاتە پێشەوەو ماچیکردم، دەنگی هێمن و لەسەرخۆبوو.

—نەخێر، ئەی کچەکەم، خۆت بە تەنها بڕۆ.. خەمی منت نەبێ.. بزەیەك گرتی و لەسەری ڕۆیشت، سەردانتدەکەم. پارەی تاکسیت پێیە؟

—نەخێر.

بیست ڕۆبڵی دامێ.

—تەلەفۆنم بۆ دەکەیت، وا نییە؟

—تەلەفۆنت بۆ دەکەم، بۆت دەکەم.

چوومە دەرەوە و چەند هەنگاوێك بەرەو دەرگای دەرەوە ڕۆیشتم. گوێم لە دەنگی تەقەیەکبوو.

دنیا لەبەرچاوم تاریکبوو، بەبێ ئامانج بە هۆڵەکەدا دەستمکرد بە ڕاکردن. نەمتوانی کە دەرگاکە بکەمەوە، وام هاتە بەرچاو کە پێش ئەوەی کە بوێرم بچمە ژوورەوە کاتێکی زۆر تێپەڕیوە.

بەڕاستی بە خێرایی برووسکە ئاسا گەڕامەوە، تا ئەو کاتەش دووکەڵەکە هەر لە لوولەی دەمانچەکەوە دەردەچوو.

مایکۆفسکی لەسەر فەرشەکە کەوتبوو، هەردوو باڵی بڵاوکردبووەوە، پەڵەیەك خوێنی بچووك بەسەر سنگییەوە بوو.

بیرم دێتەوە ڕامکردە لایەوە، بێ پچڕان هەر ئەمەم دووبارە دەکردەوە: چیتکرد؟

هەردووچاوی کرابووەوە، یەکسەر سەیری دەکردم و هەوڵی ئەدا کە سەری بەرز بکاتەوە. وا دەردەکەوت کە ئەیەوێ شتێکم پێبڵێت. بەڵام ژیان لە چاوەکانییەوە دەرچوو، ڕووی و ملی سووری تۆخ بوون، پاشان سەری بە دوادا کەوت و ڕەنگی تیا نەما.

خەڵك بەڕاکردن هاتن. یەکێك تەلەفۆنی دەکرد، یەکێکی تر گوتی: ڕاکە و پێشوازی لە ئوتومبیلی فریاکەوتنەکە بکە! بەبێ بیرکردنەوە بە ڕاکردن چوومە دەرەوە و بازم دایە سەر پلیکانەی ئوتومبیلی فریاکەوتنەکە، کە هاتبوو، پاشان بەڕاکردن گەڕامەوە و بە پەیژەکەدا سەرکەوتم. لەسەر پەیژەکە یەکێك گوتی: کات بەسەرچوو، مرد.. ئەو ساڵە ناخۆشترین و خۆشترین ساڵێك بوو لە ژیانمدا.

## سەرچاوە

لە "الثقافة الاجنبية"

ل 210–220 ساڵی 2004، ژ 1.

# گفتوگۆ لەگەڵ نوام چۆمسکی دا

## ئەوەی لەخوارەوە دێت، گفتوگۆی بڵاوکراوەی (فرایتاگ)ی ئەڵمانیزمانە لەگەڵ (نوام چۆمسکی)ی نوسەری بەتوانای ئەمریکایی.

**لە فارسییەوە: کارزان محەمەد**

**فرایتاگ: دەوڵەتی نەتەوەییو کۆنسێرنە پۆست نەتەوەییەکان هەردووکیان بەگرنگترین ستراکتورەکانی دەسەڵات دەژمێردرێن لەچەرخی نوێدا. وەرە لە دەوڵەتی نەتەوەییەوە دەست پێبکەین، بەڕاست لەڕووی مێژووییەوە هەڵهاتنی دەزگایەك کە ئێمە بەدەوڵەتی نەتەوەیی ناوزەدی دەکەین، چۆن ڕووی دا؟**

–دەوڵەتی نەتەوەیی بەگشتی داهێنانێکی ئەوروپاییە. هەڵبەتە لەشوێنەکانیتریشدا دەرکەوتەیەکی لەوشێوەیە هەبووە، بەڵام دەوڵەتی نەتەوەیی بەشێوە مۆدێرنەکەی، بەکردەوە تەنها بەدرێژایی سەدەکان لەئەوروپادا فۆرمەڵە بوو. بوونیشی کارێکی سەپێنراو بوو، چونکە دەوڵەتی نەتەوەیی ئەگەر بەوردی لێی بنۆڕین، تەنها مومکین بوو لەڕێگەی ئاستێکی باڵای زۆرەملێو توندوتیژییەوە پیادە بکرێت. لەبەرئەم فاکتەرە سەرەکییەشە کە ئەوروپا لەچەند سەدەیەکی درێژخایەندا توندوتیژترین ناوچەی جیهان بوو. هەوڵ درا کلتورە زۆرجیاوازەکانیش بەتوندوتیژیو زۆرەملێوە سیستەمێکی نەتەوەیی دەوڵەتیانەیان بەسەردا بسەپێنرێت کە ئەگەر کەمێ سەرنجیان لێ بدرێت هیچ پەیوەندییەکیشیان بەم ستراکتورە دەستکردەوە نەبوو،.

**فرایتاگ: ئایا لەبنەڕەتدا لەبەرئەم ئیرادە نەگۆڕە نەبوو کە ئەم تێگەیشتنە توانی لەناوچەکانیتری جیهاندا بڵاوببێتەوە؟**

نوام چۆمسکی: ئەوروپا کلتورێکی دڕندەیی هێنایەئارا کە هەم چانسی بەدەوڵەتە نەتەوەییەکانی ئەوروپا دەدا جیهان دیل بکەنو هەم لەناوچە داگیرکراوەکاندا دەوڵەتی نەتەوەیی بهێننە

سەر کورسی، پاشان ئەو شوێنەش خەسڵەتێکی زۆرملێی و توندوتیژیی هەبوو. لەمەشدا چەند ناوچەیەکی جیا هەن ئەم ڕێسایانەیان بەسەردا ناسەپێت و لەلایەن ئەوروپییەکانەوە کۆلۆنی کراون و خەڵکی ئەو ناوچانە بەئاسانی کوشتوبڕ کران. هەروەها لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو لەئوسترالیا، بەم شێوازە لەو شوێنانەدا بەکردەوە کۆمەڵگای هاوشێوە هاتنەئارا.

لەلایەکیترەوە لەئەوروپا، بەلایەنی کەمەوە دوای (1945) ئەم تیۆرەیە زاڵ بوو کە بەردەوامی ئەم گەمەیە بەترس و ترسناکی دەوڵەتی نەتەوەییەوە، ڕەنگە تەنها ببێتەهۆی خۆ وێرانکردن. لەئەنجامدا لە (1945) بەدواوە لەئەوروپادا ئاشتی بەرپا بوو... چیدی ئەڵمانییەکان و فەرەنسییەکان لەڕیشەهەڵکێشان و سەرکوتکردنی خودی ئەوی دی بەئامانجی کۆتایی خۆیان نازانن.

***تاهەنوکە ئێمە دەربارەی دەوڵەت قسەمان کرد، ڕەنگدانەوەی ئابوریانەی ئەم گۆڕانە کە تۆ خستەڕوو، چی بوو؟**

– بەڕابوردنی کات، لەگەڵ سیستەمەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی، چەندین چەشن و دابەشکاریی هاوکارییە ئابورییەکان فۆرمەڵە بوو، و نزیکەی سەد ساڵ لەمەوپێش گۆڕا بۆ هەمان ئەو شتەی کە ئێمە ئەمڕۆ وەك سەرمایەداریی کۆنسێرنە مۆدێرنەکان دەیناسین. بەشێکی لەبەرچاوی ئەم ستراکتورانە لەبەر ڕۆشنایی بڕیارە یاساییەکان –نەك پارلەمانییەکان– دروست کران و بەڕێژەیەکی زۆر لەگەڵ دەوڵەتە بەهێزەکاندا ئاوێتە بوون. لەهەمان ڕووەوە ئەمڕۆ دەتوانرێ دەوڵەتانی (گروپی هەشت) کە هەنوکە لە (گلینگ)ی سکۆتلەند کۆبوونەوە دەکەن، لەڕاستیدا بە (گروپی یەك یا گروپی سێ)ش ناودەبرێت، چونکە بەشێك لەم دەوڵەتانە لەڕاستیدا ڕۆڵێکی مەزن ناگێڕن. بەکردەوە ناتوانرێ (گروپی هەشت) لە سیستەمە کۆنسێرنە فرەنەتەوەییەکان جیا بکرێتەوە کە هەم بەم دەوڵەتانە پشتئەستورن و بەئەوانەوە وابەستەن و هەم دەسەڵاتیان بەسەردا هەیە.

لەمبارەیەوە (جیمس مۆدیسۆن) پتر لە دووسەد ساڵ لەمەوپێش، لەسەرەتاکانی قۆناغی دەستپێکردنی سەرمایەداریی مۆدێرندا، پەیوەندی ئابوری بە دەوڵەتەوە شرۆڤە دەکات. کاتێك دەڵێت: ناوەندە ئابورییەکان (ئامرازی کارو زۆردارەکان)ی دەوڵەتن. بەشێکی گەورەی ڕووداوەکانی جیهان، ئەمڕۆ ئەم پەیوەندییە دەستنیشانی دەکات.

**فرایتاگ: ئەمە ئێستا بەتایبەتی لەمەڕ کۆمپانیا داراییەکان ڕاستە**

نوام چۆمسکی: لەبەرئەوەی ئەم کارخانانە خاوەنی کۆمەڵێك مافن کە لەمافە سروشتییەکانیان زۆر زیاترە، ئەوانە هەردەمێننەوە، زۆر بەهێزن و لەڕووی یاساییەوە ئەرکی سەرشانیانە ڕەفتارێکی نەخۆشانە بکەن، مەسەلەکە زۆر سادەیەو لەسەر شێوەی مۆدێرنی تۆتالیتارییەتە.

**فرایتاگ: لەسەرحسابی لەناوچوونی ململانێ.**

– ئەگەر کۆنسێرنە پۆستنەتەوەییەکان بخەینەژێرباری سەرنجەوە، ئەوکاتە لەبنەڕەتدا ململانێی ڕاستەقینە ئیتر لەکاردا نییە لەبەرئەوەی ئەوانە بەتوندی لەگەڵ یەکتردا ئاوێتەن. تەنها هێندە بەسە نمونەی (زیمینس، ئەی بی ئێم و توشیبا)

لەبەرچاو بگیرێت کە پرۆژەی هاوبەشیان لەگەڵ یەکتردا هەیە. ئەمە لەکاتێکدایە کە لەڕاستیدا ئەم کۆنسێرنانە بەرێژەیەکی زۆر وابەستەی سەربەخۆیین. چونکە دینامیکییەتی ئابوری مۆدێرن لەسەربنەمای کەرتی دەوڵەتی دەبزوێت، نەك کەرتی تایبەتی. کەرتێکی گەورەی ئەوشتەی ئەمڕۆ بەئابوری نوێ ناوزەد دەکرێت، بەبودجەی دەوڵەت و لەسەرئەرکی دەوڵەت کامڵ کراوەو دەکرێت: کۆمپیوتەر، کۆی بواری ئەلیکترۆنییەکان، هەواڵگریی، ئینتەرنێت، لێزەرو...زۆربەی شتگەلەکانی تر.

**فرایتاگ: ئایا بەتێڕوانینی تۆ جیاوازی بنچینەیی نێوان ناوەندی دارایی ئەڵمانی و کۆنسێرنێکی ئینگلیزیدا نییە؟ بۆ نمونە، لەم دوادواییەدا بانکی ئەڵمانی دوای ئەوەی کە قازانجی ساڵی ڕابردووی خۆی بەپتر لەبڕی (2,5) ملیارد یۆرۆ ڕاگەیاند، ڕایگەیاند دەیەوێت لەماوەی ساڵێکدا (6,000) هەزار لەکارمەندەکانی دەربکات. لەمڕووەوە ئەم بانکە لەلایەن گشت توێژە سیاسییەکانی ئەڵمانیاوە بەتوندی مەحکوم کرا. وترا ئەم بانکە لەڕاستیدا چیتر مافی ئەوەی نییە خۆی بە (بانکی ئەڵمانیا) ناوزەد بکات، ئەم ڕووداوە (نائەڵمانی)یەو...**

—بەڵێ، لەوێ مەسەلەگەلێکی پێکەنیناوی و سەرسوڕهێنەر وترا.

**فرایتاگ: بەڵام بانکی ئەڵمانیا بەرلەهەرشتێك بەهۆی نەبوونی هەستی بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتییەوە سەرزەنشت کرا، لەپشت ئەم باسەوە بەکردەوە ئەم پرسیارە لەئارادابوو. ئایا دەستەواژەی (کۆنسێرن بەهەستی بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتییەوە) لەبنەڕەتدا ماناو چەمکێکی هەیە؟**

—هەڵبەتە، بەڵام تەنها بەومانایەی کە لەبارەی دیکتاتۆرێکەوە قسە بکرێت. بەکورتی واباشترە دیکتاتۆرێکی نەرمڕەو بێت تا توندوتیژ. کاتێك دەبێ دیکتاتۆر هەبێت ئەوا واباشترە یەکێك بێت کە لەناو منداڵانی هەژاردا شیرینی ببەخشێتەوە. بەڵام ئەمە هیچ گۆڕانێك لەمەدا دروست ناکات کە مرۆڤ لەدیکتاتۆریدا دەژی. هەربۆیەشە کۆنسێرنێکی خاوەن هەستی بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی مومکینە بتوانرێ ناچار بکرێت کارگەلێك بکات کە بۆ مرۆڤەکان بەسود بێت.

***فرایتاگ: ئەمڕۆ لەلایەن سیاسەتمەدارانی هەموو لایەنە سیاسییەکانەوە تەنها دەبیسترێت: ئێمە زۆر حەزدەکەین کارێك بکەین، بەڵام بەداخەوە هێزی کۆنسێرنەکان زاڵە.**

— ئەمە بەئانقەستە. ڕژێم لەدوای جەنگ لەسەر ئەم بنەمایە داڕێژرابۆوە کە ڕێگەی بە دەوڵەت دەدا چاودێریی گۆڕانکارییەکانی سەرمایە بکات تا ڕێگە لەسەرمایەدارەگوزارە تایبەتییەکان، بانکەکان و کۆنسێرنە مەزنەکان بگرێت تانەبنە دەسەڵاتدار بەسەر ئابورییە نەتەوەییەکاندا. سیاسەتەکانی نرخدانان لەلایەن دەوڵەتەوە دیاری کرابوو تا ڕێگە لە گەمەڕەشەکان بگرێت.

***دەوڵەت دوای ئەم گۆڕانە چووە چ بارودۆخێکەوە؟**

—بارودۆخی دەوڵەت دەتوانرێ لەبەرنامە نوێیە ئابورییەکانی ئەمڕۆدا ببینرێت. ئەگەر بنۆڕیت، پەی بەوە دەبەیت کە ئەم بەرنامانە لەناوبردنی بۆنە دیموکراسییەکانیان کردۆتەئامانج. هێندە بەسە بیر لەو توانستە بێسنورانە بکەیتەوە کە لەژێردەسەڵاتی سەرمایەدایە، یا بەو ڕەوەندە

بەکەرتی تایبەتکردنانەی کە بەپێی پێناسەکەی، دیموکراسی بەخاك دەسپێرێت. لەبەرئەوەی ئەوانە بڕیارە گرنگەکان دەخەنەدەرەوەی بوارە گشتییەکان. ئەگەر هەنوکە خزمەتگوزاریی گشتی لەژێرچاودێری کەرتی تایبەتدا دابنێین، بازنەی کاری دەوڵەت کەم دەبێتەوە. ئەگەر لەئەڵمانیا هەمیشە باس لە بێتوانایی دەوڵەت دەکرێت، ئەوا کەمتەرخەمییەکە خودی دەوڵەتە، دەوڵەت بەم شێوازەی کردووە.

***فرایناگ: ئایا هەنوکە دەکرێ ئەم ڕەوەندە بگێردرێتەوە؟**

– ئاشکرایە کە دەتوانرێ ئەم ڕەوەندە بگێڕدرێتەوە. بەکورتی، ئەم هەڵوێستە ڕادیکاڵە سەیروسەرسوڕهێنەر نییە کاتێ بوترێ: سیستەمی بریتۆن ۆۆدز دووبارە بەرقەرار بکەینەوە. ئاشکرایە کە هیچ کەس نایەوێت بەتەواوەتی بۆ هەمان سیستەم بگەڕێتەوە، بەڵام ڕەوەندێك ئامادەباش بکرێت کە سیمبولەکانی دووبارە بەرقەرار بکاتەوە. کۆنسێرنەکان بەهەمانشێوە بوونیان پێویستو زەروورییە کە شێوازەکانیتری زۆرداریی پێویستی پێیەتی.

## سەرچاوە

سایتی عصر نو، 27ی ئۆکتۆبەری 2005.

# ترسەکە

گی. دی. مۆپسانت

لە ئینگلیزییەوە: ئومێد فایەق قەرەداغی

تۆ ئەڵێیت کە ناتوانیت بە چەشنێکی شیاو تێبگەیت، و منیش باوەڕم پێتە پێتوایە کە ئەقڵی خۆم لە دەست ئەدەم؟ ڕەنگە لە دەستی بدەم، بەڵام هاوڕێی ئازیزم لەبەر هەندێ هۆی دی نەك ئەوانەی تۆ بیریان لێ دەکەیتەوە.

بەڵێ من دەمەوێت ژن بهێنم، وە پێشت ئەڵێم چی وای لێکردووم ئەم هەنگاوە هەڵگرم.

ڕەنگە ئەوەش بڵێم کە من زۆر کەم لە بارەی ئەو کچەوە دەزانم کە بەیانی دەبێتە خێزانم، تەنها چوار پێنج جاریش بینیومە. دەزانم کە هیچ شتێکی خراپ نییە لە بارەیەوە ئەوەش بەسە بۆ مەبەستەکەی من. کچە خنجیلانە و سپی و پتەوە، لەبەرئەوە بە دڵنیاییەوە دوو سبەی بە پەرۆشەوە خوازیاری ژنێکی باڵا بەرزی ئەسمەری باریك ئەبم. ئەو دەوڵەمەند نییەو، لە چینەکانی نێوەندە. کچێکە وەها کە ڕەنگە بە گرۆس بیدۆزیتەوە، زۆر گونجاوە بۆ شوکردن، هیچ کەموکورییەکی دیاری نییە وە بەتایبەتیش هیچ خاسیەتێکی زەقی تیانییە. خەڵکیش لە بارەیەوە دەڵێن:

"ملیلاجوڵی کچێکی زۆر جوانە" وە بەیانی دەڵێن "ئەو ئافرەتە جوانە، مادام رایمۆن، چییە"

بە کورتی ئەو یەکێکە لەو ژمارە فراوانەی کچان کە کەسێك دڵخۆشە بێت بەوەی کە ببێتە هاوسەری، هەتا ئەو ساتە دێت کە دەبینیت وای لێدێت هەموو ژنانی دی پێ پەسەند تربێت لەو ژنە دیاریکراوەی کە کردوویەتیە هاوسەری.

پێم دەڵێن "باشە، لە دونیا بۆچی ژنت هێنا؟" حەزدەکەم ڕێك ئەو هۆکارە نامۆو بەڕواڵەت نەشیاوەت پێ بڵێم کە لەسەر ئەم کردەوە بێ ئەقڵانە هانیدام، ڕاستیەکەی ئەوەیە کە لە تەنهایی ئەترسم. نازانم چۆن پێتی بڵێم یان وات لێ بکەم لێم تێ بگەیت، بەڵام حاڵی هۆشم ئەوەندە شپرزەیە کە ڕەنگە بەزەیت پیامدا بێتەوە و بە کەمم بزانیت.

نامەوێت چیتر لە شەودا تەنها بم، دەمەوێت هەست بەوە بکەم کە کەسێك لێم نزیکە، دەستم لێ دەدات، بوونێکە کە دەتوانێت بدوێت و شتێك بڵێت: ئیدی هەرچی بێت گرنگ نییە.

خوازیارم بتوانم کەسێك لە تەنیشتما خەبەر بکەمەوە هەتا بتوانم پرسیاری لە پڕ بکەم تەنانەت پرسیارێکی گەمژانە، گەر هەستم بە کەمبوونم کرد، هەتا بشتوانم دەنگی مرۆڤێك بیستم و هەست بکەم کە کەسێکی بە ئاگا لە نزیکمە، کەسێك کە ئەقڵی لە کاردایە، هەتاکو ساتێك کە بە دوو دڵییەوە مۆمەکە دادەگیرسێنم ڕوخساری کەسێك ببینم لە تەنیشتمدا.. چونکە.. چونکە.. شەرمدەکەم کە پێی لێنێم.. چونکە لە تەنها بوون ئەترسم.

ئاه، هێشتا لێم تێناگەیت.

من لە هیچ مەترسییەك ناترسم. گەر پیاوێك ویستی بێتە نێو ماڵەکەم دەبێت بەبێ لەرزین بیکوژم. نە لە تارمایی ئەترسم و نە باوەڕیشم بە سەروو سروشت هەیە. لە خەڵکانی مردوش ناترسم، چونکە باوەڕم بە لە ناوچوونی هەمیشەیی هەموو بوونەوەرێك هەیە کە لەسەر ڕووی ئەم زەوییە دیار نامێنێت.

باشە.. بەڵێ.. باشە، پێویستە بوترێت کە من لە خۆم ئەترسم، لەو هەستکردنە سامناکە بە ترسێکی نادیار ئەترسم.گەر پێت خۆشە دەتوانیت پێ بکەنیت. سامناکە و منیش ناتوانم بەسەریا زاڵبم. لە دیوارەکان، لە کەلو پەلەکان، لە شتە ئاساییەکان ئەترسم کە تەواو بە جۆرێك لە ژیانی گیانەوەرانە دەژێنەوە، کە من دوو دڵ دەبم.

لەسەرو هەموویانەوە، لەبیرکردنەوە سامناکەکانی خۆشم ئەترسم، لە هۆشم کە وا دیارە خەریکە بەجێم بهێڵێت و بەهۆی مۆتەکەیەکی لێڵ و نادیارەوە بڕفێنرێت.

لە سەرەتادا هەستم بە نا ئاسوودەییەکی وێڵ کرد لە مێشکما کە بووە هۆی ئەوەی لەرزێکی سارد سەراپام بگرێت. سەیری چواردەورم کرد، بێگومان هیچی لێ نەبوو کە ببینرێت، خوازیاربووم کە شتێکی لێ بووایە، گرنگ نییە چی دەبوو هەر شتێکی بەرجەستە بووایە. بە تەنها زۆر ترسام چونکە نەمئەتوانی لەم ترسەی خۆم تێبگەم.

گەر قسە ئەکەم، لە دەنگی خۆم ئەترسم. گەر دەگەڕێم لەوە ئەترسم کە ئەزانم هیچ شتێك نییە لە پشت دەرگاکەوە، لە پشت پەردەکانەوە، لە دۆلابی جلوبەرگەکەدا، یان لە ژێر جێگاکەمدا. هێشتاش هەر دڵنیام کە لە هیچ شوێنێك هیچ نییەو، بەخێرایی بە دەوری خۆمدا لادەکەمەوە چونکە لەوە دەترسم کە لە دوامەوەیە ئەگەرچی هیچ شتێکی لێ نییە و دەشزانم.

ماخۆلانم توشەبێت، وا هەستەکەم کە ترسەکەم زیاد دەکات هەر بۆیە لە ژوورەکەی خۆمدا خۆم بەندەکەم، دەچمە نێو جێگاو لە ژێر پێخەفەکاندا خۆم دەشارمەوە، لەویا خۆم کرژەکەم و دەچمەوەیەك و چاوەکانم بە نائومێدی لێك ئەنێم بەم چەشنە بۆ ساتێکی زۆر ئەمینمەوە، یادم دەکەوێتەوە کە مۆمەکە لەسەر مێزەکەی تەنیشتم دەسوتێت و پێویستە بیکوژێنمەوە، کەچی هێشتا ناوێرم ئەو کارە بکەم.

زۆر سامناکە بەم شێوە بێت، وا نییە؟

پێشتر هەستم بە هیچ لەوانە نەکردووە. تەواو هێمن دەهاتمەوە ماڵەوەو، لە خانووەکەمدا دەچوومە سەرو دەهاتمە خوارەوە بەبێ ئەوەی هیچ شتێك ئارامی خەیاڵم بشێوێنێت. هیچ کەسێك بە منی نەگوتبوو کە دەبێت پەتای.. لەبەرئەوەی ناتوانم ناوێکی تری لێ بنێم.. ترسێکی یەکجار ئەستەم توشم ببێت، دەردێکی وەها گەمژانە و ترسناکی وەك ئەوە، دەنا دەبوو بێ سێو دوو پێکەنیمایە. بە دڵنیاییەوە من لە تاریکیدا لە کرانەوەی دەرگاکە نە ئەترسام، دەچوومە نێو جێگا بە ئارامی و بەبێ ئەوەی داشی بخەم و

هەرگیزیش لە شەودا هەڵنەساوم تا دڵنیابم کە بە قایمی داخراوە.

ساڵی ڕابردوو لە ئێوارەیەکی تەڕی پایزدا بەشێوەیەکی زۆر نامۆ دەستی پێکرد. کاتێک خزمەتکارەکەم ژوورەکەی جێهێشتبوو، دوای ئەوەی نانی ئێوارەم خوارد لە خۆم پرسی دەمەوێت چی بکەم بۆ چەند جارێک لە ماڵەکەمدا چوومە سەرو هاتمە خوارێ، بەبێ هیچ هۆیەک هەستم بە ماندوێتی دەکرد، نەمئەتوانی کاربکەمو، تەنانەت توانای خوێندنەوەشم نەبوو. بارانێکی ورد دەهاتە خوارێ و هەستم بە دڵتەنگی کرد، بوومە نێچیرێکی یەکێک لەو نۆبانەی بێ ئومێدی بەبێ هۆیەکی دیار کە هەرچییەک بێت وامان لێ بکات قایل بین بگرین، بدوێین هەتا بەسەر بۆچوونە خەمۆککەرەکانماندا زاڵبین.

هەستم کرد کە تەنهام و ژوورەکانم زۆر چۆڵتر دەردەکەوتن لەوەی کە پێشتر هەبوون، منیش لە چەقی ئەو چۆڵەوانییە بێ کۆتایی و تێکشکێنەرەدابووم. چیم بکردایە؟ دانیشتم، بەڵام جۆرێک لەبێ ئارامی شێتانە وادیار بوو کار لە قاچەکانم دەکات، لەبەرئەوە هەستام و دووبارە دەستم کردەوە بە گەڕان. ڕەنگە تام بووبێت چونکە دەستەکانم، کە هەروەک کەسێک کە لەسەرخۆ پیاسە بکات، خستبوومە پشت قنگم وەها دیاربوو یەکدی دەسوتێنن. پاشان لەرزێکی سارد بە پشتمدا هاتە خوارێ و پێموابوو کە ڕەنگە هەوا شێدارە کە هاتبێتە نێو ژوورەکەمەوە، لەبەرئەوە ئەو ساڵە بۆ یەکەم جار ئاگرەکەم داگیرساند، دووبارە دانیشتمەوە و چاوم خستە سەر بڵێسەکانی. بەڵام دەست بەجێ هەستم کرد کە ڕەنگە نەتوانم هێمن بم، هەر بۆیە دووبارە هەستامەوە و بڕیارمدا بچمە دەرەوە. بەڵکو بێمەوە سەرخۆم و بەڵکو هاوڕێیەکیش بدۆزمەوە کە هاوەڵیم بکات.

نەمتوانی کەس بدۆزمەوە، لەبەرئەوە بەرەو شەقامی سەرەکی شار ڕۆشتم بۆ دیدەنی و گەشتن بە ناسیاوێك یان کەسانێکی دی لەوێندەرێ.

هەموو جێگایەك خراپ بوو، شۆستە تەڕەکە لە نێو ڕوناکیەکەدا بریسکەی دەدایەوە، لە کاتێکدا گەرمایییە خنکێنەرەکەی ئەو بارانە هەست پێنەکراوە بە زۆری لەسەر شەقامەکان کۆ بووبوەوە و وا دیار بوو ڕووناکی چراکانی لێڵ کردووە.

بەهێمنی لە ڕۆشتن بەردەوام بووم و بە خۆمم گوت "کەسێك نادۆزمەوە کە بۆی بدوێم"

ڕوانیمە نێو چەند قاوەخانە هەر لە مۆدینەوە تا دەگاتە فاوبۆرگ پۆیسۆنیەر و، زۆر کەسی ڕواڵەت غەمبارم بینی کە لەسەر مێزەکان دانیشتبوون، وا دەردەکەوتن کە تەنانەت توانای تەواویشیان نەمابوو بۆ تەواوکردنی ئەو شیرە مەنییانەش کە داوایان کردبوو.

بۆ کاتێکی دوورو درێژ بێ مەبەستانە سەروخوار ڕێگام کرد و دەوروبەری نیوەی شەو گەڕامەوە بۆ ماڵ. زۆر بێ دەنگ و زۆر ماندوو بووم. دەرگاوانەکەم دەستبەجێ دەرگاکەی کردەوە و تەواو نائاسایی بوو بەلایەوە، من وام هەست کرد کە هەر ئێستا ڕەنگە نیشتەجێیەکی دی هاتبێتە ژورەوە.

کاتێك دەچمە دەرەوە هەمیشە دەرگای ژورەکەم دوو سوڕدادەخەم، کە بینیم تەنها داخراوە سەرسامی کردم، بەڵام وتم کە ڕەنگە ئێوارە هەندێ نامەم بۆ هێنرابێتە سەرەوە.

ڕۆشتمە ژورەوەو بینیم ئاگرەکەم هێشتا دەسوتێت لەبەرئەوە ژورەکەی کەمێك ڕۆشن کردبوەوەو، کاتێکیش خەریکی دەرهێنانی مۆمێك

بووم، تێبینیم کرد کەسێك لە نزیك ئاگرەکە لەسەر کورسییەکەم دانیشتووە، و پشتی لە منە و قاچەکانی گەرم دەکاتەوە.

بە کەمترین پلەش نەترسام، زۆر ئاسایی پێم وابوو کە برادەرێك یان کەسێکی دی هاتووەتە دیدەنیم. هیچ گومانیشم نەبوو لەو باربەرەی کە کلیلەکەی خۆیم دایەو پێم گوت من دەچمە دەرەوە. لە چرکە ساتێکدا هەموو دۆخەکانی کاتی گەڕانەوەکەمم یادکەوتەوە، کە چۆن دەرگای دەرەوە یەکسەر کرایەوەو، کە دەرگای ژورەکەی خۆم تەنها بە ئەڵقەڕێز داخرابوو و قوفڵ نەکرابوو.

نەمتوانی هیچ شوێنێکی برادەرەکەم ببینم جگە لە سەری و، بە دڵنیاییەوە کاتێك چاوەڕوانی منی کردبوو خەو بردبوویەوە، بۆیە چووم بۆ لای هەتا هەڵیسێنم. تەواو بەڕوونی بینیم، قۆڵی ڕاستی شۆڕبووبووەوە و لاقەکانی لێك ئاڵاندبوو، شوێنی سەری کە کەمێك لار بووبووەوە بۆ لای چەپی کورسیەکە وای نیشاندەدا کە خەوتبێت. لە خۆم پرسی "ئەبێت کێ بێت؟" نەمتوانی بە ڕوونی ببینم چونکە ژورەکە تەواو تاریك بوو، هەر بۆیە دەستم برد هەتا دەست بخەمە سەر شانی، دەستم بەر پشتی کورسییەکە کەوت کەسی لێ نەبوو. جێگاکە چۆڵ بوو.

ئاسایی لە ترسا ڕاچڵەکیم. وەك ئەوەی ڕووبەڕووی ترسێکی سامناك بووبمەوە بۆ ساتێك کشامەوە دواوە. پاشان دووبارە ئاوڕم دایەوە، ناچاربووم ڕێك فەرمانبەرانە راوەستم و، لە ترسا هەناسە بڕکێم بوو، ئەوەندە شپرزەبووم نەمتوانی بیرکردنەوەکانم یەکخەمو، ئامادەبووم بۆ بورانەوە.

بەڵام من پیاوێکی ساردم، بۆیە هەر زوو خۆم هێنایەوە سەرخۆ. پێموابوو: "تەنها وڕێنەیەکە، هەرئەوەندە" دەست بەجێ دەستمکرد بە تێڕامان لەم دیاردەیە لەم چرکەساتانەدا بۆچوونەکان خێرا خێرا دێن.

من بە دەست وڕێنەیەکەوە دەمناڵاند کە ڕاستیەکی بەرپەرچ نەدراوە بوو. ئەقڵم تەواو باشبوو، بەرێکوپێکی و ئاقڵانە کاریدەکرد، لەبەرئەوە شتێکی وانەبوو پەیوەست بێت بە مێشکەوە. ئەوە تەنها چاوەکانم بوو کە هەڵیان خەڵەتاندبووم، بینینێکی ئەنجامدابوو لەو بینینانەی کە دەبنە هۆی ئەوەی خەڵکێکی ئاسایی بڕوا بە پەرچووەکان بێنن. فێیەکی دەماریی دەزگای بینین بوو و هیچی دی، چاوەکانم ڕەنگە کەمێك ئاوسابووبن.

مۆمەکەم داگیرساندو، کاتێك چەمامەوە بۆ ئاگرەکە لەم ساتەدا بینیم کە دەلەرزم وەك ئەوەی کەسێك لەدواوەوە دەستم لێدات، وە لەگەڵ ڕاچڵەکیندا خۆم ڕاست کردەوە.

بە دڵنیاییەوە بە هیچ شتێك هێمن نەبوومەوە.

کەمێك سەرو خوارم کرد و جارێك یان دووان ئهمم کرد. پاشان دوو سوڕ دەرگاکەم قوفڵ کرد زیاتر هەستم بە دڵنیایی کرد، ئێستا هەر چۆن بێت کەس ناتوانێت بێتە ژورەوە.

دووبارە دانیشتمەوە و بۆ کاتێکی دوورو درێژ یادم لەسەر کەشیەکەم کردەوە، پاشان چوومە نێو جێگاو فوم کرد لە مۆمەکە.

بۆ چەند خولەکێك هەموو شتێك باشبوو، بە هێمنی لەسەرپشت ڕاکشام، بەڵام ئارەزوویەکی بەربەست نەکراو بۆ ڕوانین بە ژوورەکەدا سەری لێدام، و وەرگەڕامە سەر لاتەنیشت.

ئاگرەکەم خەریك بوو تەواو ئەبوو و کەمێك پشکۆی گەشاوە ڕووناکیەکی کزیان پەرش کردبووە سەر زەوییەکەی نزیك کورسیەکە. وام بە خەیاڵدا هات دەبینم دووبارە کابرا لەوێ دانیشتووەتەوە.

یەکسەر دەنکە شقارتەیەکم داگیرساند، بەڵام بەهەڵەدا چووبووم و هیچی لێ نەبوو. ئەگەرچی هەستام و کورسییەکەم لە پشت جێگای نوستنەکەمەوە شاردەوە و لەبەرئەوەش کە ژورەکە ئەوکات تاریک بوو هەوڵمدا بخەوم، بەڵام پێنج خولەك زیاتر خۆم لە یادنەچووبووەوە کە لە خەونمدا هەموو ئەو ڕووداوەم بینیەوە کە پێشتر تەواو بە ڕوونی هەر وەك ئەوەی ڕاست بێت بینیبووم. لەگەڵ ڕاچڵەکانێکدا وەخەبەر هاتم و مۆمەکەم داگیرساند و لە جێگاکەمدا دانیشتم بەبێ سەرچڵی کردن تەنانەت بۆ هەوڵدانی دووبارە نوستنەوە.

ئەگەرچی سەرەڕای خۆم دووجار خەو بۆ چەند ساتێك زاڵبوو بەسەرمدا، وە دووجارە هەمان شتم بینیەوە، هەتا وام بیرکردەوە کە خەریکە شێت بم. کاتێك ڕۆژ بوویەوە پێم وابوو کە چاك بوومەتەوە تا نیوەڕۆ بە هێمنی نوستم.

هەموو ئەوە ڕابردو بەسەرچوو. تام لێ هاتبوو و خەونێکی ناخۆشم بینیبوو. نەمزانی چی بوو. لە ڕاستیدا نەخۆشبووم بەڵام هێشتا پێموابوو کە گەمژەیەکی تەواوم.

ئەو ئێوارەیە تەواو لە کەیفی خۆمدا بووم، لە چێشتخانەیەك نانی ئێوارەم خوارد و دواتر چووم بۆ شانۆ و پاشان بۆ ماڵەوە کەوتمە ڕێ. بەڵام کاتێك لە ماڵەوە نزیك بوومەوە یەکسەر هەستێکی نامۆ بە پەرێشانی زیاتر سەری لێدام. ترسام لەوەی دووبارە بیبینمەوە، من لەو نەئەترسام وە لە ئامادەگیشی کە باوەڕم پێی نەبوو نە ئەترسام بەڵکو لەوە ئەترسام کە دووبارە چەواشە بکرێمەوە، لە وڕێنەیەکی نوێ ئەترسام، ئەترسام نەك ترس بەسەرمدا زاڵبێت.

بۆ زیاتر لە کاتژمێرێك سەروخوار گەرام بە شەقامەکەدا، پاشان هەستم کرد کە لە ڕاستیدا تەواو گەمژەم، گەڕامەوە ماڵەوە. ئەوەندە بەسەختی هەناسەم ئەدا کە بەئەستەم توانیم بە پلیکانەکاندا سەرکەوم. لەبەردەرگاکەدا بۆ زیاتر لە دە خولەك وەستام، پاشان دەستبەجێ تەوژمێکی بە جەرگانەم تێهات و ورەم بوونی خۆی سەلماند. کلیلەکەم کردە نێو قوفڵەکەو چوومە نێو ئاپارتمانەکەو مۆمێك بە دەستمەوە بوو. بە شەقێك دەرگای ژوری نوستنەکەم کردەوە کە نیوەی کرابووەوە، نیگایەکی ترساوم گرتە ئاگردانەکە، هیچی لێنەبوو. ئۆهـ! چ ڕزگارییەك، چی خۆشییەك! چ قوتار بوونێك بوو! بە پەلە و نە ترسانە چوومە سەرو هاتمە خوارەوە، بەڵام تەواو دڵنیا نەبوو بوومەوە، لەگەڵ و چورکێکدا بە چواردەورمدا سوڕامەوە، هەموو تارماییەکانی سوچەکان تەنگیان پێ هەڵچنیم.

خراپ نوستم، بەردەوام ژاوەژاوی خەیاڵی بێزاری دەکردم، بەڵام هیچم نەبینی، نا ئەوە هەموو بەسەرچوو.

لەو کاتەوە لەوە ترساوم کە لە شەودا تەنها بم. هەست دەکەم کە پەرچووەکە لەوێدایە، نزیکم، لە دەوروبەرم، بەڵام جارێکی دی نەکەوتووەتەوە بەرچاوم وا دانێ کە ئەوە ڕوویدا، بەڵام لەبەرئەوەی من باوەڕم پێی نییەو دەزانم کە هیچ نییە، دەبێ بابەتەکە چی بێت؟

هێشتاش قەلەقم دەکات، چونکە بەردەوام بیری لێدەکەمەوە. شانی ڕاستی شۆڕبووبووەوە سەری بۆ لای چەپ لار بوو بووەوە وەك پیاوێك کە نوستبێت نامەوێت بیری لێبکەمەوە!

هەرچۆنبێت، بۆچی ئەم بۆچوونە وا بەردەوام منی داگیرکردووە؟ قاچەکانی نزیکی ئاگرەکە بوو!

ئـەو پیـاوە مـن بێـزار دەکـات، شـتێکی زۆر دەبەنگانەشە، بەڵام ئەو کێیە و چییە؟ دەزانم کە ئەو بوونی نییە جگە لە نێو خەیاڵە ترسنۆکانەکانم، لە ترسـەکانم و لـە ئـازارە جەرگبڕەکەمـدا. ئەوەنـدە بەسە.. لە بارەیەوە! بەڵێ، بەلای منەوە ئەوە هەموو باشـن بـۆ بیرکردنـەوە لـە خـۆم، بـۆ توندکردنـەوەی کۆڵەکەی پشتم، بەڵام دەبێ بشڵێم، کە ناشتوانم لە ماڵـەوە بمێنمـەوە چـونکە دەزانم کـە ئـەو لەوێیـە. دەزانم کـە جـارێکی دی نایبینمـەوە، جـارێکی دی خۆیم نیشان ناداتەوە، ئەوە تەواو بوو. بەڵام ئەو لەوێیە، بە هەمان شێوەی لە نێو خەیاڵەکانمدا بە نەبینراوی لەوێ دەمێنێتەوە، بەڵام ئەوە ڕێگر نابێت لـە بـوونی لـەوێ لـە پشـت دەرگاکانەوەیـە، لـە نێـو دۆڵابـە داخراوەکانـدا، لـە کەنتۆرەکانـدا، لـە ژێـر جێگـای نوسـتنەکەدا، لە هـەموو سوچێکی تاریکدا هەیـە. گـەر دەرگاکـە یـان دۆڵابەکـە بکەمـەوە، گـەر مۆمێـك هـەڵگرم تـا سـەیری ژێـر جێگـای نوسـتنەکە بکـەم و گـەر ڕووناکییـەك بخەمـە سـەر شـوێنە تاریکەکان ئەو چیتر لەوێ نامێنێت بەڵام من هەست دەکەم کە لە دوامەوەیە. ئاوڕ دەدەمەوە، بە دڵنیـایی نـایبینم، هـەرگیز جـارێکی دی نابینمـەوە، بـەڵام هـەموو جـارێ، ئـەو لـە دوامەوەیـە زۆر گەمژانەیـە، ترسناکە، بەڵام من چی بکەم؟ ناتوانم ڕزگاربم لێی. بەڵام گـەر دووانمـان لـەوێ بین هەست بـە دڵنیـایی دەکەم کە ئەو چیتر لەوێ نابێت، چونکە بۆیە لەوێیە تـەنها لەبەرئـەوەی مـن تـەنهام، ئاسـایی و بـە تـەنها لەبەرئەوەی کە من تەنهام.

## سەرچاوە


*The Terror*

*BY Guy DE Maupassant*

*All available work of Guy De Maupassant,*

*From internet.*

# حەساسییەت

**ناهیدی تەباتەبایی**

**لە فارسییەوە: نەجیبە ئەحمەد**

دایکم وتی:

–حەساسییەتەکەم سەری هەڵداوەتەوە.

درۆی دەکرد. چاوەکانی تەڕوسەری لووتی سوور ببووەوە، بەڵام بەهۆی حەساسییەتەوە نەبوو.

باوکم وتی:

–تۆ هەمیشە لە سەرەتای بەهاردا وات لێدێت، هی گەردوتۆزی گوڵەکانە، با تۆزێ بچینە پێشەوە چاك دەبیتەوە.

ئەویش درۆی دەکرد چونکە نەهۆی حەساسییەت بوو و نەگەردو تۆزی گوڵەکان. ماوەیەك بوو باوکم کەوتبووە خۆی. بیستبووم پیاوان کە دەگەنە تەمەنێك دەکەونە خۆیان واتە بیر لە خۆیان دەکەنەوە. دایکی هاوڕێیەکەم دەیووت:

–لە پەنجا ساڵیدا ئیتر سەرەو لێژ دەبنەوە.

باوکم هێشتا نەببوو بە پەنجا ساڵ، بەڵام وەکو ئەوەی سەرەو لێژییەکەی بەرامبەر خۆی دیبێ، چونکە هەموو بەیانییەك ریشی ساف و لووس دەتاشی و کرێمێکی لێدەدا تا چرچ نەبێت، پاشان بە ماینوکسیدیل بیخی سەری چەور دەکرد تاوەکو قژی نەڕوتێتەوە. خاڵەکەی لای لووتی سووتاندبوو. هەر رۆژەش قاتێکی لەبەردەکرد. بەڵێ، سەرەو لێژییەکەی دیتبوو. شەوێك لە خەومدا باوکم بە قاتێکی خۆڵەمێشی و بۆینباخێکی سوورەوە بە پلیکانی خلیسکێنێکدا سەردەکەوێت. جانتایەکی دبلۆماسی بەدەستەوە بوو، دەمزانی جانتاکە پڕە لە کرێم و بۆن و بۆینباخ، ئیتر کاتێ گەیشتە سەری سەرەوە، لەوێوە بۆ هەموو ئەو خانمانە دەنووشتایەوە کە بە پلیکانەکاندا سەردەکەوتن، ئینجا دەستی بەسەرەولێژایی خلیسکێنەکەدا دەگرت بۆ ئەوەی هانی بدات کە خلیسکێن بکات رێك وەکو ئەو کاتانەی دەرگای ژووری بەرووی خانماندا دەکردەوە و فەرمووی لێدەکردن. دایکم کە لەو پێشووانەدا لە ئارایشگایەکدا کاری دەکرد، ئێستا ناچارە بە بەردەوامی تەلەفۆن بۆ هاورێ دێرینەکانی بکات و دەربارەی دوایین رەوشی رێگەگرتن لە رووتانەوەی قژو چرچبوونی پێست هەواڵ وەرگرێ.

هەڵبەتە دەشمزانی ڕۆژانی هەینی کەمن دەچم بۆ کێو ئەو لەماڵەوە ماسکی بەهێزکردنی پێست دەگرێتە دەموچاوی باوکم و هێلکە و ڕۆنی زەیتوون لە قژی دەدا. دایکم شەیدا و عاشقی بوو. باوکیشم بە شێوازەکەی خۆی ئەوی خۆش دەویست. هەندێجار لابەلا قسەیەکم بۆ دایکم فرێدەدا کە ئەمە مانای چییە وا باوکم ئەوەندە بە خۆیدا دەگات؟

دایکم دەیووت:

-تۆ هێشتا منالّی زۆرت ماوە پیاو بناسی.

دەمووت:

-ئێ خۆ تۆ کە لە تەمەنی مندا بووی منالّیشت هەبوو.

دەیووت:

-ئەوسا جیابوو، ئێستا فەرق دەکات، تۆ تێناگەی، هێشتا پیاوت نەناسیوە، پیاو هەر کوڕ و کالّی بچوکن بە مشتێ ڕیش و سمێڵەوە.. من شەرمم دەکرد بڵێم کە تا ئەو کاتە چوار دۆستی کوڕم بووە، ئەگەر بشبینم یەکێکیان هێشتا هەر منالّە و بە منالّی ماوەتەوە، ئەوە بە نووکە شەقێك لە بیری خۆمی دەردەکەم. بەلاّم مەسەلەی سەرهەڵدانەوەی حەساسییەتەکەی دایکم. بڕیاربوو بچین بۆ ماڵی میهری خانم و ئەوان بۆ ئاهەنگی مارەکردنی (پوونە)ی کچە گەورەی. میهری خانم میواندارییە ئاساییەکانی وەکو زەماوەند بوو، جا چ بگا بەوەی کە ئێستا مارەکردنی کچیشی بێت. سێ ڕۆژ بەر لە میوانییەکە باوکم لەسەر نانخواردن وتی:

-ئەمڕۆ ئاغای مەجیدی زۆر کەشخە و شیك ببوو. زۆرم ئەملاوئەولا لەگەڵدا کرد تا تێبگەم چی کردووە، بەلاّم هیچی نەووت. دەزانی چۆنی لێهاتبوو؟ ڕەنگی قژی گۆڕیبوو. هەڵبەتە نەرەش و نە قاوەیی کردبوو، بەڵکوو ماش و برنجییەکی زۆر جوان و ڕێك و پێك بوو. دایکم بە دەم پاروو قووتدانەوە وتی:

-دەزانم چیکردووە، ئەوە وەکو مێش کردنی قژی ژنانە.

باوکم وتی:

-زۆر ڕێکوپێك ببوو.

من وتم:

-خەڵکانێکی چەند بێ ئیش و کار هەن، جا توخوا چاکتر نەبوو لە جیاتی ئەو شتانە ئاغای مەجیدی مامۆستایەکی بۆ کچەکەی بگرتایە تا لە تاقیکردنەوەی بەکەلۆریدا دەربچێ.

دایکم مۆڕەیەکی لێکردم و باوکیشم سەرخۆی نەهێنا.

دوو ڕۆژ بەر لە میوانییەکە. دوای نیوەڕۆ مامۆستاکەمان نەهات بۆیە هۆڵی دەرسمان بەجێهێشت و گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. کە گەیشتمە ماڵەوە بە خەیاڵی ئەوەی دایکم خەوتووە زۆر بە هێواشی و لەسەرەخۆ بە کلیلەکەی خۆم دەرگاکەم کردەوە. بەلاّم دایکم نەخەوتبوو. لە موبەق لەگەڵ یەکێکدا قسەی دەکرد. هەستی کونجکۆڵی و فزولی منیش بزوت، بۆیە بێ چرکە ڕۆشتم و لەلای دەرگای موبەقەکەوە سەرێکم کێشا. دیمەنێکم دیت کە زۆر سەیر و سەمەرە بوو، ئێستاش سەیرم لە خۆم دێت کە چۆن دوو شاخم لێ نەڕوا. باوکم لە ناوەڕاستی موبەقەکەدا دانیشتبوو، سفرە نایلۆنییە گوڵ گوڵییەکەی موبەقی وەکو سەرشان دابوو بەسەر شانیدا. سەریم نەدەدی چونکە دایکم پشتی لێمبوو. بەلاّم بە جووڵەی دەستەکانیدا زانیم کە پەلەپەل خەریکی ئەوەیە بە قولاب تاڵ تاڵی قژی باوکم لە کونەکانی کلاّوی مێشکردنەکەوە دەردەهێنێ. بۆ ساتێك شێوەی باوکمم هێنایە بەرچاوی خۆم و پێکەنینم هات. بەو کلاّوە و بەو

تالْ تالّە ڕەپانەوە هەر لە ژێژکێکی گەمژە دەچوو. بە هێواشی لە مالْ هاتمە دەرو چووم بۆ مالّی هاوڕێیەکەم. کارەکەیان دوو سەعاتێکی دەویست تا تەواوببیّ. کە هاتمەوە باوکم ببوو بە کەسێکی تر. پیاوێکی شیك بە قژێکی زۆر جوانەوە. بە نیگایەکی پڕ لە شەوق و تاسەوە لێی دەڕوانیم تاوەکو وەسفی بکەم و پیادا هەڵبەم بەلاّم من چونکە حەزم لەم کارانەی نەبوو هیچم نەووت. لە دواییدا و دوای دوو سەعات ئیتر ئارامی نەگرت و لێی پرسیم: "ئەوە هیچ گۆڕانکارییەك لە مندا نابینی؟" وتم: "چۆن، پێموایە خەریکی تامێزکە دەردەدەی!" دایکم پێکەنی و باوکم مۆن بوو و لچی دابەیەکدا.

لە ڕۆژی میوانییەکەی میهری خانمدا، دایکم ناچار بوو جارێك بە نینۆکی تازە بۆیەکراوەوە، جارێك بە دەستی کرێماوی و پۆدرە لێدراوەوە و جارێکیش بە پەنجەی لە جێلْ هەڵکێشراوو بەیەکەوە نووساوەوە، بۆینباخ بۆ باوکم ببەستیّ. لە میوانییەکەشدا باوکم لە هەموو پیاوەکان شیکتر و کەشخە تر بوو، دایکیشم لە هەموو ژنەکان بیّ تەرتیبتر بوو چونکە ناچار ببوو کە بۆیەی نینۆکەکانی لێبکاتەوە، پێڕاش نەگەیشتبوو جوان ئارایش بکات.

ئەو شەوە باوکم وەکو تاووس لەنجەولاری دەکرد. هەڵبەتە لە تاووسیش باشتر چونکە پێیە ناشیرینەکانی بە جووتێك پێڵاوی ئیتالّی داپۆشیبوو. نازانم ئەو بڕوا بە خۆبوونە بەهۆی قژە ماش و برنجییەکەیەوە بوو یان لە خۆشی ئەو شتانەی دەیانخواردو بووە هۆی ئەوەی لەو شەوەدا لەگەلْ تێکڕای ژنانی ناو کۆڕەکەدا سەما بکات، ئینجا سەری دەخستە سەر هەمووان و بە بیانووی جیاجیاوە دەستیانی دەگرت. ئەمەشیان ئیتر لە تواناو حەوسەڵەی مندا نەبوو تەحەمولی بکەم.

ئەتواری هەرزەکارانە و جلّفبازی نواندن سنووری خۆی هەیە. لەم ناوەدا دایکی بێچارە و بەدبەختم لە بەرامبەر نیگاو سەیرکردنی گالّتەئامێزو پڕتەشەری دیتراندا بزەی دەبەشییەوە و هەولّیدەدا وا پیشان بدات کە هەموو شتێك ئاساییە. شەو کە گەڕاینەوە چاوەڕیّ بووم بە جووتە بچنە ژووری خەوتنەکەیان و دەرگاکە داخەن، دایکم لە ژێر لێوەوە بۆلّە بۆلّێك بکات و باوکیشم بە دەنگی بەرز وەلاّمی بداتەوە. ئیتر ئەوسا وەکو هەمیشە دایکم دەست بکات بە گریان و باوکم بە قوربان و ساقەی بێت و بەسەرهاتەکە کۆتایی پیّ بێت بەلاّم ئەو شەوە دایکم پەتووەکەی هێناو هات لای من بخەویّ، باوکم وەکو کەسێك خەوتبیّ و بەرێدا بڕوات، هەر بەو جلەوە کەوتە سەر تەختەکەو پرخ و هۆڕی دەگەیشتە ئاسمان. من و دایکم تا بەرەبەیان قسەمان کرد. پێموت خەتای خۆیەتی کە ئەوەندە رووی پێدەدا، وتم باوکم ئەوە ناهێنیّ. وتم ئەسلّەن هەر حەیفە کە تۆ لەگەلْ پیاوێکی وادا دەژیت. بەلاّم دایکم دیسانەوە وتییەوە کە ئەو پیاوێکی سادە و گوێڕایەڵە و زۆربەی پیاوان ئاوەهان و ئەوەش نابێتە بەڵگەی ئەوەی کە ژنەکانیان خۆش ناوێت. پێم وت ئەگەر من لە جێی تۆبم سیّ چوار ڕۆژ دەتۆریم تا تۆزێك قەدری عافییەت بزانیّ. وتی کە گوایە من پیاوان ناناسم.

وتم: تاقیبکەرەوە.

بەیانی دایکم وتی: حەساسییەتەکەم دووبارە سەری هەڵداوەتەوە.

باوکم وتی: هەمیشە لە سەرەتای بەهاردا وات لێدێت، هی گەرد و تۆزی گولّەکانە، تۆزێك بچینە پێشترەوە چاك دەبێتەوە.

دایکم وتی: چەند ڕۆژێك دەچم بۆ ئەراك بۆ مالّی خوشکم. زۆر ماندووم

باوکم ڕەنگ لە ڕوویدا نەما، منەمنێکی کردو وتی: ئارام بگرە، حەفتەیەکی تر پێکەوە دەچین.

وتم: حەقت چییە بەسەرییەوە؟ خۆ تۆ نیوەڕۆژەت لە دائیرە دەخۆیت و بۆ نانی ئێوارەش شتێك دروست دەکەم. بەسەرسامییەوە سەیرێکی کردم و هیچی نەووت. دیاربوو لە کارەکانی دوێنێ شەویی پەشیمان بوو.

بەدایکمم وت: جانتاکەت ئامادە بکە، خۆم تا نەقلیات لەگەڵتدا دێم.

باوکم چایەکەی هەڵقوڕاند و کاتێك ویستی بڕوات پرسی: چەند ڕۆژ دەمێنیتەوە؟

دایکم وتی: نازانم، زۆر ماندووم.

باوکم ئیتر سەیری ئاوێنەی نەکرد و ڕۆشت. سەرو دڵی گیرابوو.

دوای بەرچایی سفرەکەم کۆکردەوەو بۆ دایکیشم کە هیچی نەخواردبوو دوو بابۆڵەی گەورەم دروست کرد و خستمە جانتاکەیەوە. هێشتاش هەر دوودڵ بوو، بەڵام دەبوایە بڕوات. دەبوایە ماوەیەك باوکمی بە تەنیا جێبهێشتایە تاوەکو تۆزێك بەخۆیدا بێتەوە و قەدری عافییەت بزانێ، بە تایبەت کە منیش هەندێ پلانی خۆمم هەبوو.

دایکم سێ ڕۆژ بوو ڕۆشتبوو، لەو سێ ڕۆژەشدا یەکجار تەلەفۆنی کردبوو. ئەویش بۆ ئەوەی کە بڵێ گەیشتووم. من وەڵامی تەلەفۆنەکەم دایەوەو هەر بە ئەنقەستیش نەمدا بە باوکم تا قسە بکات. باوکم دڵگران بوو بەڵام هیچی نەووت. ڕۆژی چوارەم لێمداو نەچوومەوە زانکۆ. لەچکێکی ڕەشم لەسەر کرد و پاڵتۆیەکی بارانیی خۆڵەمێشیم لەبەرکرد. چاویلکەیەکی ڕەشیشم لەچاو کرد و ئەو ڕۆژە لە ڕۆژان زووتر لە ماڵ هاتمە دەرەوە. ئەو تەکسییەی بە تەلەفۆن داوام کردبوو لەبەر دەرگا چاوەڕێی دەکرد. کە ئەو لە ماڵ چووە دەرەوە من بە شۆفێرەکەم وت: "بێ زەحمەت بەدوای ئەو ئوتومبیلەدا بڕۆ". ئەم تەکسییەم لە ئاژانسێکی دوو کۆڵان خوار ماڵی خۆمانەوە بانگ کردبوو، بۆ ئەوەی نەمناسێتەوە. باوکم لە کاتژمێری هەشتی تەواودا سواری ئوتومبیل بوو و ڕێك چوو بۆ دائیرە. ڕۆژنامەیەکم کڕی و لەناو ئوتومبیلەکەدا دانیشتم و چاوەڕێم کرد. لە کاتژمێری نۆونیودا زۆر بە شڵەژاوی لە دائیرە هاتە دەرەوەو سواری ئۆتۆمبیلەکەی بوو. دڵم خەبەریدا کە شتێك خەریکە ڕوودەدات. شوێنی کەوتم. خەریکبوو بەرەو یەکێك لە پارکە گەورەکان دەڕۆشت. حەتمەن ژووانێکی بوو. لەبەر پارکەکەدا ئۆتۆمبیلەکەی لە قەراغ شەقامەکەدا ڕاگرت و خۆی چووە ژوورەوە. منیش شوێنی کەوتم. لە شڵەژاوی و تێکچوونی خۆمدا لەپی دەستەکانم ئارەقەیان کردبووەوە و دەماری لاجانم لێیدەدا. ئاخرییەکەی هەر لە قافدا دەیگرم. دایکە بەستەزمانەکەی من! دوانزە جار بە دەوری ئەستێڵە گەورەکەی پارکدا خولایەوە و منیشی وەکو سەگ لەگەڵ خۆیدا کێش کردو خولاندییەوە. وەکو فرفرۆکە دەڕۆیشت و هەر سەیری بەرپێی خۆی دەکرد. دیار بوو شتێك دڵگرانی کردبوو.

هەر کاتێك نیگەران بوایە خێرا و توند دەڕۆیشت، پاشان سواری ئۆتۆمبیلەکەی بوو و چووەوە بۆ دائیرە. من هەرچەندەش لەپێ کەوتبووم بەڵام دوو کۆڵان ئەولاتر دابەزیم و بەپێ چوومەوە بۆ ماڵی خۆمان و خۆم دا بەسەر تەختەکەدا. نەمدەتوانی جووڵە بکەم. شەو کە باوکم هاتەوە زۆر ماندوو و دڵتەنگ بوو. پارووییەك نانی خوارد و هەر لەبەر تەلەفزیۆنەکەدا خەوت. دوو ڕۆژ دوای ئەوە شتێکی باشترم بەبیردا هات. کاتژمێر یانزە بوو لە تەلەفۆنی زانکۆوە زەنگێکم بۆ نووسینگەکەی باوکم

لێدا، سكرتێرەكەی وەڵامی دایەوە، چمكی لەچكەكەم گرت بە دەممەوە و وتم كە گوایە ئاشنایەكی ئەوم و دەمەوێ قسەی لەگەڵدا بكەم. سكرتێرەكەی بە دوو دڵییەوە وتی:

–ببوورە. تۆزێ مۆڵەتم بدە با

ئینجا تەلەفۆنەكەی پێ ڕاگەیاند. منیش قسەم كرد.

وتم: ئەو كاتەت باش، حاڵ و ئەحواڵت چۆنە؟ من تۆم لەم دواییەدا لە میوانییەكدا بینی و زۆر ئارەزوومە كە زیاتر بتناسم.

باوكم وتی: جەنابت؟ بێ زەحمەت خۆتان بناسێنن.

وتم: ئاخر شەرم دەكەم. ڕەنگە دوایی ئەو كارەش بكەم، بەڵام هەر ویستم پێت بڵێم كە زۆر پیاویت و زۆر كەشخە و شیكی.

باوكم دەنگی گڕتر كرد و وتی: خانم من ژنم هەیە و كچێكی جحێڵیش، حەزیشم لەم ئەتوارانە نییە. ئەوەش بزانە كە ئێرە شوێنی كاری منە و تكات لێدەكەم جارێكی تر ئیزعاجمان مەكە. تێگەیشتیت؟

من كە بەتەواوەتی (خیت)[1] ببووم وتم: بڕۆ بابە عەرەبانەكەت ڕاكێشە[2]، تۆش.

بەڵام كە تەلەفۆنەكەم داخستەوە لە خۆشیدا قیژاندم: بابەگیان لەگەڵ هەموو كەسێكدا قسە ناكات. پاشان تەلەفۆنم بۆ دایكم كرد. حاڵی باش بوو بەڵام دڵتەنگ ببوو. نیگەرانی خورد و خۆراكی ئێمە بوو. پێم وت حەفتەیەكی تریش ئارام بگرە.

ڕۆژی هەینی شلەی سەوزیم بۆ باوكم دروست كرد. حەزی لێدەكرد. لەسەر مێزەكە دانیشت. تۆزێك خواردنی تێكرد و هەندێك یاری پێكرد، مەیلی نەبوو. ڕیشی نەتاشیبوو و تاڵ تاڵی ڕیشە سپییەكەی پیرتری دەنواند. سەروقژی زۆر ئاڵۆزاو و ناڕێك بوو. پێم وت: ئای باوە!!.. ئەوە چییە. تۆ هەمیشە خۆت بۆ خەڵكی تر جوان دەكەی، ئەی بۆ ئێمە چیمانە، بنیادەم نین؟ ئینجا دوو پارچە گۆشتم بۆ دانا.

باوكم وتی: لە ڕاستیدا زۆر بێتاقەت و بێ حەوسەڵەم.

پرسیم: داروباری كارەكەت چۆنە؟

وتی: باشە!

–ئیتر لە چی دڵگرانی!

–نازانم هیچ حاڵم باش نییە.

پاروویەكی خستە دەمی و جوی و بە زۆر قوتیدا. پاشان وتی: دایكت تەلەفۆنی نەكردووە؟

وتم: با دوێنێ شەو قسەمان كرد.

–ئەوە خۆ هیچ هەواڵێكی من ناپرسێ، چییە؟

–با چۆن. هەمیشە هەواڵت دەپرسێ.

–ڕاست دەكەیت؟

–بەڵێ.

–ئەی بۆچی لەگەڵ خۆمدا قسە ناكات؟

–نازانم. باشە بۆ خۆت قسەی لەگەڵدا ناكەیت؟

–دەترسێم قسەم لەگەڵدا نەكات و لەبەرچاوی پوورت حەیام بچێ.

–ها، باشە، ڕەنگیشە وابێ.

–بۆچی نایەتەوە؟ دەزانی قەت ئەوەندە لێك دوورنەبووین، تۆ كچێكی گەورەی، ئاخر..

ئیتر هیچی نەووت، وەكو ئەوەی قوڕگی گیرابێ.

–تێگەیشتم! من تەلەفۆن دەكەم و دواییش دەیدەم بە تۆ قسە بكە.

چاوەكانی باوكم لە خۆشییاندا بریسكەیان دەهات. خوانەكەمان بەجێهێشت و چووینە هۆڵەكە. ژمارەكەم وەرگرت.

پوورم وەلأمی تەلەفۆنەکەی دایەوە. چاکوچۆنیم کرد و وتم دایکمم دەوێ. دایکم دەنگی بە تەواوەتی گیرابوو. سەرمای ببوو. خۆی وای وت. وتم یەکێك لەو کورە لاوە دێرینانە دەیەوێ قسەت لەتەکدا بکات. دەنگی زیاتر گیرا.

تەلەفۆنەکەمدا بەباوکم، دەستی دەلەرزی. سەرەو خوار گرتیو دەمەکەی نا بە گوێچکەیەوە، وتم:

-چیدەکەی؟ دەسکی تەلەفۆنەکەم لێسەند و ڕێکم کردەوەو ئینجا دامە دەستی.

بەهێواشی وتی: پشە گیان چۆنی!

پێکەنینم هات. پشە گیان! لە ژوورەکە هاتمە دەرەوە و بەجێم هێشت تا تێر بۆ خۆی بمیاوێنیٚ. ئیتر تا باوکم لێبوەوە من سفرەو خوانم کۆکردەوە، قاپەکانم شت، میوەم خستە سەر مێزی موبەقەکە و چاوەڕێم کرد.

لە پاش نیو سەعات کە هاتەوە چاوەکانی تەڕو هەموو سیمای پێدەکەنی. ماچێکی ڕوومەتمی کردو وتی: بەیانی دێتەوە، حەساسییەتەکەی باش بووە.

هەروا کە خەریکی پاککردنی سێوێك بووم بە خۆمم وت: دایکم ڕاست دەکات. من هێشتا پیاوان ناناسم.

## پەراوێز

1-خیت: تەریقبوونەوە

2-ئەم پەندە لە فارسییەکەدا بەمجۆرەیە: برۆ بابە کەشکی خۆت بساوە

## سەرچاوە

لە کۆمەڵە چیرۆکی (برف و نرگس) وەرگیراوە.

# چەند شیعرێکی نازم حیکمەت

لە فارسییەوە: فرزند شێرکۆ

### جگەرەی دانەگیرساو

ڕەنگە ئەمشەو بمرێ
بە سووتاوی سینگی چاکەتەکەیەوە لە ئاگری
فیشەکێ.
هەر ئەمشەو
بەرەو مەرگ ڕۆی
بە هەنگاوی خۆی.

–پرسی: جگەرەت پێیە؟
وتم: بەڵێ
–شقارتە؟
وتم: نە

ڕەنگە فیشەکێ
دایگیرسێنێ.

جگەرەکەی وەرگرت و
تێپەڕی..
ڕەنگە ئێستا درێژ بە درێژ کەوتبێ
جگەرەیەکی دانەگیرساو بە لێویەوە و
برینێك لەسەر سینگێ..
ڕۆیشت.
هێمای فرەیی و
کۆتایی.

### پارچەیەك لە مەرگی شێخ بەدرەدین*

دەرباری.. نم نم
بە ترس و لەرزەوە
بە دەنگێکی خۆ خواردۆوە
هەروەك چرپە چرپی خیانەت.

دەباری.. نم نم
وەك پێی خائینان، خاوس و سپی
هەڵدێ بەسەر خاکی ڕەشی تەڕی گومانێکا.

دەرباری.. نم نم
و لە بازاری سەرەز
بەرامبەر کوشکی ئاسنگەر، پەیکەری بەدرەدین
هەڵواسراوە
بەدرەختێکا.

دەباری.. نم نم

لاڵە بازاڕی سەرەز، کوێرە بازاڕی سەرەز
سەودایەکی تۆقیو لە هەوادایە
بیٚ وشەیەك، بیٚ نیگایەك.
لە پڕدا روخساری دادەپۆشی بە هەردوو دەست
بازاڕی سەرەز

دەباریٚ.. نم نم
1-شێخ بەدرەدین، سۆڤ شۆڕشگێری تورك لە سەدەی 14ی زایینی

## نامەکان و شیعرەکان

لە چۆکدام و تەماشای زەوی دەکەم
تەماشای گیای دەکەم
تەماشای مێروو دەکەم
تەماشای چرکە دەکەم
چرۆی کردووە شینێتی شین
لە زەوی بەهاران دەچی تۆ،
نازەنینی من،
تەماشای تۆ دەکەم.

راکشاوم لەسەر پشت، ئاسمان دەبینم
پەلوپۆی درەخت دەبینم
حاجی لەقلەقەکان دەبینم لە فڕیندا
لە ئاسمانی بەهاران دەچی تۆ،
نازەنینی من
تۆ دەبینم.

ئاگرێکم کردۆتەوە لە بیابان کاتی شەو
دەست لە ئاگر دەسووم
دەست لە ئاو دەسووم
دەست لە قوماش دەسووم
دەست لە لیرە دەسووم
لە ئاگری داگیرساوی ئۆردوگایەکی ژێر ئەستێرەکان دەچی
دەست لە تۆ دەسووم.

لە نێوان مرۆیاندام و مرۆکانم خۆش دەویٚ
ئیشکردنم خۆش دەویٚ
ئەندێشەم خۆش دەویٚ
جەنگەکەمم خۆش دەویٚ
لە جەنگی من دا بوونێکی مرۆییت تۆ
تۆم خۆش دەویٚ

لەم شەوە پاییزیەدا
لێوان لێوم لە وشەکانی تۆ:
وشەگەلێکی نەمریی وەك کات، وەك مادە
وشەگەلێکی قورس، وەك دەست
وشەگەلێکی درەوشاوە هاوشێوەی ئەستێرەکان.
لە دڵتەوە، لەسەرتەوە، لە جەستەتەوە
وشەکانی تۆ بەرەو لای من هاتووە:
وشەکانی تۆ، پڕ بەرهەم لە تۆ
وشەکانی تۆ، دایك
وشەکانی تۆ، ژن
وشەکانی تۆ، هاوڕیٚ.

وشەکانت خەمباربوو و تاڵ
وشەکانت شادبوو و پڕ لە هیوا
وشەکانت ئازا بوو و پاڵەوان
وشەکانت مرۆیان بوون

## سەرچاوە

همچون کوچەئی بی انتها

## ئەدەبی نامە

# دڵدارە هەرە ئازیزەکەم

## نامەکانی چیخۆف و ئۆڵگاکنیپەر

لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

**چیخۆف**

27 سپتامبەر

"یاڵتا"

ئۆڵگای ئازیزم، ئەکتەری چکۆڵانەو قەشەنگ، بۆ تۆنی دەنگت ئەمەندە تاڵ و غەمبارە، ئایا من بەو جۆرەم کە تۆ دەیڵێیت؟ ئەگەر وام لێم ببورە ئازیزەکەم. بەڵام لێم زویر مەبە. من بەو ڕادەیە خراپ نیم کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە، هۆی نەهاتنم بۆ مۆسکۆ نەخۆشیم بوو، بێگومانبە هیچ هۆیەکی دی لە ئارادا نیە، هەرگیز، من گفتی خۆمت دەدەمێ، گفتی شەرەف. ئایا بڕوام پێدەکەیت؟

تا ڕۆژی دەی ئۆکتوبەر لە "یاڵتا" دەبم و کاردەکەم، پاشان دەڕۆم بۆ مۆسکۆ یان بۆ دەرەوەی وڵات. ئەوە پەیوەندی بە تەندروستیمەوە هەیە. هەر چۆنێك بێت من نامەت بۆ دەنووسم. یەك دێڕ نامەم نە لە ئیڤانی برام و نە لە خوشکمەوە پێ نەگەیشتووە. بێگومان لە شتێك تووڕەن، نازانم چیە؟ دوێنێ سەرم لە دکتۆر "سردین"[1]دا، میوانی زۆری لابوو، من گەلێکیانم نەدەناسی (...) تووشی ڕۆماتیزم هاتووە، لە بارەی "کچی بەفر"ەوە بۆم بنووسە، پێم بڵێ وەرزی دەست پێکردنتان چۆن بوو. ئەکتەرەکان لە چ حاڵ و دەماخێکدان، بینەران چۆن بوون و هتد.. تۆ وەك من نیت، تۆ شتت زۆرە بینووسیت، هەواڵت زۆرە پێمی بڵێیت —لە کاتێکدا کە من هیچ شتێکم نیە بە تۆی بڵێم، جا بۆ شتێك هەیە: ئەمڕۆ دوو مشکم گرت.

هێشتا باران لە یاڵتا نەباریوە، وشکە ساڵییەکی بێ وێنەیە، درەختە بێچارەکان، بە تایبەت ئەوانەی ئەم دیو چیا، تەنانەت دڵۆپێك بارانیان نیەو خەریکن زەرد دەبن، ڕێك وەك ئەو مرۆڤانەی کە دڵۆپێك بەختەوەریان لە ژیایانیاندا نەدیوە. وا دەزانم کارێکی ناچاریە.

نووسیوتە: "تۆ دڵێکی نەرم و پڕ لە خۆشەویستیت هەیە مەیکە بە بەرد" چەندە

بیردەکەمەوە ناتوانم لەوە بگەم کەی من ئەوەندە دڵ ڕەق بووم. من هەمیشە لە ناخی دڵەوە تۆم خۆشویستووەو دڵم داویتی، هەرگیز ئەمەم نەشاردۆتەوەو تۆ لەسەر هیچە من تاوانبار دەکەیت. لە نامەکەتدا وا دیارە چاوەڕێی منیت تا پێکەوە کێشەکان چارەسەر بکەین. تۆ دەتەوێت گفتوگۆیەکی دوورو درێژو زۆر جیدی پێکەوە بکەین. بەڵام من ناتوانم لەوە زیاتر بڵێم کە زیاد لە دە هەزار جار بە تۆم وتووە، ئەویش ئەوەیە کە "من تۆم خۆشدەوێت" ئەمە هەموو شتێکە، بۆ ئەوەیش کە بۆچی منو تۆ پێکەوە نین، ئەوە نە خەتای منەو نە هی تۆ، خەتای شەیتانە کە ئەم شەیدایییەی لە منداو ئەو عەشقی هونەرەی لە تۆدا دروست کردووە.

خوات لەگەڵ ئەی ئازیزترین فریشتەم، هەموو فریشتەکان ئاگادارت بن، لێم تووڕە مەبە کۆترەکەم، غەمبار مەبە، میهرەبان بە. دەنگوباسی شانۆ لە چیدایە؟ هەواڵم بدەرێ.

**ئانتوانەکەت**

* * *

**چیخۆف**

28 **سپتامبەر**

**"یالتا" تەلەگرام**

دوێنێ نامەیەکی گەلێك جوانی تۆم پێگەیشت، لەوە دەچێت ئۆکتۆبەر بێم بۆ ئەوێ.

**ئانتونیو**

* * *

**کنیپەر**

30 **سپتامبەر**

**"مۆسکۆ"**

ئایا لە نێوان منو تۆدا هیچ بەدحاڵیبوونێك هەیە ئازیزم؟ من لێرە چاوەڕێم، لە چاوەڕوانیەکی بێکۆتاییدام، هەموو ئەو شتەی تۆ بە منی دەڵێیت تەنیا ئەمەیە کە "لەوە دەچێت بێم" من -لەوەدەچێت-م ناوێت، دەبێ ڕاستو ڕەوان بڵێیت دێم.

دوو نامەی سەیرم بۆ ناردیت. تووڕە نیت لێم؟ بمبوورە کۆترەکەم، زۆر دڵم تەنگبوو، هێشتا نە هاتوومەتەوە سەر خۆم، بە ڕاست هیچ منت لە یادە؟ ئەگەر خۆشت بوێم لێم تێدەگەیت..

زستان بۆ هەردووکمان خراپە، بەڵام زوو بەسەردەچێتو پاشان لە بەهاردا گەرما دەگاتو گەلێك شتی تریش. تۆ زۆر کەم بڕوا بە من دەکەیت! بە لامەوە ئەمە پێکەنینی زۆری دەوێت، تۆ لە بارەی منەوە چۆن بیردەکەیتەوە؟ بیر مەکەرەوە. من ئاماژەی ناو نامەکانت بە جیدی وەردەگرم. کە دەیانخوێنمەوە بە هێوری پێدەکەنم، ئاە نووسەری ئازیزم، تۆ تاریکە دنیایت، زوو وەرە. دەڵێی حەز بە نووسین ناکەیتو پێتخۆشە قسەبکەیت. منیش هەفتەیەکە نامەم بۆ نەنووسیویتو چاوەڕوانی شتێکم، کە تەلگورافەکەت گەیشت، دڵم داخورپا، وامزانی ڕۆژی گەیشتنە مۆسکۆت بۆ نووسیوم. بەڵام کە خوێندمەوە ئەمەندە غەم دایگرتم کەوتمە گریان، وەرە، هەرچییەکم لەدەست بێت بۆتی دەکەم تا تۆ هەست بە ئاسوودەیی بکەیت. غەم لە دڵتا بتەرێتو لە گەرمای خۆشەویستی مندا تەندروستیت چاکتر بێت. منیش لە پەنای عەشقی تۆدا هەست بە ئارامی دەکەم؟ ئازیزم، ئازیزم، حەزدەکەم ژیانێکی پڕم هەبێت. پێم خۆش نیە لە بارەی ڕووداوو هەواڵی ڕۆژانەوە قسە بکەم. ئێستا ئەم شتانە لەبەرچاوم بێبایەخن. وەك هەمیشە دەخۆم، نیگەران دەبم، ئەمڕۆ لە نمایشی "خاڵ فانیا" زۆر شادمان بووم.

خەڵکیی لە بارەی تۆوە منیان بۆمباران کردووە کە ئایا کەی دێیت. "ماشا" خەڵك دەنێرێت بۆ لای من. ئایا من چیان پێبڵێم؟ (...).

منت خۆش بوێت و بڕوام پێبکە.

ئۆلگاکەت

* * *

**کنیپەر**

30 **سپتامبەر**

**"مۆسکۆ" تەلگورام**

زوو وەرە– ئۆقرەم لێبڕاوە.

* * *

**کنیپەر**

1 **ئۆکتۆبەر**

**"مۆسکۆ"**

دوێنێ "خاڵ ڤانیا"مان نمایش کرد ئازیزترینم، چ چێژێك و چ بەهرەیەك! ئەمە یەکەم نمایشنامەیە کە لەم وەرزەدا بینەر ئەوەندە بە گەرمی و خۆشەویستیەوە پێشوازی لێبکات (...). بیرم لە تۆ کردەوە ئازیزم، پێم خۆشبوو لێرە بویتایە بۆ ئەوەی بزانیت ئەکتەرو بینەر چەندە تۆیان خۆشدەوێت و چەندە بە سەرکەوتنت شادن (...).

لەوە دەچێت زۆر بە گەرمی کاربکەیت، هەستی پێدەکەم، چونکە لە بارەی نمایشنامەکەتەوە هیچ ناڵێیت، بۆم بنووسە ئازیزم، نمایشنامەی جوان بنووسە بۆ ئەوەی من و تۆ کاتێکی زۆر شاد پێکەوە بەسەربەرین (...).

* * *

**چیخۆف**

4 **ئۆکتوبەر**

**"یالتا"**

ئازیزترینم، ئەگەر بێم هەرگیز لە پێش ڕۆژی دوانزەدا ناتوانم، حەتمەن بۆت دەنووسم، نمایشنامەکەم گرفتێکی چکۆڵەی تیایە، دە ڕۆژ زیاترە هیچم نەنووسیوە، چونکە نەخۆش بووم و لەبەر ئەوەیش کە ماندووی کردبووم. نەمدەزانی بۆت بنووسم یان نا، تووشی هەڵامەت هاتبووم، قوڕگم دەیەشا، کۆکەیەکی وشکم هەبوو، بە دەگمەن دەڕۆیشتمە دەرەوە، هەمیشە سەرم دەیەشا، ئێستا خەریکە تەندروستیم باشتر دەبێت و دەتوانم بچمە دەرێ، هەرچیەك ڕوویدات نمایشنامەکە دەنووسرێت. بەڵام بۆ ئەم وەرزە پێناگات.

بیری ئوتێلێك و ژوورێکی ئامادەکراوم بۆ بکەرەوە. تکایە ئەم کارە بکە! ژوورێك کە ڕاڕەوە درێژەکەی ماندووم نەکات و بۆنی ناخۆش نەبێت. ڕەنگە لە مۆسکۆ پاکنووسی بەرهەمەکە بکەم، لە مۆسکۆوە دەچمە پاریس (...).

کیژی خۆشەویست، زێڕەکەم، تەندروست بیت (...)

ئانتونەکەت

* * *

**کنیپەر**

7 **ئۆکتۆبەر**

**مۆسکۆ- تەلەگرام**

ڕۆژی گەیشتنم بۆ تەلگراف بکە. نامە مەنووسە.

* * *

**چیخۆف**

8 **ئۆكتۆبەر**

**"یالّتا" تەلەگرام**

**ڕێك یانزەی ئۆكتۆبەر**

★ ★ ★

**كنیپەر**

11 **ئۆكتۆبەر**

**"مۆسكۆ"**

**چاوەڕێی نامەیەكیت ئانتونی ئازیزترینم، سەرسامیت، یان تووڕەیت لەوەی كە نامەم بۆ نەنووسیویت، نووسیوتە ڕۆژی دوانزەهەم دێیت بۆ "مۆسكۆ" پاشان تەلگراف دەكەیت كە حەتمەن 21 ئۆكتۆبەر دێیت. وای بۆ دەچووم هەڵەیەك لە ئارادایەو ژمارەكەت پاش‌و پێش نووسیوە (...).**

**دوێنێ بە ڕێكەوت لە "نمیروڤیچ"م بیست كە ڕاستە تۆ بیست‌و یەكی مانگ دێیت، بۆیە ئازیزەكەم وا بە پەلە بۆت دەنووسم، بۆ تەنیاییەكەت ئازار دەچێژم، خۆم بۆ ناگیرێت، بۆ دەبێت جوانیی ئەم مانگانەی پاییزمان لە كیس بچێت؟**

**من ئاسایی داخ لە ڕابوردوو ناخۆم، بەڵام بیری ئەو دواڕۆژانەی تێپەڕین‌و ئەم چركەساتانەی كە دەیانەوێت بەسەربچن، گەلێك خەم‌و پەژارەم دەدەنێ، ئەی تۆ؟ نازانم ئەم زستانە چۆن بەسەر بەرم، نازانم دەبێت لە كوێ بە دوای شادیدا بگەڕێم، لەوانەیە تەنیا لە كاردا بیدۆزمەوە. لێم تووڕە مەبە، ئەگەر تۆزێ گلەیی بكەم، دەزانم تۆ خۆیشت بێتاقەتیت. بەڵام ئازارەكانمان موژدەی كۆتاییەكی خۆشیان پێیە، وا نیە؟ بەهار ڕووناكی، گەرما، شادی‌و تازەبوونەوەمان بۆ دێنێت. حەتمەن بە خوێندنەوەی ئەم دێڕانە خەریكە لە پێكەنیندا لێك بیتەوە، بەڵام لە ناخی دڵتەوە دەزانیت من لەسەر هەقم، بێجگە لەمە شتی تر هەیە؟**

**تەندروستیت چۆنە؟** (...) **مەترسە، نامەوێت قسەكانم بە ڕوویەكی جیدی‌و ئەنجامی جیدیەوە وەربگریت، چونكە دەزانم چەندە لەوە دەترسیت** (...).

★ ★ ★

**چیخۆف**

14 **ئۆكتوبەر**

**"یالّتا"**

**ئازیزم، ڕۆژی 23 ئۆكتۆبەر، سەعات 5.30 ی دوای نیوەڕۆ لە "مۆسكۆ" دەبم. شەمەندەفەری ئیكسپریس بۆ ئەو ڕۆژە نیە، ئەگەر نمایشی شانۆییت هەیە پێویست ناكات بۆ بینینیم بێیتە وێزگە. ئاوو هەوای "یالّتا" دڵگیرە، تۆ ئاووهەوای وات نەبینیوە، هەموو شتێك بە تەواوی چڕۆی كردووە، درەختەكان سەوزن، خۆر لە درەوشانەوەدایەو دنیای گەرم كردووە، بەڵام زۆر گەرم نیە. سێ ڕۆژی ڕێك بەدوێنێوە، باران بە لێزمە دەباری، وەلێ ئەمڕۆ هەتاوە، پرسیاری نمایشنامەكەم لێ مەكە، گرنگ نیە ئەمساڵ ئامادە بێت یان نا.**

**لە مۆسكۆوە دەڕۆمە دەرەوەی وڵات** (...)

**بێگومان ڕۆژی 23 ئۆكتۆبەر لە شانۆ دەبم.**

**ئانتۆنەكەت**

★ ★ ★

**كنیپەر**

16 **ئۆكتۆبەر**

**"مۆسكۆ" تەلەگرام**

**نیگەرانم، نامەم بۆ بنووسە.**

★ ★ ★

**چیخۆف**

17 ئۆکتۆبەر

"یالتا" تەلەگرام

دوو شەممە دێم، حەتمەن.

★ ★ ★

**کنیپەر**

18 ئۆکتۆبەر

"مۆسکۆ" تەلەگرام

زوو وەرە، دەمەوێت بتبینم

★ ★ ★

**چیخۆف**

22 ئۆکتۆبەر

"لۆزڤایا"(2) تەلەگرام

خەریکی مەلەکردنم.

★ ★ ★

**کنیپەر**

؟ نۆڤەمبەر

"مۆسکۆ"

بە داخەوە بۆ پەردەی یەکەمی (کاتێك ئێمەی مردوو زیندوو بینەوە) پرۆڤەی سەر شانۆکە هیچ سەرنجی ڕانەکێشاوم. خوات لەگەڵ ئازیزم، دوای پرۆڤە دێم.

ئۆڵگاکەت

چیخۆف بە نیازی مانەوەی چەند ڕۆژێك چوو بۆ مۆسکۆ، بەڵام حەوت هەفتە لەوێ مایەوە. ڕۆژەکانی زیاتر لەگەڵ ئۆڵگادا بەسەر دەبرد، شەوانیش لە ئوتێل "دیرسدن"(3) دەمایەوە. ئەوە بووە هۆی ئەوەی بێ هیچ گرفتێك پێکەوە سەر لە خوشكو دایکی چیخۆف بدەن، هەرچەندە خوشكو دایکی ئاگاداری ئەو حاڵەتە بوونو ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لە مەسەلەکە بێتاقەت دەبوون.

★ ★ ★

**یاداشتی کنیپەر**

کە نووسەری خۆشەویستمان، نمایشنامەی سێ خوشکەکەی بۆ ئەکتەرو دەرهێنەرەکان خوێندەوە کە ماوەیەکی زۆر بوو چاوەڕێمان دەکرد، بێدەنگییەکی سەرسامکەر هەموو ئەو ناوەی داگرت.

چیخۆف زەردەخەنەیەکی بێدەستەڵاتانەی کرد، چەند جارێك بە تووڕەییەوە کۆکەی لێهات. هەستاو کەوتە پیاسە. هەندێك باری سەرنجمان گوێ لێبوو "ئەمە هێڵی گشتیەو نمایشنامە نیە، ئەمە بۆ نواندن نابێت.. کاراکتەرەکانی واقیعی نین. ئەمە چەند ئاماژەیەکەو هیچی تر".

چیخۆف لە مۆسکۆ چاوی بە دوو پەردەی سەرەتای شانۆنامەکەدا گێڕایەوە. پاشان چوو بۆ فەرەنساو ئیتالیا تا پاشماوەکەی لەوێ تەواو بکات. سستی پۆستو جێ بە خۆنەگرتنی بەردەوامی چیخۆف کاری خراپی کردە سەر نامەنووسینی بۆ ئۆڵگاو کەسانی ترو ناڕێكو پێکی کرد. ئەمەیش بوو بە هۆی ئەوەی زۆر تووشی گرژی ببێت.

چیخۆف کە چاوی بە نمایشنامەی سێ خوشکەکەدا گێڕایەوەو پیایدا چووەوە، تەواوی کردو ناردیەوە بۆ مۆسکۆ.

★ ★ ★

کنیپەر

11 دیسامبەر

"مۆسکۆ"

ناتوانم خۆم لەگەڵ بیّ تۆییدا ڕابێنم. بۆ ئەو کاتە وازت لێهێنام کە دەمانتوانی پێکەوە بین؟ دوێنیّ کە شەمەندەفەرەکە بە ڕێکەوت و تۆی لەگەل خۆیدا برد، بۆ یەکەم جارو لە پڕێکدا هەستم بەوە کرد کە ئەم جیابوونەوە ئازاراویە ڕاستە. لە دوای شەمەندەفەرەکەوە بەڕێکەوتم، دەتوت باوەڕم بەوە نیە شتێکی وا ڕوویدات، لە ناکاوێکدا قوڕگم پڕ بوو، دامە گریان، گریانێك زۆردەمێك بوو بۆ کەمترین کەسم کردبێت. بەوە خۆشحاڵ بووم کە "سولرژیتسکی"م لەگەڵدا بوو، تێمدەگەیشت و لە بەردەمی ئەودا شەرمم نەدەکرد فرمێسك بڕێژم، ئەو گەلێك بە ئەدەب بوو و ئاگادارم بوو. بە بێدەنگی پێکەوە دەڕۆیشتین. زۆر وەستاین تا سەکۆیەکمان دەستکەوت لە سەری دابنیشین و ئەوانەی بۆ بەڕێکردنی تۆ هاتبوون ئەوێیان چۆڵ کرد، بە ڕاستی حەزم لە بینینیشیان نەدەکرد. لە هەموویان بێزار بووم، گریان هەستێکی دڵنیایی بە من دەگەیاند، فرمێسکەکانم گەرمو بە خوڕ بوون، لەم چەند ساڵەی دواییدا فرمێسکم لەبیرچووبووەوە. گریام و حاڵم باشتر بوو، چووم بۆ بینینی "ماشا" و هەموو کاتەکە لە سووچێکدا دانیشتم و فرمێسکم ڕشت. "ماشا" لام دانیشت و هیچی نەوت "ماریاتیمۆفونا"[4] لە یەکێك لە ژوورە هێورەکاندا لەگەڵ "سولرژێسکی"دا قسەی دەکرد، پاشان هەموویان هاتن بۆ ماڵی ئێمە "سولرژیتسکی" بۆ ئەوەی بمانخاتە پێکەنین پرسیاری فیزیاو ئەندازەی لێدەکردین. سەرم لەنێو سەرینەکەدا شاردبووەوە. وەك لە خەودا بم هەموو ئەو شتانەم بەرگوێ دەکەوت. ئەو زۆر شتی لە بارەی ژیانی خۆیەوە باسکرد، تەڕدەستی بۆ دەکردن و منیش هەر بە خەیاڵمدا نەدەهات. بە تەواوی بیرم لای تۆ بوو، دەنگی جووڵانی شەمەندەفەرەکە لە سەرما دەنگی دەدایەوەو بۆنی غەریبی واگۆنەکانیش بە لووتما دەهات. دەمویست بزانم بیر لە چی دەکەیتەوە، چیت لەسەردایە، باوەڕدەکەیت من...

پاشان لە دۆخێکی ئارامدا نانمان خوارد "سولرژیتسکی" و "دروزدوڤا"[5] دەیانهێنایە پێکەنین، لاسایی زۆریان دەکردەوەو قسەی سەیریان دەکرد، دوای ڕۆیشتنی ئەوان چوومە ناو جێگاوە، خەوێکی زۆر خراپم کردو درەنگیش لە خەو هەستام. نزیك سەعات 12 چووم بۆ شانۆ، زانیم پرۆڤەی "دوژمنی گەل"مان نیە "ڕاڤسکایا" نەخۆشەو "کۆچی ڤروڤا"[6] لە باتی ئەو ڕۆڵ دەبینێت. بۆیە ئیدی پێویست بە دواخستنی نمایشەکە ناکات. کە لە شانۆ گەڕامەوە چووم بۆ هەواڵ پرسی "ڕاڤسکایا" حاڵم باشتر بوو، چێژم لە بینینی بەفر بارین چەشت. من حەزم لەم بێدەنگی و هێوریەیە. "ڕاڤسکایا" بە زەحمەت قسەی بۆ دەکرا، دەماری سیەکانی زۆر خراپ هەویان کردووەو تایەکەی 39 پلەیە. دوایی چوومەوە بۆ ماڵەوەو لەگەڵ "رالیا" و "لوریا"دا کەمێك یاریم کرد. نیوەڕۆژەم کردو کەوتمە نووسین بۆ تۆ ئانتۆنی ئازیزو دلۆڤانم.

ڕۆژی شەممە ئەم نامەیەت پێدەگات، پێنج ڕۆژ بەڕێوە دەبێت. وا نیە؟ چۆن گەیشتیتە ئەوێ؟ هاوسەفەرەکانت چۆن بوون، جگەرە کێشانیان بێزاری نەکردیت؟ قسەت لەگەڵدا کردن؟ هێشتا سەعات پێنج نەبووەو تۆ سەعات نۆ دەگەیتە وارشۆ. خۆت باش داپۆشەو ئاگاداربە کە شەمەندەفەرەکە دەگۆڕیت سەرمات نەبێت، لێم

تووڕە مەبە کە بەم شێوەیە قسەت لەگەڵدا دەکەم. تکایە هەر بە "دڵدارەکەم" و "تووتەڵەکە" و "کچۆڵە شکۆمەندە"کە بانگم بکە.

دەزانیت ئانتون من لە خەوبینین دەترسم، مەبەست لە لێکدانەوەی خەونەکانمە. بەڵام وای بۆ دەچم لە هەستی ئێمەدا شتێکی باش‌و بەهێز چەکەرەی کردبێت، کەوا بیردەکەمەوە هەست بە ئاسوودەیی دەکەم. دڵم ڕووناك دەبێتەوەو حەزدەکەم بژیم‌و کاربکەم. شتە وردەڵەکان لام بێبایەخ‌و ژیانی ڕۆژانە ئازارم پێناگەیەنێت، ئیتر لە بارەی مانای ژیانەوە بیرناکەمەوە. تۆیش هەر لە باوەڕەدایت‌و ئەو هەست‌و ئومێدەت هەیە کە ئێمە بتوانین سێ مانگ بە بێ یەکتری خۆمان پێبیگریت ئازیزەکەم؟ نازانم، بەڵام من وا بیردەکەمەوە کەتۆ سەرلەنوێ توانای کارکردن پەیدا بکەیتەوە، دەتوانیت لە "نیس" بە چاکی بحەسێیتەوە. پیاسە بکەیت‌و لەسەر مێزەکەت دابنیشیت‌و بنووسیت.

دەتوانیت پێم بڵێیت چی دەنووسیت؟ تەنیا چەند وشەیەك مادامەکی لە یادی ماڵ ئاوایمان لە "سڤاستوپول" و دوێنیدام، دوێنێ کە لە یەکتر جیابووینەوە هەستمان توندترو شەفاف تر بوو، وا نیە؟ من بەردەوامم لەسەر کارو ژیان، غەم دامناگرێت‌و بیر لە بەهارو پێکەوەبوون دەکەمەوە. ئەی تۆ ئازیزم؟ لە ئامێزت دەگرم، سەری ئازیزت، چاوە جوانەکانت، قژە نەرمەکەت، لێوو گۆنات، نێوچاوانی پڕ لە بیرکردنەوەت ماچ دەکەم. خۆشت بوێم‌و چەند دەتوانیت بۆم بنووسە.

**تووتەڵەکەت**

## پەراوێزەکان

1- یەکێك لەو پزیشکانەی چارەسەری چیخۆفیی دەکرد.

*2-Lozovaya*
*3-Dersden*
*4-Marya timofiona*
*5-Drozdova*
*6-Kocheverova*

## سەرچاوە

کتێبی دلبند عزیزترینم ل 79-89

# وێستگەکانی سەردەم

- **ماڵئاوا.. محەمەد ماغوت**

سەردەم

- **دیکارت و ڕۆشنگەری**

هاشم ساڵح

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

- **ژیان نامەی بورخیس**

ئیدوین ویلیامسون

لە عەرەبییەوە: فەرهاد

- **سوکراتی هەمیشە ئامادە**

عەلی حەرب

لە عەرەبییەوە: عەدالەت عەبدوڵڵا

- **جان جاك ڕۆسۆ...**

**بیرمەندێك لە زەمەنی ڕاوەدونانددا**

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

## ماڵئاوا...
## محەمەد ماغوت

سەردەم



ڕۆژی (3)ی نیسان شاعیری ناوداری عەرەب محەمەد ماغوت لە شاری دیمەشق دوا ماڵئاوایی لە ژیان کرد. ماغوت لە ناو ژیانی دەربەدەری و بەندیخانەو نەبوونیدا ڕسکاو، لەناوجەرگەی سیاسەت و ئایدۆلۆژیاوە گەڕایەوە بۆ ناو دنیای شیعر و جوانییە ناوازەکانی تری ژیان، وەك خۆی دەڵێت: "شیعر ماڵ و ئینتیمامە، شیعر تاقە پەناگامە" شیعرەکانی ماغوت پڕن لە ڕەخنە لە دەسەلات و پەیوەندیە ناجۆرەکانی کۆمەڵایەتی، هەمیشە یاخی و تووڕەیەوە گەلێك جاریش بە تەواوی ڕووی لە نا ئومێدیە.

ماغوت لە ناو شاعیرانی عەرەبدا بە باوکی ڕاستەقینەی شیعری پەخشان دادەنرێت و کاریگەریەکی زۆری لەو لایەنەوە لەسەر نەوەی دوای خۆی بەجێهێشتوە.

جابر عەسفوور دەڵێت: "بەڕای من ماغوت چاکترین شاعیری عەرەبە کە شیعری پەخشانی نووسیبێت. توانیویەتی قەناعەتی ئەوەیشمان پێبکات کە ئەو شێوازە ڕەوایەتی خۆی هەیە. لە نووسینی ئەو جۆرە شیعرەدا لاسایی هیچ شاعیرێکی خۆراوایی نەکردۆتەوەو خاوەنی دەنگی ڕەسەنی خۆیەتی، ژیانیشی بێجگە لە خەم و مەینەتباری چیتر نەبوە".

شەوقی بەغدادیش دەڵێت: "محەمەد ماغوت بلیمەتی پەخشانە شیعر و شانۆنامەیە".

حەنامینەی ڕۆمان نووسی ناوداری سوورییش دەڵێت: "ماغوت یەکێکە لە کۆڵەکەکانی شیعری عەرەبی و باوکی ڕاستەقینەی قەسیدەی پەخشانە".

بەرهەمە شیعریو شانۆیی‌و تەنانەت نووسینە ڕۆژنامەییەکانی ماغوت مایەی سەرنجدان و پەرۆشیی خوێنەر بووە، ئەو بەردەوام و بە توندی دەستی لەسەر کێشەکان داناوەو لەوەیش نەترساوە چ پێش هاتێك چاوەڕێیەتی.

هەمیشە لە نێوان خۆشەویستی و ڕقدا هەڵبژاردەیەکی ناوازانەی بوەو، ژیانیشی لای خۆیەوە وەك ئەوە نەدیوە کە سیستەم و دەسەلاتدارەکان نەخشەیان بۆ کێشاوە.

خۆی دەڵێت: "من ڕقم لە کەس نیە، کەسیشم خۆش ناوێت، لە ژیانما نەکەسم خۆشویستووەو نە ڕقیشم لە کەس بوە بێجگە لە هەژارەکان". هەر کە باسی خۆیشی دەکات دەڵێت: "من دەرگاوانی بەرقاپی غەمم".

شەوقی بەغدادییش کە هەواڵی مەرگی ماغوت دەبیستێت دەڵێت: "بە هەواڵی مەرگی ماغوت دانەچڵەکیم وەك دووڕووەکان وا دەڵێن، چونکە من بەردەوام لەو بڕوایەدابووم کە شاعیرەکان –کە بە مەرەکەب قەرەبووی ژیانیان دەکەنەوە– هیچ ناکەن بێجگە لە نووسینی شیعر و درووونی کراسی مردن".

**بەشێك لە بەرهەمەکانی محەمەد ماغوت:**

1–غەم لەبەر تریفەدا، شیعر.

2–ژورێك و ملیونان دیوار، شیعر.

3–چۆلەکەی قەموور، شانۆنامە.

4–بەختیاریم نەکردۆتە پیشە، شیعر.

5–لێبوك، شانۆنامە.

6–جۆلانە، رۆمان.

7–سنوور، فیلمی سینەمایی.

8–لە دەرەوەی پۆل، شانۆنامە.

9–حیکایەتەکانی شەو، درامای تەلەفزیونی.

10–هەڵەکە لە کوێدایە، درامای تەلەفزیونی.

ئەمانەو چەندان بەرهەمی تریش.

شایانی باسە کە رۆژی (5)ی نیسان لەرێورەسمێکی شکۆمەندانەدا تەرمی ئەم شاعیرە گەورەیە لە شارۆچکەی (سلمیة)ی شوێنی لەدایکبوونی بەخاك سپێرا، لە شاری دیمەشقەوە وەك یەکێك لە گەورە پیاوان بەرەو شارەکەی بەرێکرا، هەردوو وەزیری روناکبیری و راگەیاندنی سوریا، و رووناکبیر و نووسەر و هونەرمەندانی گەورەو ئەو جەماوەرەی کە هەمیشە ماغوت و شیعرەکانیان خۆشویستووە، تەرمەکەیان بەرێکرد.

# دیکارت و رۆشنگەری

## هاشم سالح

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**



(1)

فەیلەسوفی فەرەنسی "رینێیە دیکارت"، کەسێکی بێئەندازە بەناوبانگە.. کێ هەیە ناوی "دیکارت"ی نەبیستبێت؟ ئەی ئەو دامەزرێنەری ئەقلانیەت نییە، تا ئەو ئاستەی لەگەڵ ئەقلانییەتدا تێکەڵ بووە؟ کاتێك بە شتێك دەڵێین دیکارتییە، ئەوە مانای وایە ئەو شتە ئەقلانییە. یان کاتێك دەڵێین فەرەنساییەکان دیکارتین، ئەمە بەو مانایە دێت کە ئەوان ئەقلانیین. ئەم فەیلەسوفە کاریگەری لەسەر تەواوی میللەتێك بەجێهێشت، بەرادەیەك ئەستەمە بتوانرێت جیاوازی لە نێوان کارەکتەری ئەو و میللەتی فەرەنسیدا بکرێت. ئەو خۆی بە تەنها نەتەوەیەك بوو، تەنانەت رێکخستنی شەقام و گۆرەپانە گشتیەکان لە فەرەنسادا. لە رووی وردەکاری و دیسپلینەوە هەمان خەسڵەتی میتۆدی دیکارتیان هەیە. بەڵام کێ ئەوە دەزانێت کە "دیکارت" ترسی زۆری لە پیاوانی کڵێسا هەبووە و بە درێژایی تەمەنیشی خۆی لێپاراستوون؟ "دیکارت" رێگایەکی زۆری گرتەبەر تا خۆی لە بەڵای پیاوانی ئایینی بپارێزێت. لەبەرئەوە فەرەنسای بەجێهێشت کەلەو سەردەمەدا پڕی بوو لە فێندەمێنتالستی کاتۆلیکی، بۆ ئەوەی لە وڵاتێکی پرۆتستانتی لیبرالی وەك هۆڵەندادا بژی، بەڵام تەنانەت لەوێشدا بەردەوام شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی دەگۆری و تارادەیەکی زۆریش خۆی وندەکرد، تا بتوانێت بە ئازادی بنوسێت و بیربکاتەوە.

"دیکارت" دەیزانی حەقیقەتگەلێکی گەورەی لە بواری زانست و فەلسەفەدا کەشفکردووە، بەڵام هێشتا

وەختیان نەهاتووە ئاشکرا بکرێن. گەر ئاشکراش بکرێن ئەوا یەك ڕاست بەرئەو هەڵە باوانە دەکەون کە لەسەردەم و زەمانی ئەودا، وەکو ڕاستی حاشا هەڵنەگر خۆیان نیشان دەدا. یەکەمین هەڵەیەکیش "دیکارت" ڕووبەڕووی دەبووەوە، ئەو بۆچوونە بوو کە پێیوابوو زەوی سەنتەری گەردونە و خۆر بە دەوری زەویدا دەسوڕێتەوە. ئەمەش بۆ خۆی وتەزایەکی "ئەرستۆ تالیسی" و "پەتلیمۆسی"یەو، مەسیحیەتیش تەبەنی کرد و ڕەوایەتی ئایینی پێبەخشی. لێرەوە ئەوەی بەم تێزەیە ناڕازی بێت، هەر بە تەنها بەرپەرچی تیۆریایەکی زانستی ناداتەوە، بەڵکو بەگژ ئاینێکیشدا دەچێتەوە و بەمجۆرەش خۆی ڕووبەڕووی مەترسی دەکاتەوە.. سەروەختێك "دیکارت" ئەوەی پێگەیشت کە "گالیلۆ" لەلایەن ڤاتیکانەوە تاوانبارکراوە، ترسی لێنیشت و کتێبەکەی لە چاپخانە کێشایەوە.. شایەنی باسە هێندەی نەمابوو بە ئاشکرا بۆچونەکانی بخاتەڕوو، ئەویش لە ڕێی وتارێکەوە کە سستمی جیهانی سروشتی باس دەکات و داکۆکی لە تیۆریاکەی "کۆپەر نیکۆس" دەکات، سەبارەت بە سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا. لەم سەروبەندەدا "دیکارت" بە هاوڕێ دڵسۆزەکانی دەڵێت: (من نامەوێت لە پێناو بۆچونەکانمدا، ژیانی خۆم بخەمە مەترسییەوە). لە پای ئەمەشدا هەندێك بە ترسنۆك و کەمتەرخەم تاوانباریانکرد، بەڵام کێشەی ئەوانە لەوەدایە کە ئەم پرسیارە لە خۆیان ناکەن: (فایدەی بەچی گەر خۆی دوچاری ڕاوەدوونان و یان تەنانەت پاکتاوکردنی جەستەیش بکات، بەر لەوەی توانیبێتی پەیامەکەی خۆی تەواو بکات؟).

"دیکارت" لەو کاتەدا تەمەنی گەشتبوو چل ساڵان، کەواتە دەرفەتی زۆری لەبەردەمدا مابوو بۆ ئەوەی پەی بە شتگەلێکی دیکە بەرێت. گەر بهاتبایە لەم ماوەیەدا ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی کڵێسا بوایەتەوە، ئەوا بە ئاسانی تێکدەشکاو نەیدەتوانی شێلگیرانە بیرو بۆچونەکانی کامڵتر بکات و لە گەڕانیدا بە شوێن حەقیقەتدا بەردەوام بێت. لێرەدا ناچاربوو ستراتیژیەتی شاردنەوە و سازشکردن بگرێتەبەر، تا بتوانێت ساڵانێکی زیاتر بژی و تێزی فیکری نوێ بێنێتە ئارا کە دەست بەجێو دوای لە دنیا دەرچوونی بە گژ فێندەمێنتالیزمی ئەرسۆدەکسیدا چووەوە. سەر وەختێك فێندەمێنتالیستەکان لە مەترسی ئەو تێزانەی بە ئاگا هاتنەوە، کە کاری خۆی لە کۆمەڵگە کرد بوو. بەمجۆرە "دیکارت" ئەمانەتەکەی گەیاند و بە ئارامی لە گۆڕەکەیدا سەری نایەوە.

بێگومان پیاوانی ئایینی کتێبەکانی ئەویان خستە لیستی قەدەغەکراوەکان، لەگەڵ کتێبەکانی: "کۆپەرنیکۆس و گالیلۆ و پاسکال و کیبلەر" و دەیان فەیلەسوف و زانای دیکە. بەڵام تازە بەچی دەچێت! خۆ بیر و بۆچونەکانی بە هەموو ئەوروپادا بڵاوبووەوەو فەلسەفەکەشی بوو بە بابەتی خوێندن لە چەندین زانکۆی هۆڵەندا و وڵاتانی دیکەدا. بەمجۆرە "دیکارت" بە کاوە خوێو بێ هیچ هەراو زەنایەك، گورزی خۆی وەشاند. ئەو دەیزانی شەڕێکی دوور و درێژ و گرانی لەبەردەمدایە و هێزە تاریك و داخراوەکانیش ڕەگوڕیشەیەکی پتەویان هەیە و هەروا بە ئاسانی لەق نابێت، کەواتە پێویستە ڕاستەوخۆ ڕووبەڕویان نەبینەوە، بەڵکو

بەشێوەیەکی پەنهان و لابەلا ئەو پرۆسەیە ئەنجام بدەین. "دیکارت" بە کارێکی پێویستی دەزانی کە فەیلەسوف دەمامك بپۆشێت و زووبەزوو دەستی خۆی ئاشکرانەکات.

ئەو یەکێکە لەو فەیلەسوفە مەزنانەی مێژووی فیکری کرد بە دوو بەشەوە، پێش خۆی و پاش خۆی. هەروەها توانی گەورەترین کۆدێتای فەلسەفی لە مێژووی سەردەمە نوێیەکاندا بەرپا بکات، ئەمەش ئەو کۆدێتایە بوو کە "ئەرستۆ"ی لەسەرتەختی فەلسەفە هێنایە خوارێ و کۆتایی بە دەسەڵاتی هێنا کە بۆ ماوەی دوو هەزار ساڵ بەردەوام بوو. هەژموونی فەلسەفەی "ئەرستۆ" موسڵمانان و ئەوروپای مەسیحیشی وەکو یەك گرتەوە، بەڵام بەهاتنی "دیکارت" فەلسەفەی مۆدێرن دەست پێدەکات.

پێکدادانی نێوان زانا و فەیلەسوفان و فێندەمێنتالستە مەسیحیەکان شتێکی چاوەڕوانکراو بوو، لەبەرئەوە شاڵاوی ڕاوەدوونانی زانا و فەیلەسوفەکان لەسەرجەم ئەوروپادا زیادی کرد. بۆ نموونە لە هۆڵەنداو دەستبەجێ دوای دادگایکردنەکەی "گالیلۆ"، پزیشك و زانای بواری کیمیا "ڤان هێلمۆنت" دەسگیرکرا. لە بەلجیکاش "بێرنۆی" زانا ناچار بوو لە وڵات هەڵبێت. هاوکات پڕۆفیسۆر "ڤان فێلدین" لە زانکۆی (لۆڤان) زیندانیکرا، ئەویش بە تۆمەتی داکۆکیکردن لەو تیۆریا زانستیە نوێیانەی باس لە دروستبونی گەردوون دەکەن، کە بێگومان پێچەوانەی ئەو شتانەیە لە (سفر التکوین)دا هاتووە. هەروەها لە ئیسپانیاش دادگاکانی پشکنین سانسۆرێکی توندیان دانابوو، لەبەرئەوە "سابیکۆ"ی پزیشك، تێکڕای نوسین و بەرهەمەکانی خۆی بە ناوی کچەکەیەوە بڵاودەکردەوە، دوای چوار سەد ساڵ لە مردنی، ئەم فێڵەیان بۆ ئاشکرا بوو! هەر لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا چاودێریکردنی خود لە لایەن خودەوە، تەشەنەی سەند.. ئەمە وا یکرد زانایان تەنها دوای لە دنیا دەرچونیان، لێکۆڵینەوەکانیان بڵاوبکەنەوە، ئەگەر بڵاویشیان بکردایەتەوە، ئەوا ئەو پەرەگرافانەیان لێ لادەبرد کە لەگەڵ بۆچونی پیاوانی کڵێسادا نەدەگونجا.

ساڵی 1546 بە تۆمەتی کوفر و بێباوەڕی بیریاری هیومانستی "ئیتیان دۆڵی" سوتێندرا، لەبەرئەوەی داکۆکی لە لێکبوردنی ئایینی دەکرد. هەرچی بیریاری ئیتاڵی "کامبانێلا"شە، بۆ ماوەی زیاد لە چارەکە سەدەیەك زیندانیکرا، پاش ئەوەی دادگاکانی پشکنین دەستنوسەکانیان لێبرد. ئەمە لە کاتێکدا کە زانا و فەیلەسوفی بەناوبانگ "جۆردانۆ برۆنۆ"یان بە شێوەیەکی ترسناك کوشت و دواتر لە ئەشکەوتە تاریکەکانی ڤاتیکاندا و دروست لە ساڵی 1600دا، لاشەیان کردە خۆراکی ئاگر. کەواتە ئیتر چۆن "دیکارت" لە زوڵم و زۆرییان ناترسێت؟ لەبەرئەوە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی (وتارێك دەربارەی میتۆد)، لە ساڵی 1637دا بەبێ ناو بڵاوکردەوە.

ئەگەرچی ئەو کتێبەی زۆر بە وریاییەوە نوسی بوو، چەند جارێکیش ڕایگەیاندبوو کە پابەندی پرانسیپەکانی ئەو ئایینەیە کە لە ئامێزیدا گەورە بووە. تەنانەت کتێبە مەزنەکەی (ڕامانە میتافیزیکاییەکان)ی پێشکەش بە فەقیهە گەورەکانی سۆربۆنکرد، بۆ ئەوەی ڕەزامەندی ئەوان بەدەست بێنێت. ئەوکات سۆربۆن ئەو زانکۆیە نەبوو کە ئەمڕۆ

دەیبینین، بەڵکو تەنها بریتی بوو لە کۆلێژێکی تیۆلۆژی مەسیحی کە ناوبانگێکی گەورە و گرانی لە ناوخۆ و دەرەوەی فەرەنسادا هەبوو. دەسەڵاتی ئەوەی هەبوو کتێب قەدەغە بکات یاخود مۆڵەتی بڵاوبوونەوەی بداتێ. هەروەها دەیتوانی فتوای ئاییني دەرهەق بە بیریاران دەربکات و بە خواستی خۆی ئەوەی بیەوێت تەکفیری بکات و ئەوەشی نەیەوێت سەرفرازی بکات. بەڵام هەموو ئەو ئامادەکاری و شازشکردنەی "دیکارت" کردی، دواجار زۆر بە تەنگیەوە نەهات و دادی نەدا. لە ساڵی 1649، واتە بە ساڵێك بەر لە مردنی، قەشەیەك لە قەشەکان بەناوی کوفر و لادانەوە، فتوایەکی لە دژی کتێبەکەی (پرانسیپەکانی فەلسەفە) دەرکرد.

لە ساڵی 1663دا، واتە سیانزە ساڵ دوای لە دنیا دەرچوونی، ڤاتیکان کتێبەکانی خستە لیستی کتێبە قەدەغەکراوەکانەوە. ئەمانە ئەو کتێبانەن کە کڵێسای کاتۆلیکی، لایەنگرانی خۆی مۆجیاری دەکات بەوەی بە هیچ شێوەیەك نەیان خوێننەوە، لەبەرئەوەی پێچەوانەی ناوەڕۆکی عەقیدەی مەسیحین.

"دیکارت" لە ماوەی ژیانیدا بە حەسرەتەوە بوو، لەبەرئەوەی زانستی سروشتی بە بەراورد لەگەڵ زانستی خوداناسی، سەربەخۆیی خۆی وەرنەگرتبووە. هەڵوێستیشی لەم ڕووەوە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ هەڵوێستی "گالیلۆ" و "پاسکاڵ"دا نییە. ئەوانیش دەیانووت: (ئەگەر جۆرە ناکۆکییەك لە نێوان بیروڕای کڵێسا و یەکێك لە تیۆریاکانی زانستی مۆدێرندا دروست بوو، ئەوا پێویستە سەرلەنوێ تاوتوێی بیروڕاکانی کڵێسا بکەینەوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ زانست و ئەقڵدا بگونجێت). دواتر بزاوتی مێژوو بەو ئاقارەدا ڕۆیشت کە ئەو فەیلەسوفانە نەخشاندبویان.

ڕاستە سەردەمەکەیان گوێی بۆنەگرتن، بەڵام دواجار دەرکەوت ئەوان ڕاستیان پێکاوەو تەواوی سەردەمەکەشیان هەڵەبوون. تەنانەت "پاپا"ی ئێستایش، دانەبە مەزنیاندا دەنێت و داوای لێبوردن دەکات لەو هەڵانەی لە مێژووی ڕابردوودا، کڵێسا دەرهەق بەوان ئەنجامی داوە.

(2)

شایەنی باسە زۆربەی زۆری فەیلەسوفە فەرەنسییەکان خاوەنی هێزێکی ڕەتکردنەوەو نایاندن و مەیلێکی کۆدێتاگەرانە بوون. ئەو فەیلەسوفەی نازانێت بەسەردەم و کۆمەڵگەکەی بڵێت (نا)، فەیلەسوف نییە. یەکەمین خەسڵەتی بیریارە مەزنەکان ئەو خواستە گەورەیەیە بۆ دوورکەوتنەوە لە (مێگەل) و ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ ئەو بیروبۆچونانەی لەسەردەمەکەیاندا باڵادەستن، ئەویش بەو مەبەستەی ئەو بۆچونانە لەبەریەك هەڵوەشێنن و وەلاوەیان بنێن، لە پێناو هێنانە ئارای بۆچونگەلێکی نوێدا. چونکە داهاتوو تەنها لەسەر داروپەردوی ڕابردوو دروست دەبێت.

لەم ماوەی دوایدا کتێبێکی قەوارە گەورە لە پاریس دەرچوو، کتێبەکە دەربارەی فەلسەفەی فەرەنسیە لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە تا ئەمڕۆ. سەرپەرشتیاری گشتی کتێبەکە لێکۆڵیار "دۆنی ویسمان"ە، کە پێشتر مامۆستای فەلسەفە بووە لە زانکۆی نیویۆرك و هەنوکەش لە زانکۆی سۆربۆنە. ژمارەیەك

لێکۆڵیار بەشدارییان لە نوسینی ئەم کتێبەدا کردووە، کە بریتین لە: "ئالان دۆلیبیرا" دەربارەی قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاست، "کلۆد مۆرالی" دەربارەی سەردەمی ڕێنیسانس، "ماری فردریش بیلیگران" دەربارەی سەدەی حەڤدە و فەلسەفەی دیکارتیزم، "جان لۆڤران" دەربارەی سەدەی هەژدە و سەردەمی ڕۆشنگەری، هەروەها جارێکی کەش "جان لۆڤران" دەربارەی سەدەی نۆزدە، دواجار "دۆنی ویسمان" دەربارەی سەدەی بیستەم. بەمجۆرە دەبینین تەواوی سەدەکان لەلایەن لێکۆڵیاری پسپۆڕ و بەناوبانگەوە، بەسەر کراوەتەوە.. ئەوەی دەیەوێت شتێك دەربارەی فەلسەفەی فەرەنسی بزانێت، با ئەم کتێبە بخوێنێتەوە کە لە شەشسەد لاپەڕە زیاترە. من بۆ خۆم چێژێکی زۆرم لە خوێندنەوەی بینی، بەتایبەت پێشەکیە گشتیەکەی و ئەو نەسکەشی تایبەت بوو بە "دیکارت" و سەردەمی ڕۆشنگەری، لێرەدا لێکدانەوەی نوێ و بۆچونی تازەم بینی کە پێشتر بێئاگابووم لێیان و وەك پێویست لێیان تێنەگەشتبووم.

لە پێشەکی گشتی کتێبەکەدا "دۆنی و سیمان"ی سەرپەرشتیاری پرۆژەکە دەڵێت: (بۆچونێکی باو هەیە پێیوایە فەرەنسا ولأتێکی فەلسەفی نییە و ئەوانەشی وا دەڵێن بەهانەیان ئەوەیە کە فەرەنسیەکان وەك ئەڵەمانیای دراوسێیان و تەنانەت وەك ئنگلیزەکانیش، خاوەنی سەرێکی میتافیزیکی نین. تەنانەت زمانەکەشیان بۆ فەلسەفە و گوزارشتکردن لە زاراوە و دەستەواژە پڕ پێچوپەناکانی دروست نەبووە. بگرە هەندێ جار ئەوانە دەگەنە ئەو ڕایەی بپرسن و بڵێن: ئەرێ بەڕاست شتێك هەیە بەناوی فەلسەفەی فەرەنسی؟!). دەرهەق بەم پرسیارە ناقۆڵایە پرۆفیسۆر "دۆنی ویسمان" دەڵێت: (بەڵێ فەلسەفەی فەرەنسی بوونی هەیە و سەنگ و قورسایی خۆشی هەیە!). هەر لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: (من پرکێشی زیاتر دەکەم و دەڵێم فەلسەفەی فەرەنسی شەرم ناکات لەوەی خۆی بە مەزنترین دوو فەلسەفە بەراورد بکات کە لە دنیا هەن: ئەوانیش فەلسەفەی یۆنانی و فەلسەفەی ئەڵەمانین. فەیلەسوفانی فەرەنسا دەشێت بە سوکرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ و هیگڵ و کانت و هایدگەر، بەراورد بکرێن.. فەیلەسوفانی ئێمە بەڕاستی فەیلەسوفن و هەر بە تەنها وەکو هەندێك پێیان وایە نوسەر و ئەدیب نین.. دوا جار چ نەنگیەکی تێدایە گەر فەیلەسوف نوسەرێکی مەزنیش بێت؟). پاشان "دۆنی ویسمان" دێتە سەر ئەژمارکردنی هەندێك فەیلەسوفی بەناوبانگ، هەر لە "ئەبیلاروسان بیرنارەوە لە سەدەکانی ناوەڕاست، تا مۆنتێن و دیکارت و ڕۆسۆ و ڤۆلتێر و پاسکال و مالبرانش و بیرگسۆن و سارتەر و دۆلۆز و دێریدا لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا".

لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین کە بە سوك سەیرکردنی فەلسەفەی فەرەنسی، لە ڕۆشنبیرانی فەرەنسی خۆیانەوە سەرچاوە دەگرێت، بە تایبەت ئەوانەیان کە زۆر لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی ئەڵمانیدان. چونکە ئەوانە پێیان وایە فەرەنسییەکان بۆ فەلسەفە دروست نەبوون، لەبەرئەوەی ڕۆحیان سوکەڵەو ڕوکەشە و فەلسەفەش پێویستی بە ئەقڵی سەنگین و مێشکی فراوان هەیە وەك مێشك و ئەقڵی ئەڵەمانەکان، ئەو ئەڵەمانانەی روباری ڕاین لە فەرەنسیەکانیان جیادەکاتەوە.

بەلأم ئەم قسانە ناچنە گیرفانەوە، بۆ نمونە "کانت" زیاد لە جارێك دان بەوەدا دەنێت کە قەرزار باری "جان جاك رۆسۆ"یە. لە لایەکی ترەوە "هیگڵ"، "دیکارت" بە قارەمانی فیکر و دامەزرێنەری ڕاستەقینەی فەلسەفەی مۆدێرن ناونوس دەکات. لە ڕاستیدا "دیکارت" کاریگەریەکی گەورەی لەسەر سەردەمی خۆی و تەواوی سەردەمی نوێ بەجێهێشت. هەروەها "مارکس" باس لە گرنگی ئەو ڕۆڵە گەورەیە دەکات کە سوسیالیزمە فەرەنسیەکان لەبەرەو پێشبردنی فیکردا، گێڕاویانە. کەواتە بۆچی فەرەنسییەکان بەشێوەیەکی مازۆخیانە خۆیان بچوك دەکەنەوە و لەبەردەم ئەڵەمانەکاندا بە چۆکدا دێن؟ بۆچی بە ئەڵەمانەکان سەرسامن و فەیلەسوفانی خۆشیان لەو ئاستە بەرزەدان؟!

سەبارەت بەوەشی کە زمانی فەرەنسی لە ئاست فەلسەفاندندا دەستەوستانە، قسەیەکی زۆر بێمانایە. لەلایەکی ترەوە "میشیل سێر"، یەکێك لە گەورە فەیلەسوفانی فەرەنسا لە ساتەوەختی ئێستادا، پێیوایە: (بە درێژایی ڕۆژگار خەسڵەتی سەرەکی زۆربەی زۆری فەیلەسوفانی فەرەنسا ئەوەیە کە تێکڕایان دووچاری چەوسانەوە و ڕاوەدونان بونەتەوەو ناچاربوون لە تاراوگەدا بژین! بۆ نمونە ڕینییە دیکارت، ناچار بوو ولأتی خۆی جێبهێڵێت و بۆ ماوەی بیست ساڵ لە هۆڵەندا بژی. پاشان بۆ ماوەی چەند مانگێك لە سوید مایەوە و لەوێ لای شاژنە کریستین گیانی سپارد.. دیکارت کاتێك ولأتی جێهێشت، دەیویست لەو فەزا ناهەموارە ڕزگاری بێت کە لە فەرەنسادا هەبوو، بەهۆی هەژمونی ترادسیۆن و دۆگمای ئەقڵی و فێندەمێنتالستی کاتۆلیکیەوە). زۆربەی فەیلەسوفانی فەرەنسا، وەکو "میشیل سێر" دەڵێت: (هەستیاندەکرد بێگانەن لە نیشتمانی خۆیاندا و هاوسەردەمەکانیان تەرێزیان لێدەکەن.. ئەم فەیلەسوفانە لە ڕێی یاخیبوون لە ئەقڵیەتی باوو لێکشیتاڵکردنی بۆچوونە بەسەرچووەکانەوە، خۆیان سەلماند.. دیکارت بەگژ ئەرستۆ و تۆمای ئەکوینیدا چووەوە). وەکو ئاشکرایە فەلسەفەی سکولائی — واتە فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست کە لە قوتابخانەکانی ئەو سەردەمەدا لەلایەن قەشەکانەوە بە خوێندکاران دەوترا—، بریتی بوو لە تێکەڵیەك لە فەلسەفەی ئەرستۆ تالیسی و بیروباوەڕی مەسیحی. کێ ئەرکی ئەم تێکەڵکردنەی گرتە ئەستۆ و بەم کارە هەستا؟ ئەوەی ئەم کارەی کرد، "تۆمای ئەکوینی" بوو. ئەم پیاوە بۆ ماوەی چەندین سەدە لە جیهانی مەسیحیدا، هەیبەتێکی فیکری گەورەی هەبوو. تەنانەت تا هەنوکەش ڕێبازەکەی هەر بەردەوامە، ئەویش لە ڕێگای "تۆماییەکان" و فەلسەفەی تۆماییەوە.. ئەی بابزانین دیکارت" چیکرد؟ ئەوەی "دیکارت" کردی کۆدێتایەکی گەورەبوو بەسەر فەلسەفەی "تۆما"یدا و بەم کارەشی زەمینەی لەبەردەم هاتنە ئارای سەردەمی نوێدا خۆشکرد. گرنگی "دیکارت" لە مێژووی فەلسەفەدا، لێرەدایە. هەر لەبەرئەمەشە "هیگڵ" بە قارەمانێك لە قارەمانەکانی فیکری مرۆڤایەتی ناونوسی دەکات.

لە ڕاستیدا زۆربەی فەیلەسوفانی فەرەنسا خاوەنی هێزی ڕەتکردنەوەو نایاندن و مەیلێکی کۆدێتاگەرانە بوون. لەبەرئەوە زۆربەیان ڕووبەڕووی

سەرکۆنەکردن بوونەوە لەلایەن دەسەلأتەکانی سەردەمەکەیانەوە، ئیتر دەسەلأتی تیۆلۆژی بووبێت یان سیاسی یاخود کۆمەلأیەتی.. خەلّك لە دوایدا نرخ و بەهایان زانین، واتە دوای ئەوەی مردن و باجێکی گەورەیان دا. چاکترین نمونەش لەم ڕووەوە، "جان جاك ڕۆسۆ"یە. "ڕۆسۆ" وەك کەسێکی نەفرەت لێکراو ڕاوە دونراو ژیاو وەك مرۆڤێکی تاوانبار و ترسناك سەیر دەکرا!! خەلّك بەردبارانیان دەکردو پەنجەرەی مالّەکەیان دەشکاند، بەلأم دوای دەسالّ شۆڕشی فەرەنسی بەرپا دەبێت و یاد دەکرێتەوە. هەروەها لاشەکەی دەگوازنەوە بۆ گۆڕستانی کەسایەتیە مەزنەکان و کتێبەکانی دەکەنە دەستورو بەرنامە بۆ کۆماری فەرەنسا!

لەلایەکی ترەوە "ڤۆلتێر"یش لە زیندانی بەناوبانگی (باستیل)دا دیلکراو دوای ئەوە بەرەو بەریتانیا هەلّهات، بەلأم بە پێچەوانەی "ڕۆسۆ"وە، "ڤۆلتێر" سێ مانگ بەر لە مردنی جەماوەر لە شەقامەکانی پاریسدا ڕێزیان لێناو ستایشیان کرد! لەگەلّ ئەوەشدا پیاوانی کلّێسا قبولّیان نەبوو نوێژی لەسەر بکەن یاخود لە گۆڕستانی مەسیحیەکاندا بینێژن، لەبەرئەوەی بەکافرو زەندیقیان دەزانی. هەروەها "دیدرۆ" بۆ ماوەیەك لە زیندانی "ڤانسین" زیندانی کرا، بەلأم "کۆندرسیە" بڕیاری مردنی بەسەردا دراو لە زینداندا خۆی کوشت. دەکرێت هەمان شت دەربارەی دەیان بیریاری دیکەش بلّێین. بە کورتی هەموو ئەوانەی لە ئێستادا فەرەنساشانازییان پێوە دەکات و شەقام و گۆڕەپانە گشتییەکانی بەناوی ئەوانەوە ناودەنێت، لەسەردەم و ڕۆژگاری خۆیاندا دژایەتی کراون و ڕاوەدونراون و بە نەفرەت کراون. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە پێویستە بیریار لە پێناو ڕاستی و بۆچونەکانیدا، باج بدات. ئەوەی دەیەوێت لە بواری فیکردا باج نەدات، ئەوا باپروات لە بری فیکر و فەلسەفە، کارێکی دیکە بکات.

لێرە بەدواوە کەم تا کورتێك دەچمەوە سەر ئەو نەسکەی تەرخانە بۆ "دیکارت" و ئەو نەسکەی باس لە سەردەمی ڕۆشنگەری دەکات. سەبارەت بە "دیکارت" نوسەر دەلّێت: (سەدەی حەڤدە، سەدەی فەلسەفەی دیکارتیزمە). تەواوی ئەو فەیلەسوفە فەرەنسیانەی دوای "دیکارت" هاتن، یان درێژکراوەی ئەون یاخود دژ بە ئەون. فەلسەفەی "دیکارت" سەربەخۆیی فیکری ڕەهای ئەقلّ ڕادەگەیەنێت و بە بۆچونی ئەو ئەقلّ بڕیار لەسەر هەموو شتێك دەدات، گەر ڕاست بێت یان هەلّە، چاك بێت یان خراپ. پێویستە هەموو ئایدیاو بیرو باوەڕێك ملکەچ بێت بۆ پشکنینی ئەقلّ و بە شێوەیەکی لۆژیکی تاوتویّ بکرێت، بەرلەوەی پەسەندی بکەین یاخود ڕەتی بکەینەوە. لەمڕۆ بەدواوە نابێت پەسەندی بۆچونێك بکەین، بە بیانوی ئەوەی سەرچاوەکەی "ئەرستۆ" یان "تۆمای ئەکوینی" یاخود سەرچاوەیەکی ئایینی یان فەلسەفی دیکەیە. لەبەرئەوەی خۆمان خاوەنی ئەقلّێکین کە یەزدان پێبەخشیوین و مافی ئەوەمان هەیە بەکاری بهێنین تا چاك لە خراپی پێجیابکەینەوە. کەواتە بۆ دەبێت تا ئەبەد، شوێن کەلەپوورێکی دووبارە و قسە و باسی پێشینان بکەوین؟

بۆ ئەوەی بگەینە حەقیقەت، پێویستە میتۆدی گومانی ڕادیکالی بگرینە بەر. بەلأم دەبێت گومانکردنێکی بونیادنەر پەیڕەو بکەین، نەك وێرانکەر. "دیکارت" کەسێکی گومانکار و

عەدەمی نەبوو، لەبەرئەوەی حەزی بە گومانکردن بووبێت، بەڵکو دەیویست بگاتە شتێك، بگاتە ئەنجامێك و توانی بگات. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە میتۆدە ئەقلانیەکەی بوو بە عەقیدەی خۆرئاوا، خۆرئاوای گەیاندە قۆناغی کۆنترۆڵکردنی سروشت و گەردون. کەواتە گومانکردنی ئەو بەرهەمهێن بوو، نەك گومانێکی نەزۆك بێت کە مرۆڤ لە ناخەوە وێران بکات. "دیکارت" گەیشتە ئەوەی گومان لە هەموو ئەو شتانە بکات کە لە قۆناغی منداڵی و قوتابخانەدا فێری بوو بوو، بەمجۆرە توانی بیروبۆچونە هەڵەکان لە ناخی خۆیدا ڕیشە کێش بکات.

بێگومان ئەم پرۆسەیە پرۆسەیەکی ترسناکە و دەرەنجامەکانیشی مسۆگەر نییە. چونکە ڕەنگە ببێتە مایەی تێکدانی هاوسەنگی و شلۆقبونی کارەکتەری مرۆڤ، لەبەرئەوەی لەو کاتەدا تۆ دەچیتە شەڕێکەوە لەگەڵ خۆت و لەگەڵ کۆی ئەو شتانەی لە منداڵیەوە پێیان ڕاهاتویت و فێریان بوویت. ئەم جەنگە بێ ئامانەی مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆیدا، ئەو جەنگەیە کە "دیکارت" داوامان لێدەکات ئەنجامی بدەین. ئەمەش هەمان ئەو شەڕەیە کە خۆی تێیدا سەرکەوت، دوای ماوەیەکی زۆر لە گومان و سەرگەردانی و ونبوون. "دیکارت" بەر لەوەی بگاتە حەقیقەت، دوچاری سەرگەردانی و ونبونێکی زۆر هات. کەواتە "دیکارت" یەکێکە لەو بیریارانەی دابڕانی گەورەی لە مێژووی فیکردا دروستکردووە، بەم پێیە ئەو دامەزرێنەری سەردەمە نوێیەکانەو ئەو کەسەشە کە کۆتایی بەسەدەکانی ناوەڕاست دێنێت. لێرەوە دەتوانین بڵێین: (فەلسەفە بەر لە دیکارت شتێکەو، دوای ئەویش شتێکی دییە). لەم کتێبەدا باس لە گرنگی دوو کتێبی سەرەکی "دیکارت" دەکرێت، ئەوانیش بریتین لە: (وتارێك دەربارەی میتۆد و ڕامانە میتافیزیکاییەکان).

سەبارەت بە سەردەمی ڕۆشنگەریش کە ڕاستەوخۆ دوای سەردەمی "دیکارت" دێت و بە درێژە پێدەری ئەو دادەنرێت، لێرەدا ناتوانم زۆر بە دوورو درێژی باسی لێ بکەم. ئەوەی دەمەوێت لێرەدا بیڵێم ئەوەیە کە ڕۆشنگەری ئەو سەردەمەیە تەواوی شارستانیەتی خۆرئاوای لەسەر دروست دەبێت، واتە ئەو شارستانیەتەی ئەمڕۆ هەموومان لە سایەیدا دەژین. سەبارەت بەم مەسەلەیە "جان لۆڤران" دەڵێت: (سەردەمی ڕۆشنگەری دوای تێپەڕبوونی دوو سەد ساڵ بەسەریدا و تا ئەمڕۆ، بە داهێنان و بوێری و نوێگەرییەوە سەراسیمەمان دەکات. چونکە توانی میللەتانی ئەوروپایی لە قۆناغی ملکەچی بۆ دەسەڵاتی ڕەهایان بۆ بیروباوەڕی تیۆلۆژی مەسیحی، بگوازێتەوە بۆ قۆناغی ئازادی و ڕۆشنگەری ئەقڵ. لەم سەردەمەدا فەیلەسوفەکان توانیان بنەماکانی فێندەمێنتالستی مەسیحیەتی ئۆرسۆدەکسی لەبەریەك هەڵوەشێنن و لە ڕێی ئەمەشەوە مۆنتسکیۆ دەستی کرد بە لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لە یەکدی، بەمجۆرە بوار لەبەردەم هاتنە ئارای سستمی دیموکراسی و حوکمی یاسادا ڕەخسا).

### سەرچاوە

الشرق الأوسط
(1) 2004/7/17.
(2) 2003/3/30.

# ژیان نامەی بورخیس

**ئیدوین ویلیامسون**

**لە عەرەبییەوە: فەرهاد**




نووسەری ئەم کتێبە باسکارو رەخنەگر ئیدوین ویلیامسونە کە پسپۆرە لە ئەدەبی ئەمریکای لاتیندا بە گشتی و بەرهەمی لویس بورخیس بە تایبەتی. لە کتێبەکەیدا باس لە ژیاننامەی ئەم نووسەرە بلیمەتە دەکات کە تا ئێستا ئەرجەنتین نموونەی وای نەخستۆتەوە. ناوبانگی بورخیس سنووری وڵاتەکەی خۆی بەزاندووەو، تەنانەت سنووری ئەمریکای لاتین و ئەوروپا و هەموو دنیایش. کەواتە دەبێت ئەم نووسەرە گەورەیە کێ بێت؟

جورج "خورخە لویس بورخیس" ساڵی 1899 لە شاری بونیس ئایرسی پایتەختەی ئەرجەنتین لەدایکبووە. ئەویش لە ماڵی باپیریدا کە دەکەوتە ناوەڕاستی شارەکەوە. سەر بە بنەماڵەیەکی بۆرژوای دەوڵەمەند بوو. هەر بە منداڵی فێری زمانی ئینگلیزی بوو وەك چۆن زمانی ئەرجەنتینی دەزانی. بێجگە لە زمانی ئیسپانی کە زمانی ئەسڵیەتی. پاشان فێری زمانی فەرەنسی بوو چونکە لە سویسرادا ژیاو بڕوانامەی بەکالۆری ساڵی 1918 لەوێ وەرگرت. باوکی هەموو خێزانەکەی بردە ئەوروپا. بە تایبەتی بۆ جنێف. ئەمە لە ساڵی 1915-1921 دا. لەوێ بۆ یەکەمین جار هەستی کرد کە چارەنووسی ئەو بێجگە لە نووسەری هیچی تر نیە و ئەو پەتایە لە ناخیدا چەکەرەی کرد. بۆیە بورخیس ئەوەندە لە ناو ئەدەبدا توایەوە تابوون بەیەك شت، ئەو بەهەشتی بە کتێبخانەیەکی گەورە دادەنا کە جۆرەها کتێبی لە خۆگرتووە، لە دۆزەخەکەی دانتیەوە، تا سۆڤ گەرەکانی عەرەب و هەزارو یەك شەوە و ڤیرجیل و هومیرۆس و سیرڤانتس و کولریدج و ڕۆمانی پۆلیسی.. هتد.

نووسەری کتێبەکە لەسەر باسەکەی دەڕوات و دەڵێت: ڕووداوێکی گرنگ لە ژیانی بورخیسدا دەوری کاریگەری هەبوو بۆ ئایندەی، ئەویش ئەوە بوو کە لە شوێنێکی بەرزەوە کەوتە خوارێ، ئەم کەوتنە باری تەندروستی بۆرخیسی تێك داو وردە وردە لە بینینی خست، تا لە دواییدا کوێر بوو، ئەمە بۆ کەسێك کە لە ژیانیا خۆشترین شت خوێندنەوەی کتێب بێت کارەساتێکی گەورە بوو. هەر لە تەمەنی چل ساڵیەوە نیوە کوێر بوو، کەچی بوو بە ناودارترین نووسەری سەردەمەکەی.

لە نێوان ساڵانی 1918-1919دا خێزانەکەی لە ئیتالیادا ژیانیان بەسەر برد. لە تەمەنی بیست ساڵیدا بە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی شیعری دانا و خەریکی زمانی ئەڵمانی بوو شیعری هانریش هاینەی پێی خوێندەوە. هەروەها بەرهەمی شکسپیر و نیچە و ئەو نووسەر و هونەرمەندانەی سەر بە قوتابخانەی ئینتباعی ئەڵمانی بوون ساڵی 1920 بۆیەکەمجار

شیعری والت وایتمانی خوێندەوە. تا کۆتایی ژیانی سەرسام بوو بەم شاعیرە گەورەیەی ئەمریکاوە. هەر لەو قۆناغەدا بۆ یەکەمین جار کەوتە نێو ئیسپانیاوەو بە هەموو جێگاکانیدا گەڕاو شارە ئەفسووناویەکەی بەرشلونەی بینی ئیسپانیا بە نیسبەت دانیشتوانی ئەرجەنتینەوە وەك نیشتمانی دایك وا بوو، چونکە بۆ ماوەیەکی زۆر لە ژێر دەستی ئیسپانیادا بوو زمان و کلتوری خۆیانیان دابوونێ. بورخیس لە شاری مەدرید نووسەرێکی ناسی بە ناوی (رافائیل کاتسیوس) کە زۆر پێی سەرسام و کردی بە مامۆستای خۆی، ئەم نووسەرە گەلێك شەیدای ئەدەب و تەنیا بۆ ئەدەب و نووسین دەژیا. کتێبخانەیەکی زۆر گەورەی لە ماڵەکەیدا هەبوو کە کتێب تابن میچەکە بەسەریەکدا کەڵەکە کرابوو. یەکێکیش بوو لە وەرگێڕەهەرە نایابەکانی بەرهەمە ناوازەکانی دنیای وەك هەزارو یەك شەوە. پاشان بورخیس گەڕایەوە وڵاتەکەی و لە بونیس ئایرسی پایتەختا ساڵی 1921 لەسەر ئەرکی باوکی کە زۆر شەیدای ئەدەب بوو کەوتە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی. ساڵی 1924 گەڕایەوە بۆ ئەوروپا تا زیاتر شارەزای پاریس و لەندەن و ئیشبیلیە و شوێنانی تر ببێت. ساڵی 1925 دیوانە شیعرێکی بەناوی (مانگی بەرانبەر)ەوە بڵاوکردەوە. وەلێ دوایی بەبیانووی ئەوەی شیعرەکان خراپ بوون نکوولّی لێکردن.

بورخیس تا دەهات زیاتر رۆدەچووە ناو ژیانی ئەدەبی ئەرجەنتین و هەموو ئەمریکای لاتینەوە. بووە ئەندامی گرنگترین گۆڤاری روناکبیری، بەردەوام کەوتە بڵاوکردنەوەی شیعر و کتێبی رەخنەیی و وەرگێڕان. هەندێك لە کارەکانی کافکا، فۆکنەر، شاعیری فەرەنسی هنری میشۆ و چەندانی تری وەرگێڕایە سەر زمانی ئیسپانی. دوای ئەوەی کە کوێر بوو، یان بینینی زۆر خراپ بوو، پشتی بە دایکی و هاوڕێکانی دەبەست بۆ خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی کە دەیویست، یان ئەوەی کە خۆی دەینووسی. بێگومان بۆ لاوێك کە لە نێوەندی تەمەندا بێت ئەم کوێربوونە زۆر کاریگەریەکی ناخۆشی هەبوو. بە تایبەتی بۆ کەسێکی ئەدیبی وەك ئەو کە چاو لە هەرە پێویستیەکانەو کەڕبوون زۆر لەوەچاکتر بوو.

لە ساڵی 1946دا دەستی لە لێپرسراویەتی کتێبخانەی نیشتمانی ئەرجەنتینی کێشاوە وەك نارەزایی دەربڕین بەرانبەر بە دیکتاتۆریەتی "بیرون" پاشان بۆ ماوەی سێ ساڵ بوو بە سەرۆکی نووسەرانی ئەرجەنتین و بەردەوامیش بوو لە دژایەتی کردنی ڕژێمی بیرون، بەڵام لە نووسین و بڵاوکردنەوە نەکەوت. ساڵی 1955 بەختی هێنای و بیرون کەوت بیری تازە داینایەوە بە بەڕێوەبەری کتێبخانەی نیشتمانی کە پلەیەکی بەرزەو تا رادەیەك بە پلەی وەزیری دادەنرێت. ئیتر بە تەواوی کوێر بوو. لە چێژی خوێندنەوە و نووسین بێبەش بوو. بەڵام خۆی بە دەستەوە نەداو نکوولی لەو نەخۆشیە کردو بایەخی زۆری نەدایە. ئەم شیعرانەی لەو سەردەمانەدا نووسی: "کەس نیە فرمێسك برێژێ و ویستی خودا رەت بکاتەوە کە کتێب و کوێریی لە یەك کاتدا پێبەخشیوم ئای کە دوو شتی دژ بەیەك و ناوازەن!" بورخیس زۆر بە دڵ فراوانیەوە ئەو بەسەرهاتەی قبووڵ کرد.

ساڵی 1956 بوو بە مامۆستای ئەدەبی ئینگلیزی لە زانکۆی بونیس ئایرس. ئەگەرچی لەو کاتەدا تەواو کوێر

ببوو بەڵام وانەکانی لەبەردەکرد و بە قوتابیانی دەوتەوە.

لە ساڵی 1961دا خەڵاتێکی گەورەی بەهاوبەشی لەگەڵ سەموئیل بیکیتدا وەرگرت. پاشان حکومەتی ئیتالیا وەك رێزنان لە کارە ئەدەبی و فیکریەکانی میداڵێکی شەرەفی باڵای پێ بەخشی.

پاشان لەگەڵ دایکیدا سەفەری ولاَتە یەکگرتوەکانی ئەمریکای کرد و تا ساڵی 1962 لەوێ مایەوەو گەلێك وتاربێژیی لە زانکۆی تەکساسدا کرد و هەر لەو ساڵەدا گەڕایەوە بۆ بۆینس ئایرس، لەوێوە سەرپەرشتی چاپکردنی کتێبەکانی خۆی کرد لە فەرەنسا و ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. پاشان حکوومەتی فەرەنسا لەسەر پێشنیازی ئەندرێ مالرۆی وەزیری رۆشنبیری و هاوڕێ بورخیس میداڵێکی بەرزی پێ بەخشی. هەر لەو ساڵەیشدا گەشتی ئەوروپای کرد. لەوانە ئینگلتەرا، سویسرا، سوید، ئیسپانیا و فەرەنسا، پەیوەندی بورخیس لە هەموو ژیانیدا پەیوەندیەکی زۆر بەهێز بوو، بۆیە لە هەموو ئەو گەشتانەدا هاوسەفەری بوو، ئەگەر چی دوای مردنی دایکی ژیانی تادەهات بەرەو خراپی دەچوو، بەڵام بەردەوام بۆ هەر ولاَتێك بچوایە ڕووناکبیرەکانی دەبینی، وتاری بە رۆژنامەکان دەنووسی و شیعری بۆ رۆژنامەنووسان دەخوێندەوە.

لە ساڵی 1969دا رۆژنامەنووسیی فەرەنسی "ئەندرێ کامب" دیمانەیەکی درێژی لەگەڵدا سازداوە کە باس لە بۆچوونە فەلسەفی و بونیاد گەریەکانی خۆی دەکات. هەر لە سەرەتای دیمانەکەدا کامپ لێی دەپرسێت: تۆ بڕوات بە پێشکەوتن هەیە؟ بورخیس وەلاَمی دەداتەوە: بە درێژایی ژیانم لەوە گەیشتووم کە پێشکەوتن لە ژیانی مرۆڤایەتیدا هەیە. لە ڕابردوودا خەڵکیی لە ئێستا کێوی تربوون و بێ پاساوو بێ ئەوەی هەست بە ئازاری ویژدان بکەن تاوانیان دەکرد. بەڵام ئەمڕۆ بەشێکی گەورەی مرۆڤایەتی کەوتۆتە ناو دنیای شارستانیەتەوە، تەنانەت ئەگەر کەسانێکی خراپ هەبن هەمیشە هەوڵی ئەوەیانە پاساوێك بۆ کارە خراپەکانیان بهێننەوە.

بەڵام لە ڕابوردوودا پێویستیان بەو پاساوە نەبوو. ئەمە جیاوازی نێوان ئێستاو ڕابووردوە کە خۆی لە خۆیدا پێشکەوتنی مرۆڤایەتیە.

بێجگە لەوەی کە پێشکەوتنێکی زانستی و پزیشکی و تەکنەلۆژی وا لە ئارادایە کە کەس ناتوانێت نکوولی لێ بکات یان بایەخی پێ نەدات.

پاشان بورخیس دەڵێت: فەلسەفەی یونانی و بڕوای یەکتاپەرستی زیاد لە شتی تر کاریگەری زۆریان لەسەر مرۆڤایەتی داناوە. بە مانایەکی دی سوکرات و مەسیح لانی کەم بە مامۆستای خۆراوا دەدرێنە قەڵەم، نکوولی لە گرنگی دوای ئەوانیش ناکرێت بە تایبەتی رۆشنگەری. شۆرشی فەرەنسی، شۆڕشی ئەمریکی، راگەیاندنی مافی مرۆڤ و هاونیشتمانی، گەلاَڵە بوونی رژێمی نوێی دیموکراتی، هەموو ئەمانەی مەشخەڵی مێژووی مرۆڤایەتین.

پێویستە گەلانی تر، وەك گەلانی پێشکەوتووی ئەوروپا، سیستمی دیموکراتیەت پیادە بکەن. وەك ئەنجام گومان لەوەدانیە کە پێشکەوتنێکی بەرچاو لە مێژوودا هەیە، ئەگەر وا نەبێت نەخوێندەوار و زانا یەکسان دەبن بەیەك، هەروەها

دواکەوتن و پێشکەوتن و مرۆڤی کێوی و شارستانی.

پاشان بورخیس لەسەر قسەکانی دەڕوات و دەڵێت: ئەدەبی خەیاڵی یان ئەفسانەیی ریالیزمی تری لە ئەدەبی ریالیزمی، بۆ؟ چونکە ئەدەبی ریالیزمی وابەستەی واقیعە، یان هەلومەرج و ئەو ساتەوەختەیە، بەڵام ئەدەبی فانتازی لەسەروو هەموو هەلومەرج و چرکەساتەکانەوەیە و سەردەمەکان دەبەزێنێت، بۆ نموونە سیرفانتس و رۆمانی دونکیشوتەکەی. سیرفانتس کە نووسەری رۆمانەکەیە مردوە و کۆتایی هاتوە و ئێمەیش مەبەستمان نیە، بەڵام کارەکتەری ڕۆمانەکە، دۆنکیشۆت، تا ئێستا لەناو ئەفسوونیداین. کەواتە ئەو راستەقینەترە لە نووسەرەکەی. دونکیشوت کەسایەتیەکە رۆژبەرۆژ.. لەگەڵماندا دەژی.

ساڵی 1970 بۆرخیس بۆ خەڵاتی نۆبڵ دەستنیشان کرا، بەڵام بەرینەکەوت و درا بە سوڵجنستین، دوایی بڕوانامەی دوکتۆرای فەخری لە زانکۆی کۆڵۆمبیای نیویورک درایە. هەروەها لە زانکۆی ئۆکسفۆردیش.

ساڵی 1973 شارەوانی بوینس ئایرس نازناوی: بەناوبانگترین هاونیشتمانی ئەرجەنتینی پێ بەخشی. پاشان بۆ وتاربێژی گەشتێکی بە ئەمریکا، ئیسپانیا، ژاپۆن.. هتد کرد. بەردەوامیش دەیوت: لەگەڵ ئەوەیشدا کە کوێرم و ئەو وڵاتانە نابینم کە بۆیان دەچم وەلێ هەستیان پێ دەکەم و چێژ لە سەفەرەکانیش دەبینم، ئەگەر هەر لە بوینس ئایرسدا بمێنمەوە بێزار و بێ تاقەت دەبم. پاشان سەفەر ئەو هەستە تازانەم پێ دەبەخشێت کە پێشتر نەمزانیون. ئەمەنە دەبنە سروت و نووسینەکانم دەوڵەمەند دەکەن.

ساڵی 1975 دایکی لە تەمەنی نەوەدو نۆ ساڵیدا مرد، کە هاوڕێی گیانی بە گیانی و هەمیشە لەگەڵیدا بوو. لە ڕاستیدا دایکی بە درێژایی بیستو سێ ساڵی پێش مردنی لە گیانەڵادا بوو. دوایی بورخیس چوو بۆ وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ وەرگرتنی خەڵاتێکی گەورە، لەوێ وتارێکی خوێندەوە و وتی: سوپاسی ئەم هەڵە گەورەیەتان دەکەم کە بەخشینی ئەم خەڵاتە بوو بە من.

بۆرخیس لەگەڵێك زانکۆی دنیاوە بڕوانامەی دوکتۆرای فەخری پێدرا وەك سوربوون، مەدرید، توکیۆ و زانکۆی تر. ساڵی 1983 سەرۆکی ئەوسای فەرەنسا فرانسوامیتران، لە ئاهەنگێکی ناوازەدا، میداڵی شەرەفی فەرەنسی لە پلەی یەکەمدا دایە. ساڵی 1983 چیرۆکێکی نووسی و تیایدا بانگەشەی ئەوە دەکات کە لە فلأنە رۆژداخۆی دەکوژێت. کە ئەو رۆژە تێپەڕی و ئەو خۆی نەکوشت رۆژنامەکان لەو بارەیەوە پرسیاریان لێکرد و ئەویش وای وەڵامدانەوە: لە ڕاستیدا لە ماوەی ئەم هەشتاو چوار ساڵەی تەمەنمدا، هەموو رۆژێك خۆکوژیم کردوە، کێ دەڵێت تا ئێستا خۆم نەکوشتوە؟ رەنگە ئەو بورخیسەی ئێستا دەیبینن بورخیسی راستەقینە نەبێت.. لەوانەیە بورخیسەکەی پێشوو دەمێك بێ مردبێت..

ئەمە بەشێك بوو لە ژیاننامەی بورخیس کە بۆ ماوەی نیو سەدە زیاتر دنیای پڕکردبوو لە باسی خۆی.

**سەرچاوە**

بیان الکتب، 18ی دیسەمبەری 2005 ژمارە 9313

لە کتێبی (چیرۆکە ژیانی بورخیس)ەوە.

# سوکراتی هەمیشە ئامادە

عەلی حەرب
لە عەرەبییەوە: عەدالەت عەبدوڵلا



ئایا هێشتا بوارێك ماوە بۆ قسەکردن لە سوکرات*؟ ئایا قسەی لە بارەیەوە تەواو نەبوو؟

هەر بە ڕاستیش، چ قسەیەك هێشتا لەسەر سوکرات نەکراوە، ئەو قسە تازەیەش چییە کە لێی بکرێت، لە فکر و ژیانی پێکەوە؟

گومان لەوەدا نییە سوکرات مامۆستایەکی گەورەبوو لە مامۆستاکانی فکر، بەڵکو ئەو مامۆستای یەکەم بوو. بۆ نا، ئەوێك کە هەروەك ئەرستۆ لە بارەیەوە وتویەتی، یەکەم کەس بێت کە بەڕادە و پێوانە داوای زانین بکات. دیارە ڕادەو پێوانەش دوو بوارن لە بوارەکانی لۆژیك و دوو مەرجن لە مەرجەکانی زانست.

ئەگەر سوکرات نەبوایە ئەفلاتۆنیش نەدەبوو کە تاڕادەیەکی زۆر دروستکراوی ئەو بوو. مامۆستای مەزن-یش ئەوە نییە کە یەك جار و دوایین جار فێرمان دەکات، بەڵکو ئەوەیە کە بە بەردەوامی لێوەی فێر دەبین. لەم ڕووەوە، ئەو دانابڕێت لەوەی کێشەکان بە ڕووی عەقڵدا بوروژێنێ و ئاسۆکان و لەبەردەم زەیندا بکاتەوە. مامۆستای مەزنیش ئەوە نییە هەموو شتێك بڵێ، بەڵکو ئەوەیە هەمیشە بوارێك بۆ قسەکردن بەجێ دەهێڵێت، واتە بۆ ئەوەی کە دواتر دەوترێت. دەشێت هەر بە بۆنەی خودی ئەمەشەوە، واتە لەبەرئەوەی هەموو شتێك ناڵێت، هەمیشە بەختی بیرکردنەوەمان دەداتێ و قسەکردن دەکاتە شتێکی لەدەستهاتوو. بەکورتی مامۆستای مەزن ئەوەیە کە لە کاتی خوێندنەوەیدا پرسیار تازە دەبێتەوە و لە ڕوانینیش بۆ وتەزاکانی ئەگەری تازە دەردەکەون بۆ فکر، ئەمەیە پێگەی سوکرات. سوکرات هێشتا، وەك زۆربەی ئەوانەی لەسەریان نووسیوە، دەیڵێین "لوغزی سەرسوڕمێن"یشە، ئەوەتا کیسیدیسیش لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر سوکرات بە قسەکردن لەسەر ئەو لوغزە دەکاتەوە کە لە سوکراتدا هەیە، ئیدی لە فکریدا بێت یان لە ژیانی. چۆن نا لە فکریدا، سوقراتێك کە ئەو بوو وتی: یەکەم جار خۆت بناسە.. زانینی مرۆڤیش بۆ خودی خۆی بنەڕەتی زانینە بەڵکو تەواوی زانست و گەوهەری داناییە. هەر لەبەرئەوە، سوکرات بە درێژایی ژیانی لە فێرکردن و فێربوون ڕانەوەستا. هەر ئەویش بوو کە ووتی: هەموو ئەوەی کە دەیزانم ئەوەیە کە هیچ شتێك نازانم. ئەمەش جێی سەرسوڕمان نییە، بیرمەندی مەزن چەند لە توێژینەوەدا ووردببێتەوە و ڕۆبچێتە بیرکردنەوەوە لێبڕاو نابێت و بڕیار نادات، بەڵکو بەردەوامبوونی فکر و بینین، لە پرسیارکردن دوایی پێدێنێ و لە بینینی شتەکاندا لە هەموو ڕووەکانیانەوە.

بەو جۆرە ئەفلاتۆن بڕیاردەرێکی دۆگما دەستی پێکرد، ئەگەر ئەم گوزارشتە تەواو بێت، بە

دیالیکتیکگەرایەکی پەکخەر کۆتایی پیٚ هات. چ داوەرییەك ناکا و ڕایەکی لێبڕاوانەش نادات، بەڵکو هەوڵی کۆکردنەوەی ناو دژەکان دەدات، یان ڕاستتر بڵێین، لە خۆگرتنی دژبەیەکەکان. لەم ڕووەوە، دژ لە دەقی ئەفلاتۆندا بەرگری و ئارگیۆمێنتی (حجە) خۆی هەیە. ئەگەر ئەم دەقەش گوتاری بوون و شوناس و یەکبوون و جێگیری و ئایدیاڵ بێت ئەوە ئەفلاتۆنیش بە تواناترین و پێگەیشتووترین کەسە کە لە بەرژەوەندیی نابوون و جیاکاری و فرەیی و گۆڕانکاری و هەستپێکراو داکۆکی کردووە، چونکە فکر کرانەوەیە بەسەر هەموو ڕاستییەکدا، دژ-یش ڕاستیی خۆی هەیە و بەشی خۆی هەیە لە بوون. لێرەوە بیرمەندی ڕاستەقینە پرسیارەکان دردۆنگی دەکەن و دۆشدامان سەغڵەتی دەکات و هەمیشە ڕووی لوغزداریشی لە شتەکاندا بۆ دەردەکەوێت و ڕووی گرفتیش لە هەر ڕایەك کە بەدیی بکات لە زەینیدا دادەمەزرێت. ئەگەریش بیرمەند ئەوە بێت کە شتێکی بۆ ئاشکرا دەبێت یان گرفتێکی لەلا چارەسەر دەبێت، ئەوا بیرمەندی ڕاستەقینە ئەوەیشە کە ئەگەر لوغزێك چارە بکات ئەوە بیری ئەو دەیگوێزێتەوە بۆ لوغزێکی تر. بیرمەند ئەو کەسەیشە کە ئەگەر شتێکی زانی ئەوە بە بۆنەی ئەوەوە نەزانینی شتێکی تری بۆ ئاشکرا دەبێت، ئەمەش مەغزای داننانی سوکراتە بە نەزانین. ئەوەش تەنها خاکیبوونی فەیلەسوفێك نەبوو، بەڵکو بە مانایەك لە ماناکان، وتنێکی بەڵگەئامێزە لەسەر چییەتی فکر. دەشێت داننانی سوکرات بە نەزانین نموونەیەکیش بێت بۆ ئەو قسەیەی کە هەموو قسەیەکی دی دەکاتە شتێکی لە دەستهاتوو، هەر ئەمەشە ڕووی لوغزی سوکرات. ئەمە مەینەتیی مانایە.

بەڵام لوغزی سوکرات تەنها لە فکریدا داناخرێت، بەڵکو ئەو لوغزەیە کە بەتایبەت و لە ژیانیشیدا دادەخرێت، ئەمەش جێی سەرسوڕمان نییە، سوکرات فەیلەسوفێکی دانابوو و بگرە نمونەی پیاوی دانا و نموونەی مرۆڤی کامڵ بوو. داناییش تەنها دیدێکی پەتی نییە، بەڵکو زانست و کاریشە، ئەوە مرۆڤی کامڵیشە کە بە زانستی ڕاست دەزانیٚ لە پێناوی کاری ڕاستدا، لەم ڕووەوە زانست، بەبیٚ کار، کەموکورتە و هەرواش کار بەبیٚ زانست مەحاڵە. سوکرات، بە بیر و هەڵسوکەوتی و بەڕاو هەڵوێستی خەڵکی فێرکرد، ئەو بە ڕاستی نمونەو پێشەنگ بوو، یا بڵێین ئەو بەرێك بوو لە بەرهەمەکانی ئەو سەرەتا مەزنەی کە سەرسوڕمێن-ی (الأعجوبة) گریکی بەرجەستەی کرد. قسەش لەسەر سەرسورمێن تەواو نابێت. گومانی تێدا نییە کە کتێبی کیسیدسیش هەوڵێکی نوێیە بۆ چارەسەرکردنی لوغزی سوکراتی. ئەگەر وتەزاکانی سوکراتیش، وەك قوتابییەکانی یان ئەوانەی کە لە دوای ئەوەوە هاتن دەیگێڕنەوە، فێرمان بکا و هانمان بدات بۆ بیرکردنەوە، ئەوە ژیانی ئەو مامۆستایەکی گەورەیە بۆ ئێمە و شەهیدبوونیشی ئەو لوغزە گەورەترەیە کە نەوەستاوین هەوڵ دەدەین بۆ لێکدانەوە و لێکجیاکردنەوەی ڕەمزەکانی..

بۆچی سوکرات ملی بۆ دەرکردنی بڕیارێك بە لە سێدارەدانی کەچ کرد سەرەڕای ئەوەی کە باوەڕی وابوو حوکمێکی ناڕەوایە بە هەقی؟ بۆچیش سزای لە سێدارەدانی بەویستی تەواوی خۆی جێبەجیٚ کرا، سەرەڕای ئەوەی قوتابییە بە وەفاکانی هۆکارەکانی هەڵهاتنیان

بۆ ئامادەکردبوو؟ بۆچی پیاوەکە ئازایانە، ئەگەر نەڵێین بە ئەعسابی ساردەوە، مەرگی بە باشتر زانی؟ ڕاستیی ئەوە لە چیدایە و ئاماژە و مەغزای چییە؟

گومانی تێدا نییە وەڵامدانەوە بۆ ئەم پرسیارانە بە جیاوازیی لێکۆڵەرانی سوکرات و لێکدەرەوانی لوغزی ئەو، جیاوازە. دەشێت شەهیدبوونی سوکرات داهێنانێکی پەتی بێت بۆ ئەوەی ئەفسانەی دەستپێك تەواوبکرێت. دەشێت بۆ سەرەتای عەقڵ و فەلسەفە پێویست بێت هەروەك خودی خوداش کردویەتی بە ئەرك بۆ هەریەکێك کە دەسکارییەك و ڕێکەوتنێك لەم جیهانەدا بەدی ناکات. دەشێت مردنی ئەو ئاماژەبێت بۆ منی یاخی لەناو هەریەکێکماندا، دەشێت شەهیدبوونیشی بە مانای ململانێی هەمیشەیی بێت لە نێوان مافی تاك و مافی کۆمەڵ، واتە لە نێوان مانا و هێز، نێوان زانست و دەسەلاَت، نێوان هەق و ڕاستی. دەشێت سوکرات ملدانی بۆ سیستمێکی ناڕەوا لە ئاژاوە و دەرچوون و لە یاساکان لا باشتر بوو بێت، ئەمەش بە بۆنەی ئەو ستەمەی کە بەدوای دەرچوون و یاخیبوون دێت لە ستەم. دەشێت هەڵگرتنی ستەمی لە ستەمکردن پیَ باشتر بووبێت وەك ئەفلاتۆن لە یەکێك لە گفتوگۆکانیدا ئاماژەی بۆ دەکات: ئەگەر لەسەر مرۆڤ پێویست بیَ هەڵبژێرێت لە نێوان ئەوەی ستەمکاربێت یان ستەملێکراو، ئەوە ستەملێکراو لە ستەمکار باشترە یان سەختییەکەی لەو کەمترە. شەهیدبوونیشی گەواهییە لەسەر ئەوەی کە ئەوەی گەواهی بۆ ڕاستی بدات بیَ ئەملاوئەولا شەهیدە. هەڵهاتنیش لە کوێدایە ئەگەر نرخی گەواهیدان بۆ ڕاستی شەهیدبوون بێت. ڕەنگە سوکرات درکی بەوە کردبێت بۆیە ڕووبەڕووبوونەوەی مەرگی پێباشتر بوو. لەم ڕووەوە ئەو ئەگەر بۆ هەق لێرە بوونی نەبێت، هەروەك سۆفیگەری وای دەبینێت، ئیدی هەڵهاتن بۆ شوێنێکی دی بۆ؟ یان ڕاستتر بڵێین، ئەگەر فەیلەسوف گەڕیدە بە دوای ڕەها و بە ڕەهایی و بۆ ڕەهایی گەواهی لەسەر ڕاستی بدا و لە هەموو شوێنێك و هەموو حاڵەتێکدا بۆی گەواهی بدات، ئەوە لە ڕووبوونەوەی قەدەری خۆی دەربازبوونی بۆ نییە، چونکە مرۆڤ لە هەر کویَ بێت ستەم و زۆردارییەك دەبینێت و ڕووبەڕووی هەمان تەڵەزگە دەبێتەوە، واتە کەوتنە ناو دوو هەڵبژاردنەوە کە شیرینترینیان تاڵە: پاراستنی ژیان یان وتنی ڕاستی، ئەوەش ئەو تەڵەزگەیەیە کە سوکراتی تێکەوت. ئەو مەرگی هەڵبژارد چونکە لە دیدی ئەودا سەختییەکەی کەمترە لە ژیانێك کە تیایدا لە وتنی ڕاستی بێدەنگ بێت. بەم شێوە سوکرات بۆ گەواهی دان لەسەر ڕاستی، مەرگی هەڵبژارد نەك ژیان، چونکە درکی بەوە کرد کە مردن تەواوبوونی گەواهیدان و ئەوپەڕی گەواهیدانە. بەمەش بارێکی هەڵگرت کە کەس هەڵیناگرێت یان زۆرینە هەڵیناگرن. ئەمەش ڕووی موعجیزەکەیە. گەواهیدانەکەشی دووبارە نابێتەوە، چونکە مێژووی فەلسەفە و ڕاستی، بەدەر لە حەلاج یان گالیلۆ، سوکراتێکی دی بەخۆوە نابینێت. لە ئەرستۆوە بیگرە کە بۆ ڕزگارکردنی خۆی ئەسینای بەجێهێشت تا دەگاتە هایدگەر کە تۆمەتبار کرا بە مامەڵەکردن لەگەڵ نازیزم، هەتا دەگاتە ڕکابەرەکانیشی کە سەرزەنشتیان کرد لە کاتێکدا ئەوان زۆر لەوە دوورتر بوون کاراکتەری سوکرات بنوێنن یان

بگەنە نموونەی سوکراتییانە. گەواهیدانی سوکرات نهێنییەکە لە نهێنییەکانی ئەو سەرەتایەی کە فکر بەردەوام بەدەستی دەهێنێتەوە و ڕاڤەی دەکا.

هەر لەبەرئەوە، سوکرات نائامادە نییە تەنها بۆ ئەوە نەبێت سەرلەنوێ و بەهێزەوە ئامادەبێت، ئەو هەمیشەش ئامادەیە، ئەمەش نرخی سەرەتا مەزنەکانە.

* * *

*ئەم پرسیارە دەخەینە ڕوو بەبۆنەی دەرچوونی کتێبێکی نوێوە بە زمانی عەرەبی لەسەر سوکرات کە ناونیشانەکەی هەر (سوکرات)ە و تەلاڵ ئەلسوهەیل لە فەرەنسییەوە وەریگێڕاوە و لە بنەڕەتدا توێژەری سۆڤێتی (سیوکاریس کیسیدیس) بە ڕووسی دایناوە، ئەویش هەروەك بە ناوەکەیدا وا دەرئەکەوێت، بە بنەچە یۆنانییە.

### سەرچاوە

کتێبی: أسئله الحقیقیه و رهانات الفکر، مقاربات نقدیه و سجالیه، ص 43–46.

## جان جاك ڕۆسۆ... بیرمەندێك لە زەمەنی ڕاوەدوناندا

لەعەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع



چی بڵێین دەربارەی ئەم ژیاننامەیە کە مامۆستایەکی زانکۆی برۆکسل دەربارەی ڕۆسۆ لە کتێبێکی حەوت سەد لاپەڕەیی گەورەدا پێشکەشی دەکات؟ ئایا ڕەوایە کورتبکرێتەوە یاخود دەکرێ تەنها لە وتارێکدا مافی تەواوەتی خۆی بدرێتێ؟ بێگومان نەخێر. من خۆم خەونم بەوەوە دەبینی، ئێستاش ئەو خەونەم هەر هەیە، کتێبێکی تەواو لەسەر جان جاك ڕۆسۆ بنوسم، حەزمدەکرد دەستەبەرداری هەموو شتێك ببم و خۆم بۆ نوسینی ئەو کتێبە تەرخان بکردایە.

بەشی یەکەمی ئەم کتێبەی "ڕیمۆن ترۆسۆن" ئەم ناونیشانە لە خۆدەگرێ: (ڕێچکەی چونەپێشەوە بەرەو نەمری). دانەر لەم بەشەدا سەرگوزشتەی ساڵانی یەکەمی ژیانی ڕۆسۆ دەگێڕێتەوە، هەر لە سەرەتای لەدایکبونیەوە لە شاری (جنێف) تادەگاتە بڵاوکردنەوەی تێکستە بەراییەکانی کە گەیاندیانە لوتکەی ناوبانگ دەرکردن، بە تێپەڕین بە قۆناغی منداڵی و ڕاکردنی لە ئێوارەیەك لە ئێوارەکاندا لە جنێف و خۆخستنە باوەشی سروشتەوە بێ ئەوەی گوێ بە مەترسییەکان بدات.

بەشی دووەمی ئەم کتێبە تەرخانکراوە بۆ قەسەکردن لەسەر نیوەی دووەمی ژیانی ڕۆسۆ، واتە دوای ئەوەی بە تەواوی ناوبانگێکی زۆرپەیدا دەکات و هەروەها دوای ئەوەی زۆر بەتوندی دەکەونە شوێنی و ڕاویدەنێن. لەبەر ئەوەیە ئەم بەشە ئەم ناونیشانە دژە لەخۆدەگرێ: (پرسەیەکی دروشاوە بۆ خۆشبەختی).

ڕاسته ئەوه خۆشبەختییه بگەیته نەمری دوای ئەوەی کەسێکی هاکەزایی یاخود بێنرخ بوبیت، بەڵام باجی ئەم نەمرییه باجێکی گرانه، بەڵکو زۆر لەوه گرانتره که ڕۆسۆ چاوەڕوانی دەکرد. لێرەوەیه وشەی پرسه لەگەڵ وشەی خۆشبەختیدا هاتووه.

داوای لێبوردن له خوێنەر دەکەم، چونکه من لێرەدا تەنها لەسەر سالآنی کۆتایی ژیانی ڕۆسۆ ڕادەوەستم که تێیدا ڕۆسۆ له ئەنجامی ڕاوەدونانێکی بەردەوام و گەڕان بەشوێنیدا لەلایەن چەندین گروپ و هێزەوه که دەیانویست بەهەرشێوەیەك بێت تێکی و پێکی بشکێنن، تەواو شەکەت و ماندوببوو. لەڕاستیدا گەورەیی و مەزنی ڕۆسۆ لێرەدا دەردەکەوێ.. ڕۆسۆ تاکو دوا ساتەکانی ژیانی بەخۆڕاگری مایەوه و سەرسەختانه بەرگری له حەقیقەتەکانی خۆیدەکرد. لێرەوەیه ڕۆسۆ دەبێته شوێنی سەرنجڕاکێشانی نوسەرانی دوای خۆی، هەر له گۆتەوه بۆ تۆڵستۆ و دیستۆفسکی و هۆڵدەرلین.. ڕۆسۆ باجی هەموو ئەو شتانەی دا کەنوسینی.

بەشەکانی کۆتایی کتێبەکه ئەم ناونیشانانه لەخۆدەگرێ: ڕۆسۆ ڕۆدەچێته ناو وێڵگەیەکەوه نه سەرەتای هەیه و نەکۆتایی. ڕۆسۆ دەربەدەرێکی ونبوو له شوێنێکەوه بۆ شوێنێکیتر. دواهەمین تێکۆشانەکان یاخود دواهەمین ململانێکان. ڕۆسۆ تەسلیمی قەدەرەکان دەبێ و دەڵێ: (خودایه مردنی جان جاك ڕۆسۆ با بەخواستی تۆبێت!). بەرپابونی شۆڕشی فەرەنسی و بەرزکردنەوەی کتێبی (پەیمانی کۆمەڵآیەتی) بۆ پلەوپایەکی بەرز و دواجار بوونی ئەو کتێبه به ئینجیلی شۆڕش. بڵآوبونەوەی وێنەکانی ڕۆسۆ لەسەر دەستی شۆڕشگێڕەکان و چینه میللیەکان به هەموو شەقامەکانی پاریسدا، ئەمه لەکاتێکدا پێشتر و له ژیانیدا ڕۆسۆ بۆی نەبوو له پایتەختی فەرەنسا نیشتەجێ ببێت یاخود به شێوەیەکی ئاشکرا لەنێو خەڵکیدا دەربکەوێ.

گواستنەوەی تەرمەکەی بۆ گۆڕستانی مەزنەکان (بانتیۆن) که تاکو ئەم چرکەساتەش هەر لەوێدا و لەپاڵ نەیاره سەرسەختەکەیدا "ڤۆڵتێر" ڕاکشاوه. هەموو ئەم بەش و دیمەنانه له کتێبەکەدا یەك لەدوای یەك دەردەکەون.

من لێرەدا لەسەر ئەو تاقه لاپەڕیه ڕادەوەستم که تێیدا دانەری کتێبەکه "ڕیمۆن ترۆسۆن" باس له گەڕانەوەی ڕۆسۆ دەکات بۆ ئەو خانووه کۆنەی دوای ڕاکردنی له جنێف خۆشترین ساتەکانی ژیانی تێدا بردوەتەسەر. ئەودەم ڕۆسۆ تەمەنی شانزه ساڵ بووه.. ئاشکرایه لەو سەروبەندەدا ڕۆسۆ لەگەڵ هەندێ له برادەرەکانی یاخود لەگەڵ کوڕه مامەکەیدا له دەرەوەی شار سەرقاڵی یاریکردن دەبن.. کاتێ له گەڕانەوەیان بۆ ماڵەوه دوادەکەون.. شار هەموو دەروازەکانی خۆی داخستووه.. ئیدی ڕۆسۆ بڕیاردەدات ڕابکات و سەری خۆی هەڵبگرێ و چیتر نەگەڕێتەوه بۆ شارەکەی.. لەڕاستیدا بەپێچوانەی کوڕه مامەکەی..کەس نەبووه لەماڵەوه چاوەڕوانی ڕۆسۆ بکات.. ڕۆسۆ لەمێژبووه دایکی کۆچی دوایی کردووه، بگره لەکاتی لەدایکبونیدا دایکی دەمرێ، باوکیشی ژنێکی دیکه دەهێنی.. ئیدی بۆچی بگەڕێتەوه و بۆ کوێش بگەڕێتەوه؟ بۆچی ڕووه و ئەو دەشت و دەرەی چواردەوری "جنێف"ی داوه ڕانەکات و بەشوێن ماڵێکی دیکەدا نەگەڕێ؟ بەشوێن ئەگەری

گەرمبونەوەیەکی تردا نەگەڕێ؟ هەر ئەمەش بوو ڕویدا. ڕێکەوت وایکرد ڕۆسۆ بگەیەنێتە ماڵی ئەو ژنەی کە دواتر بەڕاستی دەبێت بە دایکی: واتە خانم "دوفرانس". ئەم خانمە سەرەتا لە پێشوازیکردنی ڕۆسۆ دوودڵە، بەڵام دواجار پێشوازی لێدەکات و دەیگرێتەخۆی. هەرچۆنێکبێت ڕۆسۆ لەم ماڵەدا بۆ یەکەمجار مانای دڵسۆزی و پەرۆشی و خۆشەویستی خێزانی دەدۆزێتەوە. ئەمەش بە ڕون و ئاشکرا لە کتێبی (دانپیانانەکانی)دا دەردەکەوێ کە چەند لاپەڕەیەکی بۆتەرخان کراوە و زەمانە بەسەردەچێت و ئەو لاپەڕانە بەسەرناچن. ڕۆسۆ لەو خانوەدا ڕۆژگارێکی خۆش و پڕ شەوق دەگوزەرێنێ کە تاماوەیەکی درێژ کاریگەریەکەی بەسەریەوە دەمێنێتەوە. ئەم ئافرەتە کە بەهیچ جۆرێ نە خزمی ڕۆسۆ بووە و نە پێشتر ناسیویەتی ئەوە ڕۆسۆ لە (دانپیانانەکانیدا) بەدایە بانگی دەکات.

ڕۆسۆ دایکی ڕاستەقینەی خۆی هەرگیز نەناسییوە، تەنها لە میانەی ئەو بیرەوەریانەوە نەبێت کە بۆیان گێڕاوەتەوە و لە سەرەتای (دانپیانانەکانیدا) بە شێوەیەکی کاریگەر و ئەفسانەیی یادیدەکاتەوە. لێرەوە کاتێ ڕۆسۆ لە کتێبەکانیدا وشەی "دایە" بەکاردێنێ، ئەوا مەبەست لێی دایکی ڕاستەقینەی نییە، بەڵکو مەبەستی ئەو ژنەیە کە لە تەمەنی شانزە ساڵیدا دەیناسێ و ناوی خانم "دوفرانس"ە. شایەنی باسە دوا تێکست کە ڕۆسۆ نوسی و نەیتوانی تەواوی بکات(بەهۆی مردنی لەناکاویەوە) تەرخانکرابوو بۆ ئەو خانمە و پێشکەش بەیادی ئەو کراوە. بەڵام دوای بردنەسەری چەند ساڵێك لەگەڵ ئەو خانمەدا، بارودۆخی ژیان ڕۆسۆ ناچاردەکات ئەو ماڵە جێبێڵێت و ڕووبکاتە پایتەخت و بەختی خۆی لە شاری پاریس تاقیبکاتەوە، پاریس شاری گەیشتن و ناوبانگ. ئیدی ئەوەی ڕویدا ڕویدا و ڕۆسۆ هیچ هەواڵێکی لەو خانمەوە پێناگات و پاش ماوەیەك مەدام "دۆفارنس" کۆچی دوایی دەکات بەبێ ئەوەی جارێکیتر ڕۆسۆ ببینێتەوە.

ئێستا ئا ئەوەتا ڕۆسۆ گەڕاوەتەوە ئەو ماڵەی کە باوەشی بۆ کردەوە و لە فەوتان و لەناوچونێکی ڕاستەقینە ڕزگاریکرد. ئەوەتا ئێستا گەڕاوەتەوە بۆ سەرتای هەنگاوەکانی، بۆ ماڵە کۆنەکەی و یادگارییەکان بە ئاسانی و بە گوژم لە ڕوخساریدا دەردەکەون. ئەوەتا گەڕاوەتەوە بۆ ئەو خانووەی شوێنی گەمە و سەرکێشی و یاریەکانی منداڵی و ساڵانی یەکەمی گەنجیەتەکەی بوو. ئەو خانووەی بە ئامادەگی ئەو خانمە ئاوەدان بوو وەك ڕۆژی ڕوناك. ئەوەتا ئێستا ڕۆسۆ پیر و کەنەفت بووە و بە نەخۆشی و کەسەرییەوە گەڕاوەتەوە. گەڕاوەتەوە و هێندە ڕاویانناوە و پلانیان لەدژی گێڕاوە تەواو شەکەت و ماندوبووە. ئەوەتا گەڕاوەتەوە و خەم و خەفەت و ناسۆری باری سەرشانیان قورسکردووە و بستێ زەوی نەماوە بیگرێتە خۆی!

بەڵام دوای بیست و پێنج ساڵ دابڕان تەنها هێندە بەسە کەمەکێك چاوانی دابخا بۆ ئەوەی ببینێ دایکی لە پێدەشتەکاندا بەدوایدا ڕادەکات تاکو بیگرێ و ماچێکی بکات. هێندەی بەسە چاوانی لێکبنێ تاکو هەموو ژیانی پێشوی بە زیندووی و وەك خۆی چۆن بووە ئاوا ببینێتەوە، بەڵام سەرەتا پێویستە بچێت بۆ گۆڕستانەکە، زمانحاڵی گۆڕستانەکە دەڵێ:

"بەخودا سوێندت دەدەم گەر لەو دەوروبەرە دورەوە تێپەڕیت و ئەو گۆڕە بەجێماوەت بینی کە خەریکە شوێنەواری نامێنێ و گژوگیای دەشتەکی دایپۆشیوە، توو زاتی خوا بۆ ساتێك لابدە لای و بەسەریدا بنوشتێوە و لە باتی من خۆڵەکەی ماچ بکە!" هەرواش بوو، ڕۆسۆ دوای ئەوەی سەردانی ماڵە کۆنەکەی دەکات و چەند جارێ بە دەوریدا دەسوڕێتەوە، دوای ئەوەی تەماشایەکی پێدەشتە دڵگیرەکەی ئەو دەوروبەرە دەکات کە دەکەوێتە نێوان فەرەنسا و سویسراوە، یەکسەر بەرەولای گۆڕستانی هەژارەکان هەڵدەگەڕێ. لەوێ خۆیدەدا بەسەر گۆڕەکەدا و دەستدەکات بە ماچکردنی و دەموچاو هەڵسوان لە خۆڵەکەی، بەشێوەیەك دەستدەکات بە گریان لە دوورەوە هەنسك و ناڵینەکانی دەبیسرێ. لەوێ بەسەر گۆڕەکەدا دەنوشتێتەوە تاکو بەهەردوو دەستی گۆڕەکە لەئامێزبگرێ. پاشان دەستدەکات بە تۆبەکردن و لێخۆشبون لە گوناهەکانی، چونکە نە مردنەکەی خانم "دوفرانس"ی بینی و نە لە دواساڵەکانی ژیانیدا و پێش ئەوەی بمرێ نەیتوانی یارمەتیبدات.. ئیدی ڕۆسۆ لەوێدا ڕۆژانی ڕابردوی دەکەوێتەوەبیر، ئەو ڕۆژانەی دەکەوێتە بیر کە بۆ دواجار ئەو خانمەی بینی، ئەویش پێش چەند ساڵێك لە مردنەکەی بوو..ئەودەم ڕۆسۆ تازە لە پاریس گەڕابووەوە و ماوەیەکی زۆریشی بوو لەیەکتر دورکەوتبونەوە، ڕۆسۆ ئەوکات تەواوێك ناو ناوبانگی دەرکردبوو. سەرەتا ڕۆسۆ ناتوانێ خانم "دوفرانس"بناسێتەوە، چونکە ئەو ئافرەتە حاڵەتی هێجار تێکچو بوو هەروەها تەواوێك گۆڕابوو.. ڕۆسۆ کاتێ سەلام لەو خانمە دەکات هەست بە ترس و شپرزەییەکی زۆر دەکات، خانمەکەش تەواوێك دڵخۆش و شادمان دەبێت و باوەڕ بە چاوی خۆی ناکات و باوەڕ ناکات ئەو منداڵە دەربەدەر و بێکەسەی ڕۆژێ لە ڕۆژان خۆیکرد بە ماڵەکەیدا ئێستا بووەتە جان جاك ڕۆسۆ! بۆیە لەیەك کاتدا هەم خۆشبەختە و هەم واقیشی وڕماوە. ڕۆسۆ بەسەریدا دەنوشتێتەوە و دەستەکانی ماچ دەکات.

ئەم گەڕانەوەیە بۆ ڕابردوو گەڕانەوەیەکی لەسەرخۆ و تێڕامانێکی هێمنانەیە. دانەری کتێبەکە "ڕیمۆن ترۆسۆن" سەبارەت بەم گەڕانەوەیە دەڵێ: (ئەم گەڕانەوەیە دڵی شەقار شەقار کرد، چونکە ڕابردوو ناگەڕێتەوە و ئەو ئافرەتە قەشەنگ و جوانەی ڕۆژێ لە ڕۆژەکانی ساڵی 1728 پێشوازیلێکرد و دەرگای ماڵەکەی بۆ کردەوە، چیتر لێرە نییە تاکو بە ئامادەبونی ئەو ناوە پڕبکات. لە گۆڕەکەشیدا تەنها لاشە بەنرخ و مەزنەکەی نەشاردراوەتەوە، بەڵکو جوانترین ساڵەکانی گەنجیەتی ڕۆسۆش شاردراوەتەوە).

دواتر ڕۆسۆ هەواڵی ئەو خانمە لە دەرودراوسێکان دەپرسێ و دەزانێ ئەو خانمە لە دواساڵەکانی ژیانیدا تەواو هەژارکەوتووە، ئەمە لە کاتێکدا پێشتر ئافرەتێکی خانەدان بووە، بگرە دەرگای ماڵەکەی بۆ هەموو کەسێکی دوور و نزیك لەسەر پشت بووە و میوانداریێکی دڵفراوان بووە.. ڕۆسۆ ئەودەم تێدەگات دوژمنەکانی تەنانەت لێرەشدا دەستی خۆیان لێوەشاندووە.. دوژمنەکانی ویستویانە بە ئازاردانی ئەم خانمە ڕۆسۆش ئازاربدەن.. لەوەشدا سەرکەوتوبوون.

ئەی (شوازێل)ی وەزیر بە یەزدان سوێندی نەخواردووە کە دەبێ سەر بە ڕۆسۆ شۆڕبکات؟ یان گەر سەریشی پێشۆڕنەکات ئەوا دەبێ پشتی بشکێنێ؟ کێش دەتوانێ تەحەدای ئیرادەی وەزیرێکی بەهێزی "لویسی پازدەم" بکات. ناحەز و نەیارەکان ڕۆسۆیان لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا گەیاندە حاڵەتی وڕێنەپێکردن و شێتی.. ڕۆسۆ دەترسا دوای مردنی کتێبەکانی بشێوێنن، بۆیە بەشوێن چەند هاوڕێیەکی دڵسۆزدا دەگەڕا تاکو وەك ئەمانەتێك کتێبەکانی لایاندانێ، بۆ ئەوەی دوای مردنی کتێبەکانی وەك خۆی بڵاوبکرێنەوە.

پێویستە بوترێ کتێبەکانی (دانپیانانەکان) و (گفتوگۆکان) و (خەونی پیاسەکەرێکی تەنها) تاکو ڕۆسۆ لە ژیاندا بوو بڵاونەکرانەوە، چونکە دوای ئەوەی حوکمی بەندکردنی هەتا هەتایی بەسەردا بڕا، بڵاوکردنەوەی کتێبەکانییان لێ قەدەغەکرد. مەسەلەکە گەشتە ئەو ئاستەی ڕۆسۆ جارێکیان بیری لەوەکردەوە سەرجەم دەستنوسەکانی بداتە کڵێسای "نۆتردام" کە دەکەوێتە گەڕەکێکی (لاتینی) لە ناوەڕاستی پایتەختی فەرەنسا و ئەم وشانەشی لەسەر دەستنوسەکانی نوسیبوو: (خودای زوڵملێکرا و چەوساوەکان، یەزدانی بەحەق و دادپەروەری، ئەم ئەمانەتە لە کەسێکی غەریبی بێ جێگا و ڕێگا و بێبەخت وەربگرە، کەسێکی تەنهای بێ پاڵپشت و بێ هاوڕێ لەسەر ئەم گۆی زەوییە، کەسێك لەلایەن تەواوی نەوەیەکەوە گاڵتە و سوکایەتی پێدەکرێت، کەسێ قەشمەری پێدەکەن و خیانەتی لێدەکەن.. زۆر بەدڵنیاییەوە چاوەڕوانی ڕەحمەتی تۆ دەکەم و پشت بە دادوەری تۆ دەبەستم و خۆم تەسلیمی قەدەری تۆ دەکەم).

خۆشبەختانە ئەو ڕۆژەی ڕۆسۆ دەچێت بۆ کڵێسا تاکو دەستنوسەکانی لێدانێ، کڵێساکە داخرابوو، چونکە گەر ئەو دەستنوسانەی لەوێ دابنایە و بکەوتایەتە دەستی قەشەیەکی کاسۆلیکی دەمارگیری دژ بە پرۆتستانت، ئەوا بەدڵنیاییەوە هەر هەمووی بزردەبون یاخود ئەدڕێنران و دەفەوتان.. جگە لەوە ئەوان (پیاوانی ئاین) ڕۆسۆیان تەنها بەکەسێکی گومڕا نەدەزانی، چونکە ئینتیمای بۆ مەزهەبی کەمینەی پرۆتستانت هەبوو، بەڵکوبەکافریشیان دادەنا، چونکە لێکدانەوەکانی بۆ ئاینی مەسیحی تەواو جیاواز و دژ بوو لەگەڵ لێکدانەوەکانی ئەوان..لەوەش خراپتر ئەوەبوو عەشیرەتەکەی ڕۆسۆ بەهۆی بیروباوەڕە ئازا و بوێرییەکەیەوە لەسەر ئاین، ئەوانیش گلەیی و سەرزەنشتیان دەکرد. کەچی هەر ئەو بیروڕایانەش بوو بە دەساڵ دوای مردنی ڕۆسۆ سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. بگرە هەر ئەو بیروڕایانە بوو دوای هاتنەئارای سەدەکانی مۆدێرنەی ڕۆحی و فیکری، بوونە کاکڵەی جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتیبوون.

ئەوە جان جاك ڕۆسۆ بوو دوای ئەوەی وێنەیەکی عەقڵانی دەربارەی خودی ئاین خستەبەرچاو، توانی جەوهەری ڕۆحی و عەقڵانی ئاین ڕزگاربکات. بەڵام ئەوە بۆ ئەوکات کارێکی ئەستەم سەخت بووە، کارێك بووە پێش سەردەمەکەی خۆی کەوتبوو. لەبەر ئەوەیە تاکو ڕۆسۆ خۆی لە ژیانیدا بوو ئەو بیروڕایانەی ڕۆشناییان نەدی. مەسەلکە گەشتە ئەو ئاستەی ڕۆسۆ لە ساتێك لە ساتەکانی بێزاریدا، دادەبەزێتە نێو شەقامەکانی پاریس و ئەم

بڵاوکراوەیە بڵاوبکاتەوە و بیدات بە خەڵکی، بڵاوکراوەکە شتێکی ئاوای تێدا نوسراوە: "بۆ هەموو فەرەنسییەك کە تاکو ئێستا دادپەروەری و حەقیقەتی خۆشدەوێ، ئەی فەرەنسیەکان من ڕاستەوخۆ ڕووی قسەکردنم لە ئێوە دەکەم.. ئەی ئەو نەتەوەیەی پێشتر دڵساف و بەڕەوشت بوون، ئەوە ئێستا چیتان لێقەوماوە؟ بۆچی گۆڕاون؟ ئەم بیانیە هەژار و داماوە بۆ دەچەوسێننەوە کە پەنای بۆ ئێوە هێناوە و لەنێوتاندا دەژی، ئەم هەموو دووڕویی و پیلان و دۆرودەلەسە و پڕوپاگەندانە چین لە دژی من هەڵیدەبەستن؟".

بەڵام خەڵکەکە بێئاگابوون لە ڕۆسۆ و نەیاندەناسی کە وەك سواڵکەرێك دەستی درێژ کردبوو تاکو بڵاوکراوەکەیان بداتێ.. گەر ئاگاداریشی بونایە و بشیانناسیایە و بڵاوکراوەکەشیان لێوەربگرتایە، ئەوا دوای خوێندنەوەی بۆیان دەگەڕاندەوە یان فڕێیان دەدایە سەرزەوی، چونکە ئەوان گومانیان لە عەقڵی ڕۆسۆ دەکرد. ئابەم شێوەیە تەنها کەسێکی نەدۆزییەوە لێیتێبگات، هەستی دەکرد زەوی لە ژێرەوە خەریکە قوتی دەدات، هەستی دەکرد لە بیابانێکی پڕ لە ئادەمیزادایە، نەیدەزانی جاریٚ ڕۆژی خۆی نەهاتووە و تەنها دوای مردنیشی ڕۆژی دێت. ئەو دەمەش کە ڕۆژی هات هەموو پاریس بەڕۆژی ڕوناك و بەبانگی ئاشکرا وێنەکانی بەرزدەکەنەوە. بەڵام ئێستا کات و ساتی ئەو نییە و تا ئاستی سەرخۆشبوون دەبێ تامی ناسۆری و سوکایەتکردن بچێژێ.

لە ڕاستیدا ڕۆسۆ دەیزانی ڕۆژ و ساتی خۆی دێت، بەڵگەش بۆ ئەوە ئەم وشانەی خوارەوەیە:

"با مرۆڤەکان لە دژی من هەرچییەك دەکەن بیکەن، بەڵام ڕۆژێ دێت ئاسمان کاری خۆیدەکات، نازانم ئەو ڕۆژە کەی و چۆن و لەکوێیە، بەڵام ئاسمان تۆڵەی من دەکاتەوە، من بەدڵسۆز دەزانێ، ئەوەی دەیزانم ئەوەیە حوکمی ئاسمان حوکمێکی مەزن و عادیلانەیە و ڕۆحی منیش ڕۆحێکی پاك و بێگەردە و شایەنی ئەم هەموو چارەنوسە ناخۆشە نییە".

شتی سەیر و سەرنجڕاکێش لە ڕۆسۆدا، ئەمەش دیسانەوە مەزنی ئەو دەردەخات، ئەوەیە کە ڕۆسۆ دوای ئەوەی بە درێژایی دوا بیست ساڵی کۆتایی ژیانی، ناحەز و نەیارەکانی هەرچییەکیان ویست پێیانکرد، کەچی ئەو لە ڕەحمەت و میهرەبانی خودا بێهیوا نەبوو.. نەکەوتە ناو بازنەی عەدەیەتەوە وەك ئەوەی هەندێ بیرمەندی دیکە تێکەوتن. تەنانەت دوای ئەوەی تلاندیان لە قوڕەوە و لەسەرتاپای ئەورووپادا و لە ڕێگەی قسەو قسەلۆکەوە سومعەیان لەکەدار کردو شێواندیان، کەچی تێگەشتنی بۆ حەق و دادوەری گۆڕانی بەسەردا نەهات و نەکەوتە کوفرکردن. ڕۆسۆ تەواو لەوە دڵنیابوو ڕۆژێ دێ حەقیقەت دەردەکەوێ و هێزی تاریکگەرا و پلانگێڕان و تاوانکار پەتیان کورتە و ڕیسوادەبن. لەو بڕوایەدام ئەمە گەورەترین وانەیە ڕۆسۆ پێشکەشی ئێمەی کردووە، وانەیەکە لەسەرمانە زۆر بە باشی لەبەریبکەین، چونکە وانەیەکە بۆ هەموو کۆمەڵگاکان و بۆ هەموو سەردەمێك دەگونجێ.

## سەرچاوە

ڕۆژنامەی الشرق الاوسط

2004/4/4

# فۆرمی ڕا پرسی

**خوێنەری ئازیز:**

هەروەك ئاگاداریت، سەردەم هەر لە سەرەتاوە هەوڵی تەواوی داوە بانیژەیەکی والاّ بێت بۆ ڕوانیینە دونیای کەلتوور و فیکر و ئەدەبیاتی گەلانی دیکە. ئەمەش بە مەبەستی دەوڵەمەندکردنی خەرمانی کەلتووری کوردی و فراوانکردنی تەوەرەکان و تازە کردنەوەی تێگەیشتنەکان و دید و تێڕوانینەکان.

ئێمە لە سەردەم، لە شەش ساڵی ڕابردوودا، بەپێی پرۆگرامێکی تایبەتی و دارێژراو و پتەو کارمان کردووە بۆ ئاگاداربوون لە نوێترین گۆرانکاری و لێکۆڵینەوەی دونیای فیکر و کەلتووری بێگانە، ئاگاداربوون لە خوێندنەوە بەردەوام و قووڵەکان بۆ کێشە کۆنە – نوێکان یان نویێ– کۆنەکان. بێگومان ئەنجامدانی ئەم کارەش بە هەوڵ و کۆششی گروپێك لە رۆشنبیران و بە هاوکاری نووسەران و ئەدیبان بووە. کە لێرەدا سوپاس و ستایشی خۆمانیان بۆ دووبارە دەکەینەوە و بە هیواین کە بەردەوامبن لە ناردنی بابەتی گرنگ و بەپێز بۆ گۆڤارەکە.

هاوکات، ئێمە لە گۆڤاری سەردەم هەست دەکەین لە قۆناغێکداین پێویستمان بە پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندن و پڕکردنەوەی ئەو کەلێنانە هەیە کە هەمیشە لە ئەنجامدانی هەر کارێك ڕوودەدەن. هەر بۆیە بەشداریکردنی ئێوەی بەڕێز لەم پرۆسەیەدا مایەی پێزانین و سەرکەوتنە. ئێمە لەو بڕوایەداین کە پرۆسەی لەم جۆرە دەبێت پرۆسەیەکی هەمەلایەنە بێت و ڕەوایی خۆی لەو جۆرە ڕاپرسییەوە

بەرجەستە دەکات. هەر بۆیە ئەم راپرسییەمان ئامادەکردووە تاوەکو بزانین ئێمە لە کوێدا، بەڕای ئێوە پێویستمان بە باشترکردنی گۆڤارەکە هەیە. بێگومان ئەم تێڕوانین و پێشنیارانەی ئێوە ئاوێتەی ئەو پرۆگرامە دەبێت کە ئێمە بە دەستمانەوەیە هێدی هێدی ئەنجامی بدەین.

تکایە پێشنیار و تێڕوانینەکانتان بەم ئیمەیلەی سەردەم کە لە خوارەوە نووسراوە رەوانە بکەن

www.sardam.info

لەگەڵ رێز و سوپاسی گۆڤاری سەردەم.

1- لەکەیەوە گۆڤاری سەردەم دەخوێنیتەوە؟
2- هەموو ژمارەکانی سەردەمت کڕیووە؟
3- چ ژمارەیەکی گۆڤارەکەت بەدڵ بووە و بۆ؟
4- چ ژمارەیەکی گۆڤارەکەت بەدڵ نەبووە و بۆ؟
5- بە بەراورد لەگەڵ ژمارەکانی سەرەتادا هەست بە جیاوازی دەکەیت؟
6- بەبەراورد لەگەڵ گۆڤارەکانی دیکەدا، گۆڤاری سەردەم چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟
7- پێشنیارت بۆ باشترکردنی گۆڤارەکە چییە؟
8- بەڕای تۆ تا ئێستا چ کارێك هەیە کە دەبوایە گۆڤارەکە بیکات و نەیکردووە؟

# فایلێکی تایبەت بە ئەدۆنیس



وەرگێڕە بەڕێزەکان ئاگادار دەکەینەوە کە لە ژمارەی داهاتوودا فایلێکی تایبەت بە ئەدۆنیس بڵاودەکەینەوە، هیوادارین بە بابەتی هەمەڕەنگ سەبارەت بەو شاعیرە گەورەیە فایلەکە دەوڵەمەند بکەن.

چاوەڕوانی بەرهەمو هاوکاری ئێوەی بەڕێزین..

